مەكیاڤیلی لە پێشەكی كتێبی دوهەمی "تێزەكاندا" دەڵێت كە لە هەموو زەمانەكاندا، جیهان هەر بەم شێوەیە بوەو، خراپەو چاكە هەر بەم ڕێژەیە بوونیان هەبوە. بەڵام هەندێك جار چاكەو خراپە مقەڕی خۆیان گۆڕیوەو لە ئیمپراتۆریەتێكەوە بۆ ئیمپراتۆریەتێكی تر، ڕۆیشتوون. فەزیلەت كە سەردەمێك وا دەزانرا لە ئاشور جێگیرە، ڕۆیشت بۆ سەرزەمینی ماد و لەوێوە گەیشتە پارس و دواجار هات بۆ ڕۆم و لەوێ مەنزڵی كرد. لەژێر هەتاودا، هیچ شتێك نەگۆڕو جێگیر نەبوەو نابێت. خراپە جێی چاكە دەگرێتەوەو چاكەش جێی خراپە، یەكێكیان هەمیشە هۆیە بۆ ئەوی دیان. بەڵام ئەم قسەیە بە مانای ئەوە نیە مرۆڤ واز لە تێكۆشان بهێنێت. بۆ ژیانێكی چالاك، تەسلیمبوون بە قەزاو قەدەر، كارێكی كوشندەیە. تەنها ژیانێكی شایستەی مرۆڤ، ژیانێكی چالاكە.

ڕێنسانس لە ڕووی ئەندێشەو هەستەوە لەژێر كاریگەری بەهێزی تاڵع بینیدا بوو. جگە لە پیكۆ دلا میراندولا[٤٠]. هیچ بیریارێكی ڕێنسانس نەیدەتوانی خۆی لەم كاریگەریە بپارێزێ یان بە سەریدا زاڵبێت. تەنانەت ژیانی كەسایەتیەكی گەورەو مەزنی وەك فیچینۆ[٤١] پڕ لە ترسی خورافی تاڵعبینی بوو[٤٢] تەنانەت مەكیاڤیلیش نەیتوانی بە تەواوی خۆی لە وێناكانی تاڵع بینی، ڕزگار بكات. مەكیاڤیلیش گونجاو لەگەڵ شێوە بیركردنەوەی سەردەمەكەی و هاوچەرخەكانیدا، بیری دەكردەوەو قسەی دەكرد. مەكیاڤیلی لە "تێزەكان"دا دەڵێت زۆرجار چ لە مێژووی كلاسیكی و چ لە مێژووی سەردەمی تازەدا، دەبینم كە بەر لە ڕوداوێكی ناخۆش ڕوودەدات، چەند نیشانەگەلێك لە ئاسمان دەركەوتوە. /وەك دەركەوتنی ئەستێرەی كلكدار/ مەكیاڤیلی دان بە نەزانینی خۆی لە ڕونكردنەوەی ئەم جۆرە ڕوداوانەدا دەنێت، بەڵام نكوڵی لە خودی ڕوداوەكان ناكات[٤٣]. بەڵام مەكیاڤیلی تەسلیمی هیچ جۆرە قەدەریەتێك نابێت. پەندی "مرۆڤ ملكەچی سوڕانەوەی ئەستێرەكانی بەختە" لە سەردەمی ڕێنسانسدا زۆر جار دەگوترایەوە[٤٤]. بەڵام مەكیاڤیلی ئاراستەیەكی تازەی بەم پەندە بەخشی. بە زاڵبوون بەسەر كاریگەری شومی ئەستێرەكاندا، سەرەڕای عەقڵانیەت، سەقامگیری و هێزی ئیرادەش پێویستە. دەسەڵاتی بەخت، مەزن و گەورەیە، بەڵام دەكرێ لە بەرامبەریدا ڕابوەسترێ. ئەگەر دەسەڵاتی بەخت وا دەردەكەوێت كە بەرگری لێناكرێت، ئەوا سوچی مرۆڤە كە هێزەكانی خۆی لە دژی بەكارناهێنێت یان ئەوەندە ترسنۆكە كە دژی بەخت چەك هەڵناگرێت. مەكیاڤیلی دەنوسێ:

"دەزانم كەسانێكی زۆر هەبوون و ئێستاش هەن كە بڕوایان وایە بەسەر مەسەلەكانی ئەم دنیایەدا یان ئیرادەی خوداوەند یان بەخت، فەرمانڕەوایە. هەلومەرجی جیهانیش بەو شێوەیەیە كە

حیکمەتی مرۆیی هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر کاروبارەکانیدا نیەو لێرەوە بەو دەرئەنجامە دەگەن کەوا باشترە لە بارەی کاروباری جیهانەوە هیچ زەحمەتێك نەکێشین، بەڵکو لە حاڵەتی سروشتی خۆیاندا وازیان لێبهێنین.. لە ڕاستیدا منیش هەرکاتێك کاروباری جیهان بە شێوەیەکی جدی تاوتوێ دەکەم، بە گشتی هەر بە هەمان دەرئەنجام دەگەم. بەڵام ڕەنگە ئیرادەی ئازاد بە شێوەیەکی ڕەها لە ئێمە نەستێنرابێت. پێدەچێ بەخت تەنها نیوەی کارەکانی ئێمەی لەژێر دەستدا بێت و نیوەکەی تری تا ڕادەیەکی زۆر بۆ تەکبیری خودی ئێمە بەجێهێشتبێ.

دەکرێ بەخت بە ڕوبارێکی بە تەوژم بشوبهێنرێ کە لە کاتی لافاودا لە بەنداوەکانی خۆی تێدەپەڕێنێ و هەموو بەرگریەکان تێکدەشکێنێ. بەڵام نابێت لەم هەلومەرجە بتۆقێین و واز لە دروستکردنی بەنداو و جۆگەلە بهێنین. لە وەرزێکدا کە ئاو و هەوا گونجاوەو ڕوبارەکە لافاوی هەڵنەساندوە، دەبێ هەندێك هەنگاو بنرێت و ئەو ئامادەگیە بەدەست بهێنرێ کە هەرکاتێك ڕوبارەکە دوبارە لافاوی هەڵساندەوە، ئەگەر نەکرێت بە تەواوی ڕێگە لە ئاوەکە بگیرێت، لایەنی کەم بتوانرێ بۆ هەندێك مەجاری تر ڕەوانە بکرێت و لافاوی ئاوەکە تا ڕادەیەك، کەم بکرێتەوە[٤٥].

ئەم ڕێگەچارەیە بە زمانی ئیستیعاری، شیعری یان ئەفسانەیی دەربڕاوە. بەڵام لەژێر پەردەی ئەم دەربڕینە ئەفسانەییەوە، ئەو ئاراستە زیهنیە دەدۆزینەوە کە فۆرمەلەی زیهنی مەکیاڤیلی کردوەو زیهنی تێرکردوە. چونکە ئەوەی مەکیاڤیلی لێرەدا دەیڵێت هیچ نیە جگە لە دنیاییکردنی (*Secularizaiton*) سمبولی بەخت. بەخت تەنانەت لە ئەدەبیاتی سەدەکانی ناوەڕاستدا، سمبولێکی ئاشنا بوو. بەڵام مەکیاڤیلی گۆڕانێکی مانایی تایبەتی پێبەخشیوە. دەربڕینێکی کلاسیکی ئەو دەورەی بەخت لە سیستەمی بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا بینیوێتی، دەکرێ لە پارچەیەکی بەناوبانگی کتێبەکەی دانتێدا، واتە لە کتێبی دۆزەخدا، بدۆزینەوە. لەوێدا ڤێرژیل خەسڵەتی هەقیقی و دەوری بەخت، فێری دانتێ دەکات. ڤێرژیل ڕونی دەکاتەوە کە خەڵکی ڕاهاتوون بە شێوەیەك باسی بەخت بکەن، وەك ئەوەی بوونێکی سەربەخۆی هەبێت. بەڵام ئەم جۆرە وێنایە بۆ بەخت، تەنها دەرئەنجامی کوێربوونی مرۆڤە. هەرچی بەخت ئەنجامی دەدات نەك بەناوی خۆیەوە، بەڵکو بە ناوی هێزێکی باڵاترەوە ئەنجامی دەدات. خەڵکی تا ئەو شوێنەی بەخت یاریان دەبێت، ستایشی دەکەن. بەڵام هەرکە بەهۆی بەختەوە زیانی پێبگات، دەست دەکەن بە سەرزەنشتکردنی. هەردوو کارەکە ئەحمەقانەیە. بەخت نە دەکرێ سەرزەنشت بکرێ و نە دەکرێ ستایش بکرێ. چونکە بەخت خۆی دەسەڵاتی نیە، بەڵکو هۆکە، بنەمایەکی باڵاترە. ئەگەر کار بکات ئەوا بە پێی ئیرادەی خوداوەندە کە ئەرکێکی لەو

چەشنەی لە ژیانی مرۆڤدا، خستۆتە ئەستۆی. لێرەوە بەخت پلەیەکی بالاتری هەیە لەوەی خەڵکی هەڵیدەسەنگێنن. بەخت لە سەرزەنشت و ستایشکردن، پارێزراوە[٤٦]. لە وەسفەکەی مەکیاڤیلیدا ئەم ڕەگەزە مەسیحیە، ون بوە. مەکیاڤیلی دەگەڕێتەوە بۆ تەسەوری یۆنان و ڕۆم بۆ بەخت. واتە دەگەڕێتەوە بۆ تەسەورە کافرانەکەی. مەکیاڤیلی ڕەگەزێکی بیرکردنەوەو هەست دەهێنێتە باسی باسکردنی بەختەوە کە بە تەواوی تازەیە. ئەو تەسەورە ڕاستە کە بەخت فەرمانڕەوای کاروباری جیهانە، بەڵام تەنها نیوەی ڕاستیە. مرۆڤ ملکەچی بەخت نیەو کۆیلەی ڕەشەباو لافاوەکان نیە. مرۆڤ دەبێ خۆی ڕێگەی خۆی هەڵبژێرێ و لە دوتوێیدا بەرەو پێشەوە بچێت. ئەگەر مرۆڤ کەمتەرخەمی لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانیدا بکات، بەخت لاواز و سوکی دەکات و بەجێی دەهێڵێ.

**ئەگەر مرۆڤ کەمتەرخەمی لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانیدا بکات، بەخت لاواز و سوکی دەکات و بەجێی دەهێڵێ.**

مەکیاڤیلی لە فەسلی بیست و پێنجی میردا، ڕێساگەلێکی تاکتیکی بۆ ململانێکردن لەگەڵ بەختدا، ڕوون دەکاتەوە. ئەم ڕێسایانە زۆر ئاڵۆزن و بەکارهێنانیان بە شێوەیەکی دروست ئاسان نیە. چونکە ئەم ڕێسایانە دوو ڕەگەزی ناکۆک لەخۆ دەگرن. ئەو مرۆڤەی دەیەوێت لەم ململانێیەدا لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێت، دەبێ دوو سیفەتی ناکۆکی پێکەوە لە سروشتی خۆیدا هەبێت. ئەو دەبێت هەم ترسنۆك و هەم ئازا، هەم وریا و هەم هەڵەشە بێت. تەنها بە پێکهاتەیەکی وا ناکۆکەوە، دەکرێ هیوامان بە سەرکەوتن لەم ململانێیەدا هەبێت. شێوازێکی یەکسان نیە بۆ ئەوەی بکرێ لە هەموو کاتێکدا، بەکاربهێنرێ. لە یەك ساتدا دەبێ هەم وریا بین و هەم هەڵەشە. دەبێ وەك پرۆتۆس[٤٧] بین و هەر ساتەو شکڵێکمان هەبێت. ئەم ئامادەییە لە نێوان خەڵکیدا زۆر دەگمەنە.

هیچ کەسێك چەند داناش بێت، ناتوانێ خۆی لەگەڵ هەموو گۆڕانەکاندا بگونجێنێ. چونکە مرۆڤ نازانێت چۆن بە پێچەوانەی شتێکەوە کە ڕەنگە بە سروشت ئارەزویەکی زۆری بۆ ئەنجامدانی هەبێ، ڕەفتار بکات. مرۆڤێکی دیش ناتوانێ خۆی بۆ وازهێنان لە کارێك هانبدات کە هەمیشە تیایدا سەرکەوتوو بوە.

لەبەرئەوە هەرکاتێك پێویست بێت مرۆڤێکی وریاو هێمن، گورجی و حاسم بوون لە خۆی پیشانبدات، نازانێت چۆن ئەم دەورە ببینێ و بە گشتی دەست لەسەر ئەژنۆ دادەنیشێ و هیچ کارێك ناکات. بەڵام گەر ئەو بیتوانیایە بە پێی هەلومەرج ڕەفتاری خۆی بگۆڕێت، ئیدی

هۆیەك نەدەبوو بۆ ئەوەی گلەیی لە بەخت بكات كە بۆچی وازی لەو هێناوە[٤٨].

ئەو كەسەی دژی بەخت دێتە مەیدانەوە دەبێت دوو شێوەی جەنگ كردن بزانێت: هەم شێوەی جەنگی بەرگریكارانە و هەم شێوەی جەنگی هێرشبەرانە. ئەو دەبێت بە شێوەیەكی كتوپڕو چاوەڕوان نەكراو، لەم شێوە جەنگەوە بۆ ئەوی دیان بڕوات. مەكیاڤیلی خۆی زۆرتر لایەنگری جەنگی هێرشبەرانە بوو. ئەو دەڵێت: "باشترە مرۆڤ ئازابێت تا ترسنۆك. چونكە بەخت وەك ژنێكە. ئەو كەسانەی دەیانەوێت دەستی بەسەردا بگرن، دەبێ وەك جەنگاوەرێك بەرەو ڕووی ببنەوەو تەنگی پێهەڵچنن[٤٩].

ئەم مەكیاڤیلیەی كە تیۆرەی بەخت پێشكەش دەكات، دەڵێی ئەو كەسە نیە كە فەسڵی پێشووی نوسیوە. ئەوەی لە تیۆرەی بەختدا دەیدۆزینەوە شێوازی لۆژیكی و ڕوونی مەكیاڤیلی نیە، بەڵكو شێوازێكی خەیاڵاوی و هەژێنەرە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا تیۆرەی بەخت، بێ گرنگی فەلسەفی نیە. ئەم تیۆرەیە جۆرێك لادان نیە لە بابەتەكانی تری میر، بەڵكو پەیوەندی بە سەرجەم بەرهەمەكەوە هەیە. مەكیاڤیلی هەوڵدەدات خوێنەرانی كتێبەكەی قەناعەت پێبكات كە لە ململانێكردن لەگەڵ بەختدا، ئەوە بەس نیە كە تەنها پەنا بۆ چەمكە مادیەكان ببرێ. بێگومان ئەو گرنگیەكی كەمی بەم چەكانە نەدەدا، مەكیاڤیلی لە سەرتاسەری كتێبەكەی خۆیدا ئامۆژگاری میر دەكات كە لە هونەری جەنگ غافڵ نەبێت. میرێك دەبێت هەموو بیركردنەوەو سەرنجی خۆی ئاراستەی هونەری جەنگ بكات[٥٠]. ئەگەر جبەخانەكەی لە هەلومەرجێكی باشدا بێت، پێویست ناكات نیگەرانی هەڵسەنگاندنی جیهان بێت بۆ خۆی. میر هەمیشە دەبێ بە پێی ئەم بنەمایە كاربكات: گرنگ نیە كە نەفرەت بكەن، بەڵكو گرنگ ئەوەیە كە بترسن[٥١]. ئەگەر جبەخانەی میر پڕبێت و هاوپەیمانی باشیشی هەبێت، ئەوا دەرەقەتی هەموو مەترسیەكان دێت. دەبێ لەوەش دڵنیا بێت كە تا ئەوكاتەی بەرقی سەرنێزەكەی، حورمەتی لە دڵی خەڵكیدا بۆ دروستدەكات، ئەوا هاوپەیمانی باشیش دەبێت[٥٢]. لێرەدا مەكیاڤیلی وەك لایەنگری میلیتاریزم قسەدەكات و تەنانەت دەكرێ لە قسەكانیدا، یەكەم بەرگریكەری فەلسەفی میلیتاریزمی سەرسەخت و حاسم، بدۆزرێتەوە. مەكیاڤیلی وتارێكی تایبەتی لە بارەی هونەری جەنگەوە نوسی كە تیایدا زۆر لە وردەكاریە تەكنیكیەكانی جەنگ تاوتوێ دەكات، وەك ئەو مەترسیانەی كە بەكارهێنانی بەكرێگیراوان دروستی دەكات و پێویستی خزمەتی سەربازی بۆ هەموان و هەروەها گرنگی زیاتری پیادە بەسەر سوارەو تۆپخانەدا. بەڵام هەموو ئەم بابەتانە تەنها لە ڕووی ئاگاداربوون لە ژیانی مەكیاڤیلی، سەرنجڕاكێشەرن، بەڵام نرخێكی سەربازی و زانستیان نیە. مەكیاڤیلی لە وتارەكەی خۆیدا بەناوی تەكنیكی جەنگەوە تەنها توانی وەك

ئاماتۆر /هاوی/ێکی سادە قسەبکات. ئەزموونی لەم بوارەدا کەم و بە پێی پێویست نەبوو. پیاوێك کە تەنها چەند ساڵ فەرماندەی نیمچە سەربازیەکانی شاری فلۆرانس بوو، لە ئاستێکدا نیە کە بتوانێ وەك کارشناسی جەنگ قسەبکات و بیروڕا دەربڕێ. دەبێ بگوترێ کە وتاری تەکنیکی جەنگ بە بەراوردکردن بە کۆی بەرهەمەکانی، شتێکی ئەوتۆ نیە.

بەڵام لە بەرهەمەکانی مەکیاڤیلیدا شتێکی دی هەبوو کە زۆر گرنگترە لە هەموو ئەمانە. مەکیاڤیلی جۆرێك ستراتیژی تازەی کەشف کردبوو کە پشت ئەستورە بە چەکە زیهنیەکان، نەك ئامێرە فیزیکیەکان. هیچ نوسەرێك بەر لە مەکیاڤیلی دەستی بۆ فێرکردنی ئەم ستراتیژیە نەبردبوو. ئەم ستراتیژە لە دوو ڕەگەز پێکهاتبوو. ڕەگەزێکیان بەرهەمی زیهنێکی لۆژیکی، هێمن و ڕوون بوو، وە ڕەگەزەکەی دی دەستکەوتی پیاوێك بوو کە هەم ئەزمونێکی تایبەتی زۆری لە کاروباری دەوڵەتدا بەدەستهێنابوو و هەم ناسینێکی قوڵی بۆ سروشتی مرۆڤ هەبوو.

## پەراوێزەکان

*1)Grotius*

*2)Pufendorf*

*3)Alfireri,deiprincipe edelle Iettere, Cap. VIII.*

*4)L A.Burd notes in his edition of*

*..PRINCIPE,P.3 66.*

*5)Discourses.Bk.II.chap.XXIIL*

*6)Idem,BkII,chap.xv;bk.I,chap.XXXVIIL.*

*7)Iden,Bk I.chap.XXXVIL.*

*8)Iden, Bk I.chap.LVIIL.*

*9)Iden, Bk I, chaps, IV,V.*

*10) Iden, Bk l,chap, LV.*

*11)Iden, Bk I, chap. LV.*

*12)The prince, chap. VII (VI in Farneworth trans.is a misprint), cf, chap.XIIL farnewortransp. 247,cf. p.304.*

*13) Discourses, Bk I,chap. LVIII.*

*14)Iden, Bk I, chap. IX.*

*15) Iden, Bk I,chap. XLIV.*

*16)Coladi Rienzi.*

*17)Iden, Bk I, chap. LV.*

*18) Iden, Bk II, preface. thomson trans, p. 1 91.*

*19) Iden, Bk I, chap. XXVL.*

*20)Mandragola*

*21)Iden, Bk I, chap. Ill.*

*22)The prince,chap. XIL.*

*23)Savonarola.*

*24)Iden, chap.VL*

*25)Iden, chap.XVIII,op. cit, 11,340.*

*26)Discoureses, Bk Ill chaps. IV,XXX.cf The prince.chap.III.*

*27)The prince, chap.XV.*

*28)AIIan H. Gilbert. Machiavellis 'prince' and ltsForenunners. 'The prince' as a Typical Book' de Reginine principum' (Duke University press,*

*1938)*

*29)Thomson trank.p. 3.*

*30)Gatarina de Medici.*

*31)Richelieu.*

*32)Burt.*

*33)The prince,chaplll,op, cit,,ll,200 f.*

*34)Kant, Fundamental Princcipales of the Metaphysics of Morals. English trans. by T.K Abbort,Kants Critique of reason and other Works an the Theory of Ethics (6th ed. New York and London, Longmans, Green and Co, 1927) p.3 2.*

*35)plato, Republic, 533 B.*

*36)Hippolyte Taime.*

*37)The Prince, VI,op.cit, 11,223 f.*

٣٨-بۆ ئاگاداری زیاتر بگەڕێوە بۆ فەسڵی سێهەمی ئەم کتێبەی نوسەر:

*E.Cassirer, Individnum und Kosmos in der Philosophie der Renaissance ,'Studien der Bibliothek Warburg' (Leipzing B G. Teubner, 1 927) X77-129.*

٣٩-دەکرێ وێنەی ئەم میدالیایە لەم کتێبەی خوارەوەدا بدۆزرێتەوە:

*D.P.Ersking Muir, Machiavelli and His Times(New York, E. P. Dutton and Co.1936). 1 50.*

*40)pico della Mianadola.*

*41)Ficino.*

*42)Cassirer,op,cit,pp.105 ff. and journal for the History of ideas.III, Nos, 2 and 3 (1942),123-144 and 319_346.*

لە بارەی حەزی ڤیچینۆ بۆ تاڵعبینی، بگەڕێوە بۆ:

*Paul Oskar Kristelle, The Philosophy of marsilio Ficino (New York, Columbia Universiy press, 1942) pp,310_346.*

*43)Discourses, Bk l,chap. LVI.*

*44)Jacoob Burckhart, Die Kulnir Der Renaisance in ltahien. English trans by S.G.C. middiemore (New York, Oxford University press,1937) p.269.*

*45)The Prince, chap XXV,op, cit,II,411ff.*

*46)Dantelnfemo,VII,67 ff.*

*47)Proteus.*

*48)The Prince, chap, XXV op, cit,II,414.*

*49)Iden,op,cit,II,41 6.*

*50)Hdem, chap,XVL.*

*51)Hdem,chap.XVII*

"باشترە لە میر بترسن یان خۆشیان بوێت؟ ئەگەر لە نێوان ئەم دوانەدا ناچاربین یەکێك هەڵبژێرین، ئەوا دەبێ بڵێین کە باشترە لە میر بترسن"

*52)Iden, chap, XL.*

تێبینی: ئەم نوسینە وەرگێڕانی فەسڵی دوانزەهەمی ئەم کتێبەی خوارەوەیە:

اسطورة دولت. ارنست کاسیرر. ت: یداله موقن- تهران، هرمس ١٣٧٧.

# فیکری سیاسی لە سەردەمی (یۆنان)دا

• د. پەترۆس غالی
▪ لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

## ١-دەولەتشارو دیموکراسی

فیکـری سیاسـی یۆنـانی توانـی بنـەما گشـتییەکانی ژیـانی سیاسـی دابریژێـت، ئەگـەرچی لـەژێر کاریگـەری ئـەو سسـتمە سیاسیەشدا بوو کە لە ولاتی یۆناندا بەرقەرار بوو، تـا رادەیـەکی زۆریـش لـە ولاتـانی دیکـە جیـای دەکـردەوە. یۆنـانی کـۆن لـە کۆمەلـە شـاریك پیکـهاتبوو کـە پییـان دەوتـن (دەولەتشـار) و هەریەکـەیان سسـتمی کۆمەلایـەتی و ئـایینی خۆیـان هـەبوو، دانیشتوانەکانیشـیان لـە سێ چـین پیکهاتبوون:

١-کۆیلەکان:

ئەمانـە لە ریزبەندی چینایەتیدا لـە دوای دواوە بوون و هیچ مـافێکی هاولاتیـان نـەبوو، لەبەرئەوەی هاولاتیبون لە یۆنانی کۆندا تەنها تایبـەت بـوو بـە ئـەندامانی چینـی سـێیەم کـە دواتر دێینە سەر باسکردنیان.

٢-بێگانەکان:

شـارەکانی یۆنـان بـە شـێوەیەکی گشـتی بێگانەیەکی زۆریان تێدابوو کـە بـە مەبەسـتی بازرگـانیکردن و هـەندێ پیشـەی هونـەری دەسـتی، لـەوێدا نیشـتەجێ بووبـوون. یاسـا لۆکالیـەکانی دەولەتشارەکانی یۆنـان رێگـەیان نـەدەدا بیانیـەکان ببنـە خـاوەن رەگەزنامـەی یۆنانی، هەربۆیە پلەوپایەی بێگانەکان لەوێدا

لە ئاست پلەوپایەی کۆیلەکاندا بوو، بەڵام ئەوەی جیایدەکردنەوە ئەوەبوو کە بێگانەکان ئازاد بوون.

٣-هاوڵاتیان:

سیفەتی هاوڵاتی دەسکەوتێك بوو بە ڕێگای لەدایکبوون (لەدایك و باوکێکی یۆنانی) بەدەست دەهات، بەمجۆرە ئەو کەسە مافی ئەوەی دەبوو بەشداری ژیانی سیاسی بکات، واتە دەیتوانی لە کۆبوونەوە گشتیەکاندا بەشداربێت و پۆستە ئیداری و سیاسیەکانیش بگرێتە دەست.. لەبەرئەوە "ئەرستۆ" پێی وایە لێوەشاوەیی کەسێك بۆ پۆستی (دادوەر- *Jury*)، بەڵگەیەکی یەکلایکەرەوەیە لەسەر ئەوەی ئەو کەسە هاوڵاتییە لەو شارەدا. لە دەوڵەتشاری یۆناندا، پاشکۆیایەتیکردنی دەوڵەت مانای هەبوونی توانای بەشداریکردن بوو لە ژیانی سیاسیدا.

یۆنانیەکان وەها لە سیفەتی هاوڵاتیان دەڕوانی، وەك ئەوەی شتێکەو مرۆڤ لەگەڵ ئەوانی تردا بەشدارە تیایدا، واتە بە تەنها مافێکی یاسایی تاکەکەس خۆی نییە. شوێندەستی ئەم حەقیقەتەش لە فەلسەفەی یۆنانیدا دیاری دا..

کێشەی سیاسی لە سەردەمی یۆنانیەکاندا هەر ئەوە نەبوو تاکەکەس مافەکانی خۆی بدرێتێ، بەڵکو دەبوو پلەوپایەی کۆمەلایەتی خۆشیان بپارێزن، چونکە ئەوەیان بە مافێك لە مافە سروشتیەکانی مرۆڤ دەزانی.

## سستمە سیاسیەکانی (دەوڵەتشار)ی یۆنانی:

چاکترین نمونەیەك بۆ قسەکردن لەسەر سستمە سیاسیەکانی (دەوڵەتشار)ی یۆنانی شاری ئەسینایە، لەبەرئەوەی نمونەی باشترین سیستمی دیموکراسی بوە لە یۆنانی کۆندا. قسەکردن لە سستمی سیاسی (دەوڵەتشار)ی یۆنانی، پێویستی بە پێناسەکردنی ئەمانەی لای خوارەوە هەیە:

١-ئەنجومەنی گشتی:

تەواوی هاوڵاتیانی ئەسینا (نێرینەکانیان) ئەنجومەنێکی گشتیان پێکدەهێنا (*Fcclesie*) کە بریتی بوو لە ئەنجومەنی گشتی شارەکەو هەموو هاوڵاتیەکیش مافی ئەوەی هەبوو تیایدا بەشداربێت، بە مەرجێك تەمەنی گەشتبێتە بیست ساڵ. ئەم ئەنجومەنە ناوبەناو لە ساڵێکدا دە جار کۆدەبوەوە.

یۆنانیە کۆنەکان هەندێ ڕێوشوێنی سیاسیان گرتەبەر، بە مەبەستی ئەوەی فەرمانبەرە گشتیەکان لەژێر چاودێری کۆی هاوڵاتیاندا بن و لە ڕێی نوێنەرایەتیکردنی سیاسیەوە وایان لێبکەن لە بەرامبەریاندا بەرپرسیاربن. هەروەها توانیان ئەنجومەنێکی هەڵبژێردراوی بنکە فراوان پێکبهێنن کە بتوانێت نوێنەرایەتی سەرجەم چین و توێژەکانی هاوڵاتیان بکات. ماوەیەکی کورتیشیان بۆ نوێنەرایەتیکردنی هاوڵاتیان

لەو ئەنجومەنانەدا دیاریکرد، واتە بواری ئەوەیان نەدەدا نوێنەرێك دوو جار خۆی هەڵبژێرێتەوە، ئەمەش بۆ ئەوە بوو تا هەموو هاولاتیان بتوانن بەشداری تێدابکەن.

٢-لیژنەی نوێنەرایەتیکردن:

لیژنەکانی نوێنەرایەتیکردن لە ئەسینا پێکهاتبوو لە دوو ئەنجومەن:

أ-ئەنجومەنی پێنج سەدکەسی.

ب-دادگاکان.

(أ)ئەنجومەنی پێنج سەد کەسی:

ئەنجومەنێکی هەڵبژێردراوەو وەك لیژنەی جێبەجێکردنی کۆنگرەی گشتی (*Lcclecia*) وایە.. بەوپێیەی شاری ئەسینا لە دە (خێڵ) پێکهاتبوو، ئەوا هەر خێڵەو بۆی هەبوو پەنجا نوێنەری خۆی بۆ ئەو ئەنجومەنە دەستنیشان بکات. بۆ ئاسانکردنی ئەرکی ئەنجومەنەکەش، ئەو پێنج سەد ئەندامە بەسەر دە لیژنەدا دابەشکرابوون. هەر لیژنەیەکیش نوێنەرایەتی هەر دە خێڵەکەی دەکرد. لیژنەکان بە درێژایی ساڵ وەکی یەك دەسەلاتی حوکمڕانیان ئاڵوگۆڕ دەکرد، بەلام سەرۆکی لیژنەکان هەموو ڕۆژێك دەگۆڕان و ئەرکی لیژنەکانیش بریتی بوو لە:

١-پێشنیارکردنی یاساکان.

٢-ڕاپەڕاندنی ئەرکی دەسەلاتی جێبەجێکردن.

٣-پێشوازیکردن لە باڵیۆزەکان.

٤-چاودێری کردنێکی تەواوی فەرمانبەرە گشتییەکان.

٥-مافی سزادانی هاولاتیانی هەبوو.

٦-سەرپەرشتیکردنی دارایی و بودجەی دەوڵەت و بەڕێوەبردنی موڵك و مالاتی گشتی دەوڵەت و کۆکردنەوەی باج.

٧-سەرپەرشتیکردن و بەڕێوەبردنی کەشتی گەلی ولاتەکە.

هەرچی مەسەلە گرنگەکانی دیکەی دەوڵەتیشە، وەك بڕیاردان لە شەڕو کۆتایی پێهێنانی یان سەپاندنی باجی نوێ یاخود دانانی یاسای تازە، ئەوا دەبوو سەرەتا بەر لە جێبەجێکردنیان بخرێنە بەردەم ئەنجومەنی گشتی بۆ ئەوەی بڕیاریان لەسەربدات.

ب/ دادگاکان:

دادگاکان بە بنەمای سستمی دیموکراسی دادەنرێن لە ئەسینادا. ژمارەی ئەندامەکانی لە نێوان ٢٠١ بۆ ٥٠١ کەسدا بوو، ئەم ئەندامانەش میللەت لە ڕێگای لیژنە لۆکاڵیەکانەوە دەستنیشانیان دەکردن و بێ بەرامبەر کاریان دەکرد. هەروەها نەدەبوو هیچ ئەندامێك تەمەنی لە خوار سی ساڵەوەبێت. بە شێوەیەکی سەرەکی ئەرکی ئەم دادگایانە بڕیاردانبوو لە کێشە مەدەنی و جینائیەکان.

کاتێك کێشەی تاوانبارێك دەخرایە بەردەمی دادگا بۆ ئەوە بوو دەنگی ئەندامەکانی وەربگیرێت لەسەر ئەوەی ئایا ئەو کەسە تاوانبارە یاخود بێگوناهە، گەر دادگا بڕیاریدا لەسەر ئەوەی ئەو کەسە تاوانبارە، ئەوا دەنگدانێکی تر دەکرا بۆ دیاریکردنی

جۆری سزاکەی و بڕیاری دادگاش دەبوە دوا بڕیارو کۆتایی بە کێشەکە دەهێنا. لەگەڵ ئەوانەشدا دادگاکان چاودێری فەرمانبەرانی گشتیان دەکردو بڕیاریان لەسەر گونجاوی و لێهاتوویان دەدا، هەروەها دوای تەواوبوونی ماوەی کاری ئەو فەرمانبەرانەش بە حساباتیاندا دەچوونەوە.

لە یۆنانی کۆندا دادگا مافی دادگایکردنی خودی قانونیشی هەبوو، واتە دەیتوانی پرۆتستۆی هەر یاسایەك بکات کە ئەنجومەنی گشتی بڕیاری لەسەر دابێت، بە بیانووی ئەوەی ئەو یاسایە لەگەڵ دەستوری شاردا ناکۆکەو ناگونجێت. لێرەوە دەردەکەوێت دادگا دەسەلاتێکی یاسادانانی وەهای هەبوە کە خۆی لە دەسەلاتی ئەنجومەنی گشتی دەدا.

## ٢-"ئەفلاتۆن" و یۆتۆپیا:

"ئەفلاتۆن" ساڵی ٤٢٧ پ. ز لە بنەماڵەیەکی ئۆرستۆکراتیدا هاتۆتە دنیاوەو قوتابی "سوکرات"ی فەیلەسوف بوە. لە ساڵی ٣٦٧ بۆ ٣٧١ ڕودەکاتە سیراکۆز بۆ ئەوەی ببێتە مامۆستای شازادە "دیۆنسیۆس-*Dionysius*". گرنگترین ئەو کتێبانەی نووسیونی، بریتین لە: (کۆمارو سیاسەت و یاساکان).

١-کتیبی کۆمار: "ئەفلاتۆن" لەم کتیبەیدا باس لە مەسەلەگەلیکی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و ئابوری و سیاسی دەکات، ئەوەی لیرەدا لەم کتیبەدا مەبەستمانە تیۆریا سیاسیەکانی و بیرۆکەی سەرەکی ناو کۆمارەکە لە "سوکرات"ی مامۆستای وەرگرتوەو دەلیت: (زانین فەزیلەتە).

"ئەفلاتۆن" کە باسی فەزیلەت دەکات لەناو دەولەتدا، مەبەستی ژیانیکی چاکترو ئاسودەترە بۆ مرۆڤ و بۆ کۆمەلگەش. لای ئەو فەزیلەت تەنها ئامرازیك نیە، بەلکو ئامانجیکە لە خۆیداو بەبێ بوونی فەزیلەتیش کۆمەلگەی سیاسی دروست نابیت. هەروەها گرنگیەکی زۆر بە فەیلەسوفان و زانایان دەدات و دەسەلاتی بەریوەبردنی حوکمرانی دەداتە دەستی ئەوان، چونکە ئەوان مەعریفی تەواویان هەیە بۆ چەسپاندنی فەزیلەت و ئەم بۆچونەش ناوەرۆکی کتیبی (کۆمار)ە. بەرای "ئەفلاتۆن" دەولەتی فەزیلەت ئەوکاتە دروست دەبیت کە دەسەلات لە دەستی فەیلەسوفاندا بیت، چونکە ئەوان خاوەنی مەعریفەن و پەی بە بنەماکانی کۆمەلگای سیاسی دەبەن.

**لە یۆنانی کۆندا دادگا مافی دادگایکردنی خودی قانونیشی هەبوو**

ئەو پێی وایە زۆربەی زۆری گەل نەفامن و کەمەکیکیان خاوەنی مەعریفەن و شایستەی ئەوەن حوکمرانی بکەن. سستمی سەرکەوتوش ئەوەیە کە تەواوی دەسەلاتەکان بداتە دەستی ئەو چەند کەسە. لیرەوە دەردەکەویت کە (کتیبی کۆمار) رەخنەیەکی توند بوە لە بارودۆخی سیاسی (دەولەتشار)ی یۆنانی، بە تایبەتی لە ئەسینادا. لەم بارەیەوە دەلیت: (گەل بەکەلکی ئەوە نایەت خۆی حوکمی خۆی بکات) و سیاسەتمەدارانی ئەسیناش بە کەسانی نەزان و لاواز ناودەبات، سستمی دیموکراسیش بە بەرپرسیاری ئەم جەهل و لاوازیە دەزانیت.

دیموکراسیەت فرە حیزبی دروستکردوەو هەریەك لەو حیزبانەش بەرژەوەندی تایبەتی خۆیانیان هەیەو دروستکردنی هاوسەنگیەك لە نیوان خواست و ویستەکانیاندا کاریکی زەحمەتە.. هەر بۆیە بەردەوام ناکۆکی و دوبەرەکانیی لیدەکەویتەوەو سەرەنجام کۆمەلگە بەرو لاوازبوون دەبات و دواتریش بە یەکجار لەناودەچیت.

چارەسەری دروستی ئەم کیشەیە بەلای "ئەفلاتۆن"ەوە، لەوەدایە مولکداریتی لە نیوان چینی حوکمرانەکاندا نەهیلریت و دەولەت خۆی هەستیت بە پەروەردەکردنیان بە شیوەیەکی سیاسی تەواو. دواتر بە دریژی باس لەمە دەکەین.

٢-دروستبوونی دەولەت لای "ئەفلاتۆن":

"ئەفلاتۆن" پیی وایە گردبوونەوەی مرۆڤ و کۆبونەوەیان لەگەل یەکتردا، بەرەنجامی پیداویستیە ئینسانیەکانە کە تەنها لە ریی هاریکاریکردنی یەکتریەوە تیردەکرین و دەستەبەر دەکریت و هیچ مرۆڤیکی کامل توانای ئەوەی نییە تەواوی پیداویستیە سەرەکیەکانی ژیانی خۆی پەیدابکات. واتە "ئەفلاتۆن" دەیەویت بلیت: (دروستبوونی کۆمەلگەی شارستانی بەرەنجامی پیداویستیە ئابوریەکان و ئالویردکردنی خزمەتگوزاریەکانە لە نیوان مرۆڤەکاندا لە چوارچیوەی کۆمەلگەدا). کەواتە وەزیفەی دەولەت دۆزینەوەی باشترین ریگاچارەیەکە بۆ ئاسانکردنی پرۆسەی ئالویرد لە نیوان مرۆڤەکاندا. لە بەرامبەردا ئەرکی هاولاتیان ئەوەیە بەو کارانە هەستن کە پلەوپایە کۆمەلایەتیەکانیان دەیخاتە سەر شانیان.. لیرەدا دەبیت دەولەت ئەو هۆکارانە بخولقینیت کە ئاسانکاری بۆ هاولاتیان دەکەن تا بە ئەرکەکانی سەرشانی خۆیان هەستن، ئەمەش مانای ئەوەیە ئەو ئازادیەی دەولەت بۆ تاکەکەسی دەستەبەر دەکات مەبەست لیی بەخشینی ئیرادەیەکی ئازادی رەها نیە پیی، بەلکو بۆ


ئەفلاتون

ئەوەیە بتوانیت ئەرکەکانی سەرشانی خۆی جیبەجێ بکات.

تیۆریاکەی "ئەفلاتۆن" پرانسیپیکی ئابوری نوێ لەخۆی دەگریت، ئەویش پرانسیپی دابەشکردنی کارو پسپۆری ئابوریە. واتە هەر کەسەو خەریکی بەرهەمهینانی تەنها شمەکیك بیت و لە پیویستی خۆشی زیاتر ئەو شمەکە بەرهەم بینیت، بۆ ئەوەی بە زیادەکەی بتوانیت ئەو پیویستیانەی تری پێ بەدەست بینیت کە خۆی توانای بەرهەمهینانی نیە.ئەم تیۆریایە دوو حەقیقەتی سەرەکیمان لە سروشتی مرۆڤدابۆ ئاشکرا دەکات:

یەکەم: بەهرە سروشتی و خۆرسکەکانی کەسیك لەگەڵ کەسیکی تردا جیاوازە.

دوەم: ئەوانەی خۆیان بەو کارانەوە خەریك دەکەن کە لەگەڵ حەزو ئارەزوی خۆیاندا دەگونجیت، شارەزاییەکی چاکتر و باشتریان دەبیت و زوو فیری کارەکەش دەبن.

بە بۆچونی "ئەفلاتۆن" ئەمە ئەو هیزە شاراوانەن کە کۆمەڵگەی ئینسانی بەرەو بەرکەمالبوون دەبەن. هاوکات پیی وایە کە کیشەیکۆمەڵگە ئەوە نیە تاکەکەسەکان بەپیی لیهاتووییان دابەش بکات، لەبەرئەوەی وەها دابەشکردنیك سروشت خۆی تاکەکەسەکانی پێ ناچار دەکات، بەلکو کیشەی راستەقینە ئەوەیە دەرفەت لە بەردەم بەهرە جۆراوجۆرەکاندا بکریتەوە تا توانای خۆیان تاقی بکەنەوە بۆ ئەوەی بگەنە رادەی بەرکەمال بوون و دواجار هەر ئەمەش دەبیتە مایەی ئەوەی کۆمەڵگە بتوانیت مەبەستە بەرزو باڵاکانی خۆی بینیتە دی. لیرەدا گرنگی فەرمانرەوای فەیلەسوف و پلەوپایەی ئەومان لە کۆمەڵگەدا بۆ دەردەکەویت، چونکە ئەو تەنها کەسیکە کە زانیاری پیویستی هەیە دەربارەی ئەو ئامرازانەی گەشە بە بەهرە سروشتی و خۆرسکەکانی تاکەکەس دەدەن و کۆمەڵگە ئاراستە دەکەن بەرەو ئەوەی ئامانجە بەرزو باڵاکانی بەدی بهینیت.

٣-**چینەکانی کۆمەڵگە**: "ئەفلاتۆن" پیی وایە هەر دەولەتیك سێ ئەرکی پیویست و گرنگ دەگریتەئەستۆ، ئەوانیش بریتین لە:

١-دابینکردنی پیداویستیەکان.
٢-پاراستنی دەولەت.
٣-حوکمی دەولەوت.

ئەگەر هەر لەگەڵ ئەو پرانسیپی پسپۆریەدا برۆین کە "ئەفلاتۆن" باوەری پییەتی، دەبینین ئەرکی راپەراندنی ئەو کارانە دەکەویتە سەرشانی ئەم سێ چینە:

١-چینی کریکارانی بەرهەمهین.
٢-چینی سەرباز.
٣-چینی فەرمانرەواکان.

"ئەفلاتۆن" پیی وایە سەرچاوەی دابەشکردنی کۆمەڵگە بەسەر ئەم چینانەدا، دەگەریتەوە بۆ جیاوازی تواناو لیهاتوی نیوان ئینسانەکان و بەگشتی سێ جۆر لەخەڵك هەن:

یەکـەم/ ئەوانـەی سروشـت بـۆ کـارکردن نەوەك بۆ فەرمانرەوایی ئامادەی کردون.
دوەم/ ئەوانـــەن کـــە بـــە کـــەلکی فەرمانرەوایەتی دین، بەلاّم بەو مەرجەی لەژیر چاودیری خەلکانی تردابن.
سییەم/ ئەوانەن کە لیوەشاوەییان تیدایە بۆ حوکمرانیکردن.

ئـەم ریزبـەندە چینایەتیـە لـەو سسـتمە چینایەتیە ناچیت بۆ نمونە کە لە هندستاندا هەیە، لەبەرئەوەی "ئەفلاتۆن" مانەوە لەناو ئەو تویژو چینانەدا ناکاتە شتیکی پیشتاوپشت و بۆماوە، بەلکو بە پیچەوانەوە دەبینین ئەو هەلی بینینەوەی نمونەیەکی ئایدیالی دەدات: ئەویش دۆزینـەوەی گروپیکە کە هـەر مندالیـك تیـایدا لەدایك دەبیت بۆی هەبیت لە بەرزترین جۆری ئـەو مەشـق و راهینانـە بەهرەمـەند بیـت کـە لەگـەلّ حـەزو ئارەزوەکـانی خۆیـدا دیتـەوە، هەروەها هەموو فەردیك تیایدا بتوانیت بەپیی لیوەشاوەیی و توانـای خـۆی بگاتـە بـەرزترین پلەوپایـەکانی دەولـەت. ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنیت کە "ئەفلاتۆن" بە هیچ شیوەیەك بـروای بـە دەمارگـیری چینایـەتی نـەبوە. هەرچەندە نابیت ئەوەش لەیاد بکەین کە ئەو پیی وابوە زیرەکی و دانایی بە تەنها سیفەتی چینـی حوکمرانەکانـە، بـەلاّم بـەردەوام باسـی توانـاو لیـهاتوویی چینـی پیشەوەرانیشـی کردوە، ئەگـەرچی لـە روی سیاسـیەوە ئەمانـە تەنـها دەبیـت گویرایـەلی بکـەن و توانـای ئـەوەیان نیـە لـە ریـی فـیرکردن یـان راهینـان یاخود شارەزاییەوە، فیری زانینی سیاسی بن و مەعریفەی سیاسی بەدەست بینن.

٤-داد پـــــــەروەری: دادپـــــــەروەری لای "ئـــەفلاتۆن" بـــە مانـــای یەکیـــەتی و یـەکگرتن دیـت کـە تاکەکەسـەکان پیکـەوە کۆدەکاتـــەوەو هەریەکـــەیان دەتوانـــن لـــە سـایەیدا بـەو رۆلـە هەلبسـتن لـە ژیـاندا کـە لەگـــەلّ بـــەهرەو توانـــاو لیـــهاتویاندا دەگونجیت.

دادپـەروەری لەیـەك کـاتدا فەزیلـەتیکی تایبـەتی و گشتیشـە. فەزیلـەتیکی تایبەتیـە لەبەرئـەوەی لـە کۆمـەلدا کاریکیدیـاریکراو بـە تاکەکەس دەسپیریت و وای لیدەکات بەکەلکی ئـــەنجامدانی ئـــەو کـــارە بیـــت، هـــەروەها فەزیلـەتیکی گشتیشــە لەبەرئـەوەی کۆمەلگـە چاك و ئاسـودە دەبیـت، گـەر هـاتوو هـەموو کەسـیك بـەو کـارە هەسـتیت کـە خـۆی لیـی دەزانیت و شارەزایی تیدا هەیە.

بەمجۆرە کۆمەلگە سود لە کاری تاکەکەس وەردەگریـــت و تاکەکەســـیش لـــە کۆمەلگـــە قـــازانج دەکـــات، لەبەرئـــەوەی جیگایـــەکی شایستەی پیّ بەخشیوەو دەرفەتی ئەوەی بۆ رەخسـاندوە تـا بـە چاکـترین شـیوە کارەکـانی جیبەجیّ بکات.

لـیرەوە بۆمـان دەردەکـەیت، لیکدانـەوەی "ئەفلاتۆن" بە شیوەیەکی سەرەکی پشت بەوە دەبەســـتیت کـــە دروســـتبوونی دەولـــەت بەرەنجامی پیداویستیەکی هەمەلایەنەو کەسی فــەرمانرەواش لــەم قاعیدەیــە بــەدەر نیــە.

لەبەرئەوەی ئەویش بە ئەرکیك هەلدەستیت و کاریك دەکات کە دانایی و لیهاتوویی خۆی گەیاندویەتی بەوە.

بەمجۆرە لایەنەکانی تیۆری "ئەفلاتۆن" دەربارەی دەولەت تەواودەبیت، سەرەتاش بەو بۆچونە دەستیپیکرد کە سۆراخ و گەرانی ریکوپیك دەمانگەیەنیتە ناسینی چاکەو چاکەش بناغەی دروستبوونی کۆمەلگەکانە. هەروەها پیی وایە دابەشکردنی کارو پسپۆری لە پیشەدا، مەرجی هاریکاری کۆمەلایەتین و کیشەی پادشای فەیلەسوفیش ئەوەیە کە هەموو ئەم کارانە بە چاکترین شیوە ریك بخات. دادپەروەریش بەوە بەرقەرار دەبیت هەرکەسەو لە شوین و جیگەی کۆمەلایەتی خۆیدا دابنریت، بە جۆریك کە لەگەل خەسلەت و شارەزاییاندا بگونجیت.

دوای هەموو ئەمانەش ئەوەی دەمینیتەوە ئەوەیە، لەو ریگایە بگەریین کە سیاسەتمەدار دەتوانیت بە هۆیەوە هاوسەنگیەکی گونجاو و پیوست دروست بکات: بۆ ئەوەش "ئەفلاتۆن" پیشنیاری دوو شتی کردوە:

١-هەموو ئەو کۆسپ و تەگەرە تایبەتیانە وەلاوە بنرین کە ریگرن لەبەردەم گەیشتن بە پلەوپایەی هاولاتی چاك (شیوعیەت).

٢-پەرە بە ئەقلیەت و حەزو ئارەزوەکانی هاولاتی بدریت (تیۆری پەروەردە).

٥-**شیوعیەتی** "ئەفلاتۆن": وەك بینیمان سستمی سیاسی کۆماری "ئەفلاتۆن" لەمانە پیکدیت: دامەزراندنی پیشەوەری و کاری دەستی بۆ دەستەبەرکردنی پیداویستیە سەرەکیەکان و پیداویستیەکانی دیکەی ژیان، لەگەل پیکهینانی سوپایەکی بەهیز بۆ پاراستنی دەولەت و دۆزینەوەی تویژی فەرمانرەوایان. ئەو پیی وایە باشترین گرانتییەك بۆ ئەوە چینی فەرمانرەوایان بە پاکی بمیننەوە ئەوەیە کە:

١-لە مولکایەتی تایبەت بیبەش بکرین.

٢-ریگایان پینەدریت خیزان دروست بکەن.

٣-موچەیەکی دیاریکراویان بدریتێ کە لەگەل پلەوپایەی کۆمەلایەتیاندا بگونجیت.

لیرەوە بۆمان دەردەکەویت کە شیوعیەتی "ئەفلاتۆن" تەنها چینی فەرمانرەوایان دەگریتەوەو ناچاریان دەکات ژیانیکی شیوەسەربازیانە بژین، واتە شیوعیەتی ئەو لە شیوعیەتی ئۆردوگا دەچیت.

## مەبەستی "ئەفلاتۆن" لە شیوعیەت جیاوازە لە مەبەستی شیوعیە نوییەکان

مەبەستی "ئەفلاتۆن" لە شیوعیەت جیاوازە لە مەبەستی شیوعیە نوییەکان، چونکە ئەو پیی وایە ئەوە سیاسەتیکی سك

هەلگوشینەو دەبێت چینی فەرمانرەوایان جیبەجیی بکەن و ئەوەش تاکە ریگایەکە وایان لیبکات کارەکانیان بە پاکی و سەرراستانە راپەرینن. سروشتی ئەو کارەی ئەوانیش ئەوە دەخوازیت بە تەواوەتی خۆیان لە پیودانگەکانی ژیانی ئاسایی قوتار بکەن، لەم روەوە شیوعیەتی "ئەقلاتۆن" بە سستمی رەهبانیەتی مەسیحی دەچیت.

بەلام بۆچی ریگا بە ژن و ژن خوازی نادات لەناو ئەندامانی ئەم چینەدا؟ئەوا لەبەرئەوەیە کە (بە بروای ئەو) ژنهینان ریگرەو ناهیلیت پیاوان خۆیان بۆ کاروباری دەولەت تەرخان بکەن، هەروەها ژنانیش بە ئیشوکاری مالداریوە خەریك دەکات، لە کاتیکدا "ئەفلاتۆن" دەیەویت ژنان بەشداری ژیانی گشتی کۆمەلگە بکەن.

**٦- پەروەردەو فیرکردن:** بەلای "ئەفلاتۆن"ەوە بواری پەروەردەو فیرکردن چاکترین ئامرازیکە بۆ دروستکردنی یۆتۆپیا، بەردەوامیش ئەوە دوبارە دەکاتەوە دەولەت جگە لە ریکخراویکی پەروەردەیی شتیکی تر نیە. گەر هاولاتیان بە چاکی پەروەردە کران، ئەوا دەتوانن بەسەر ئەو کۆسپ و تەگەرانەدا زالبن کە دینە ریگایان.

هەربۆیە "ئەفلاتۆن" جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە نابیت بواری پەروەردەو فیرکردن بدریتە دەستی خەلك و لیژنەی تایبەتی، بەلکو دەبیت دەولەت سەرپەرشتی تەواوی بکات و نەیکاتە سەرچاوەیەك بۆ بازرگانی کردن. لەمەوە بۆمان ئاشکرا دەبیت کە پرۆژەی پەروەردەو فیرکردنی "ئەفلاتۆن" دوو بەشە:

أ-خویندنی سەرەتایی: لە مندالەیوە تا تەمەنی بیست سالان دەخایەنیت و لەگەل دەستپیکردنی خزمەتی سەربازیدا ئەم قۆناغە کۆتایی دیت.

ب-خویندنی بالا: ئەوەی لەم قۆناغەدا دەخوینیت ئامادە دەکریت تا داخل بە چینی دەسەلاتدار و حوکمرانەکان بیت و لە تەمەنی بیست سالەیوە دەستپیدەکات و تا تەمەنی سی و پینج سالی دەخایەنیت.

"ئەفلاتۆن" بروای تەواوی هەیە بەوەی کە هەموو کەسیك مافی خویندنی هەیە (نەك لەبەرئەوەی بەتەنگ مافی تاکەکەسەوەیە)، بەلکو ئەمە لە پیناو بەرژەوەندی بالای کۆمەلگەدا دەکات.

لە کاتیکدا کە بۆ خویندن پی لەسەر یەکسانی کورو کچ دادەگریت و ئەو پرۆسەیە بە مافیکی رەوای هەردوو لایان دەزانیت، مانای ئەوە نیە کە ریزی مافی ئافرەت دەگریت، بەلکو مەبەستی لەم کارە ئەوەیە تەواوی بەهرە خۆرسکەکان بخاتە خزمەتی دەولەتەوە.

بابەتەکانی پەروەردەو فیرکردنیش دەکات بە دوو بەشەوە:

أ-مۆسیقاو هونەرە بەرزو بالاکان بۆ پەروەردەکردنی دەرون، لەگەل وەرزشی لەش و لار بۆ راهینانی جەستە.

ب-خویندنی باڵا کە خویندنی ماتماتیك و گەردون و لۆژیك دەگریتەوە. بە رای ئەو خویندنی ئەم بابەتانە یەکەمین دەسپیکە بۆ خویندنی فەلسەفە.

**٧-تیۆری "ئەفلاتۆن" لە هەردوو کتیبی (یاساکان) و (سیاسەت)دا:** "ئەفلاتۆن" لە کتیبی (کۆمار)دا باس لە (فەرمانرەوای فەیلەسوف) دەکات و پیی وایە دەبیت ئەم فەرمانرەوایە لە دەولەتدا دەسەڵاتی رەهای هەبیت، ئەم دەولەتەش بە پەیمانگایەکی زانستی دەچوینیت کە تیایدا هاوڵاتیان لە هەموو شتیکیاندا پشت بە فەرمانرەوای فەیلەسوف دەبەستن، وەك چۆن پەیمانگایەکی زانستی پشت بەو فەیلەسوفانە دەبەستیت کە سەرپەرشتی دەکەن.

جیاوازی سەرەکی نیوان تیۆرەکەی لە کتیبی (کۆمار) و تیۆریەکەی لە کتیبی (یاساکان)دا ئەوەیە، حکومەت بەپیی تیۆری کتیبی یەکەمی حکومەتیکی هەڵبژاردەیە و پابەندی هیچ یاساو ریسایەك نابیت، بەڵام بەپیی تیۆریەکەی لە دوەم کتیبدا حکومەت ملکەچی یاسایە، ئەو یاسایەی وەکو یەك فەرمانرەواو هاوڵاتیان ناچار دەکات پابەندی بن.

لەگەڵ ئەوەشدا نابیت وا تیبگەین کە "ئەفلاتۆن" بیرۆکەی دەولەتی میسالی واز لیهیناوە، بەلکو هەر بە پەسەندترین نمونەی دەزانیت و تەنانەت دەولەتی یاسا لای ئەو پلەیەك لە خوار دەولەتی میسالیەوەیە. بەرای ئەو دەولەتی یاسا بەرەنجامی رەفتارو هەلسوکەوت و شارەزاییە و لە ناوچەیەکی دیاریکراوداو لە هەلومەرجی تایبەتدا دروستدەبیت، واتە لە ریی هەلسوکەوت و شارەزاییەوە پیمان دەگات تا حوکمی کۆمەلگاکەمان بکات، بەڵام هەلومەرجی کۆمەلگەی ئیمە لە هەلومەرجی ئەو کۆمەلگایە جیاوازە کە ئەو یاسایانەی تیا هاتۆتە ئاراوە. ئەی کەواتە چۆن چۆنی ئەقل ئەو یاسایە پەسەند دەکات، لە کاتیکدا دەزانیت ئەو هەلومەرجەی ئەو یاسایەی تیدا رسکاوە گۆرانی بەسەردا هاتوە؟ بەمجۆرە یاسا لەگەڵ ئەقل و مەعریفەدا ناکۆك دەبیت و لەگەلیاندا ناگونجیت، هەرکاتیکیش یاسا لەگەڵ مەعریفەدا ناکۆك بوو، دەبیت هەمیشە لایەنگری مەعریفە بین و پیش یاسای بخەین.

**٨-حوکمی یاسا:** لە کتیبی (سیاسەت)دا "ئەفلاتۆن" دیتە سەر پیناسەکردنی سیاسەتمەدار و دەلیت: (سیاسەتمەدار خاوەنی مەعریفەی راستەقینەیە). لەم روەوە

سیاسەتمەدار
خاوەنی
مەعریفەی
راستەقینەیە

ئـەرکی سیاسـەتمەدار بـە ئـەرکی لیپرسـراوی خـیزان دەچوینیـت، لەبەرئـەوەی هەریەکـەیان کار بۆ بەرژەوەندی گروپەکەی خۆیان دەکـەن ئیتر خیزان بیت یان کۆمەلگە. لە لایەکی ترەوە "ئــەفلاتۆن" سیاســەتمەدار بــەو پزیشـــکە دەچوینیــت کـــەداوای لیدەکریـــت پابـــەندی کتیبـەکانی بواری پزیشکی بیت، بـەلام داخـۆ گەر ئـەو خـۆی (واتـە سیاسـەتمەدار) دانـەری یاساکان بیت، چۆن دەکریـت داوای لیبکریـت پابـەندی یاسـاو ریسـایەك بیـت کـە خـۆی دایناون؟

تـــا هەنوکـــەش لایـــەنگرانی سســـتمە تۆتالیتــاری و دیکتاتۆریــەکان دەســتبەرداری ئـەم بەهانەیـە نـابن. "ئـەفلاتۆن" پیـی وایـە رەزامەندی هاولاتیان گرنگیەکی ئەوتۆی نییە، لەبەرئـەوەی تەنـها سیاسـەتمەدار بـە تـەنگ بـەرژەوەندی گشـتیەوەیەو لـە پینـاو ئەوەشـدا ناچاردەبیت یاساو تەقالیدەکان فەرمۆش بکات و ریگا لە ئازادی هاولاتیان بگریت.

پاشان لە نیوان حوکمرانیکی ستەمکار و پادشایەکی زالمی رۆشنگەردا جیاوازی دەکات و رونیدەکاتـەوە کـە سـتەمکار هـیزو زۆریکـی نـارەوا بـەکاردینیت تـا حوکمـی خـۆی بەسـەر گـەلیکدا بسـەپینیت کـە لیـی رازی نـین و نایانـــەویت، بـــەلام پادشـــای رۆشـــنگەر یـــان سیاســـەتمەداری راســـتەقینە ژیـــری و داناییەکـەی وایلیدەکـەن حوکمرانیکردنەکـەی بـەلای میللەتەکەیـەوە پەسـەند بیـت و پیـی رازیبن.

٩-**سستمی حوکمرانی:** لـە کتیبی (کۆمار)دا "ئــەفلاتۆن" جۆرەهــا دەولــەت و سســـتمی حوکمرانـی خسـتۆتەروو، لـەناو هەموشـیاندا دەولەتـە میسـالیەکەی خـۆی بـە چاکـترین سستمی حوکمرانی داوەتە قەلـەم. لەپاش ئەو دەولـــەتی تیمۆکراســـی *Timocracy* و دواتـــر دەولەتی ئۆلیگارشی *Oligarchy* واتە حکومـەتی دەولەمەندەکان دیت. پاشان ئۆلیگارشی بەرەو دیموکراسی پەرەدەسینیّ و دوای ئەوە دەبیتـە حوکمی ستەمکاری، ئەمەش بەدترین سستمی حوکمکردنە.

بەلام لە کتیبی (سیاسەت)دا ریزبەندیەکی تر دەکات کە بەمجۆرەی لای خوارەوەیە:

١-دەولــەتی میســالی: فەرمانرەوایـــەکی فەیلەسوف سەرکردایەتی دەکات، ئەم دەولەتـە دەولــەتیکی ئیلاهییــەو لــەم دنیــادا جیـــی نابیتەوە.

٢-دەولــەتی دنیــایی، ئەمــەش شـــەش جۆرە:

ســیانیان پابــەندی یاســان و ســییەکەی تریشیان گویرایەلی یاسا ناکەن.

ئەوانەی پابەندی یاسان:

أ-حوکمی تاکەکەس (پادشای رۆشنگەر).

ب-حوکمی کەمینەیەکی ئۆرستۆکراتی.

ج-حوکمی دیموکراسی میانرەو.

ئەوانەی پابەندی یاسا نین:

د-حوکمی تاکەکەس (ستەمکار).

هـ-حوکمی کەمینەیەکی ئۆلیگارشی.

و-حوکمی دیموکراسی توندرەو.

بێگومــان "ئــەفلاتۆن" ئــەو دەولەتانــەی بەلاوە پەسەندە کە پابەندی یاسان، چونکە ئەو پێی وایە یاسا دەتوانێت ئاستێك بۆ سروشتی تاکەکەســـس دابنێــت کـــە بـــە شـــێوەیەکی غەریزیمەیلی بەلای شەرو خراپەدا هەیە. لەم روەوە یاسا بە ئەقل و مەعریفە دەچوێنێت کە پـیرۆزترین شـتێکن لـە دەولەتـە میسـالیەکەی ئەودا.

١٠-**دەولەتی تێکەل:** لە کتێبی (یاساکان)دا "ئەفلاتۆن" پێشنیاری دەولەتی تێکەل دەکات لــە پێنــاو پێکــەوەگونجان و هارمۆنیــەتێکی گشتیدا، ئەویش لە رێی هاوســەنگی هـێزەوە دەبێـت و ئـەم دەولەتـە پرانسـیپی دانـایی لــە سسـتمی پاشـایەتی و پرانسـیپی ئـازادی لــە سستمی دیموکراسیدا پێکەوە کۆدەکاتەوە.

لـە سـەدەی هەژدەهـەمدا "مۆنتسـکیۆ"ی فەیلەسوفی فەرەنسی پێی وابوو، ئەم مۆدێلە نــاوەرۆکی ژیــانی سیاســە لـــە دەســـتوری ئینکلیزیدا. "ئەفلاتۆن" دوای لێکۆلینەوەیەکی مێژوویـی گەیشـتە بیرۆکـەی دەولـەتی تێکـەل، لـــەو لێکۆلینەوەیەیداکەوتـــە تـــاوتوێکردنی هۆکـارە سـەرەکیەکانی گەشـەکردن و دارمـانی هەر دەولەتێك لە دەولەتەکان. لەم سەروبەندەدا دارمـانی دەولــەتی ئەسـپارتەی گیرایــەوە بـۆ سسـتمە تـەواو سـەربازیەکەیی و بڵاوبونـەوەی جەهل و نەزانین تیایدا. هـەروەها پێـی وابـوو دەسەڵاتی پاشایەتی ستەمکارو زالم دەستی لە روخـانی دەولـەتی فارسـدا هـەبوە، هاوکـات ئەوشـی ســەلماند کــە تونــدرەوی سســتمی دیموکراسی لـە ئەسینادا دواجـار بـوە مایـەی سەرنوگم بون و لەناوچونی.

## سەرچاوە:

د. بطرس بطـرس غـالی و د. محمـود خـيري عيسى: مبادئ العلوم السياسية- مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة- الطبعة الاولى، ١٩٦٢.

# چەمكی هیومانیستیی تەندروستیی ئەقڵی*

• ئەریك فرۆم

▪ لە ئینگلیزییەوە: عەبدوڵلا سیوەیلی



ئەریك فرۆم

ئــەمرۆ كەســانیكی زۆر قســە لەســەر (تەندروســتی ئــەقلی *Mental health*) دەكــەن و ئەمــەش زۆرجـار وا دەردەكـەویت وەك ئـەوەی قسە لەسەر هەمان شت بكەن، بەلاَم لە راستیدا وەك چەندین وشەی تـر (تەندروسـتی ئـەقلی) چــەندین شــتی جیــاواز دەگەیــەنیت و لـــەم وانەیەدا من دەمەویت جیاوازی بكەم لە نیوان چــەند چــەمكیكی جیاجیـاداو بــە شــیوەیەكی تایبەت قسە لەسەر ئـەو شتە بكـەم كـە پیـی دەوتریـت چـەمكی هیومانیسـتی (مرۆڤانــەی) تەندروسـتی ئـەقلی. چـەمكی یەكــەم كـە مـن ئەمـەویت لەسـەری بدویم، كـە رەنگـە ئـەوەیان بیت كە بە شیوەیەكی گشتی بەكاردەهینریت، بریتیە لــە چـەمكیكی نیگـەتیڤ. تەندروسـتی ئـەقلی لـیرەدا وەك غیـابی نەخۆشـی ئــەقلی پیناسە كراوە. لۆژیكی ئەم چەمكە ئەوەیە كە كەسـیك تەندروسـتە ئەگـەر بیتـو نـەخۆش نەبیت، لیرەوە دەبیت بە شیوەیەكی سەرەتایی لەگـەڵ نەخۆشـیدا پـەیوەندی بگریـن چونكـە نەبونی نەخشی بەسە بۆ ئەوەی دلنیابین كـە

تەندروستی ئەقڵی بەرقەرارە. ئەم ئاڕاستەیە کە تەندروستی لە مەرجەکانی غیابی نەخۆشییەوە پێناسە دەکات، لەناو خەڵکی ئاساییدا تەواو بەربڵاوە تەنانەت لەناو پزیشك و چارەسەرکەرە دەرونیەکانیشدا. بەهەرحاڵ، ئەم پێناسە نێگەتیڤەی تەندروستی ڕادەیەکی زۆری گونجانکاری دروست دەکات بە لەبەرچاوگرتنی نەخۆشی (جەستەیی *Somatic*) وەك لە نەخۆشی ئەقڵی، چونکە چەندێك جەستە لەبەرچاو بگیرێت ئەوا لانی کەم ئێمە وێنەیەکی تا ڕادەیەك دڵنیاکەرمان هەیە لە بارەی شیتەڵکاریە (تشریح)ەکەی و فەرمانە ئاسایی و سایکۆلۆژیەکانیمان دەبێت. ئێمە شتێکی دیاریکراومان هەیە تا لێوەی دەست پێبکەین، هەر لێرەشەوە هەندێك مانا هەیە پێناسەی نەخۆشی وەك لادانێك لە (ئاسایی *Normal*) دەکات، هەرچەند کە قسە لەسەر تەندروستی ئەقڵی بکەین، ئەوا ئەو سودەمان نابێ. لە هەردوو ڕووی ئەقڵی و سۆزداریەوە کەسی ئاسایی چیە؟ ئایا ئەتوانرێ ئەو کەسە وەك ئەوەی کە لە زۆرینە بچێت پێناسە بکرێت؟ وە ئەگەر زۆرینە تەندروست نەبێت، کەواتە ئەو تاکەی کە وەك زۆرینە وایە ئەتوانێت کەسێکی تەندروست بێت، یان ئایا دەشێت کە کەسێکی دیاریکراو کە لە باقی خەڵك جیاوازە کەسێکی تەندروست بێت لە کاتێکدا سەرتاپای کۆمەڵ شێت بن؟ بەڵام ئایا شتێك هەیە ناوی کۆمەڵگای شێت بێت؟

ئەم لەبەرچاوگرتنانە بەرەو چەمکی دوهەمی تەندروستی ئەقڵییمان دەبات، چەمکێك کە دەتوانرێت پێی بوترێت چەمکی ڕێژەگەرایی سیۆسیۆلۆژی، بە شێوەیەکی گشتی ئەم چەمکە کە ئەمڕۆ لە لایەن زۆربەی سۆسیۆلۆژیست و سایکۆلۆژیستەکانەوە بەکاردەهێنرێت پێی وایە ئەو کەسەی بە شێوەیەکی باش خۆی لەگەڵ کۆمەڵگادا گونجاندوە و بە پێی ئەو ڕێکخستنە کۆمەڵایەتیە ڕەفتار دەکات کە تێیدا دەژی ئەوا کەسێکی تەندروستە لە ڕووی ئەقڵیەوە. لەم پێناسەیەوە کۆمەڵ (دەوڵەت) پێوەرە نەك مرۆڤ. ئەم چەمکە لەو بڕوایەدایە کە جۆرێك لە هارمۆنی (پێشتر دامەزراو) لە نێوان مرۆڤ و دەوڵەت و یاخود مرۆڤ و کۆمەڵگادا هەیە، کە ئەوی بۆ کۆمەڵ یان دەوڵەت باشە بۆ مرۆڤیش باشە. ئایا ئەمە ڕاستە؟

ڕاستی ئەوەیە کە هەر کۆمەڵگایەکی دیاریکراو بنەماو یاسای خۆی هەیە، ئەمە هەریەك شتە چ لە خێڵە سەرەتاییەکاندا کە ژیانیان لەسەر هێرش بردن و تاڵان کردن و کوشتنی خێڵەکانی دراوسێیان بەند بوە، یان لە خێڵە سەرەتاییەکانی جوتیاراندا کە بێوەی بون، یاخود لە کۆمەڵگەی کلاسیکی یۆنانیدا بێت کە تێیدا کۆیلە پشتگیری لە نوخبەیەکی بچوك دەکات، یان لەو کۆمەڵگایانەدا کە بێگارپێکراوەکان پارێزگاری لە ژیانی چینێکی فیوداڵ دەکەن، یاخود تەنانەت لە کۆمەڵگای ڕۆژئاوای مۆدێرندا کە لەسەر بنەمای هەموو

شتێك -شت و ڕەنج- بریتیە لە کەلوپەل و لە بازاڕدا دەبێت بکڕرێت و بفرۆشرێت، بەندە. بنەمای کۆمەڵێك هەروا بێ مەبەست نیە، بەڵکو پشت بەو هێزە بەرهەمهێنەرانە دەبەستێت کە لە ناویدا هەیە، بۆ نمونە ئەو وزەیەی بەکاری دەهێنێت وزەی گیاندارانە، مرۆڤە، یان وزەی مەکینەی هەڵمە، یان وزەی مۆتۆڕی ئۆتۆماتیکیە، یان وزەی ئەتۆمە. بنەمای کۆمەڵ پشت بە چەند فاکتەرێکی تریش دەبەستێت وەك کەش و هەوا، پێگەی جوگرافی، ڕوداوە سیاسیەکان، زیادبونی ژمارەی دانیشتوان.. هتد شتی وەها نیە وەك کۆمەڵگایەك، بەڵام تەنها چەند کۆمەڵگایەکی دیاریکراو هەن بە چەند شێوازێك بنەماڕێژ کراون و بە چەند شێوازێکی دیاریکراو کاردەکەن و پێویستیان بە بارودۆخی تایبەت هەیە بۆ بەردەوامێتی بونیان. بەڵام کۆمەڵگا تەنها پێویستی بە هێزگەلێکی بەرهەمهێن، زانیاری تەکنیکی، دامەزراوە و یاساگەلێك نیەو بەس، بەڵکو پێویستی بە مرۆڤ گەلێك هەیە کە وەها قاڵ بووبن کە بە شێوەیەکی خۆبەخشانە وزەی خۆیان ببەخشنە ئەو ئامانجەی کۆمەڵگا داوایان لێدەکات یان بە دەربڕینێکی تر پێویستی بەو مرۆڤانە هەیە کە ئەوە بکەن کە پێویستە بیکەن.

جوتیار لە کۆمەڵی بەر لە پیشەسازیدا لە کاتی دیاریکراودا کارەکەی نەدەکرد، بگرە ئەو هەر کەیفیشی بە کات نەهاتوە، چونکە لەو کۆمەڵگایەدا کە ئەوی تیادا ژیاوە هیچ جیاوازیەك نەبوە لە نێوان ئەوەی کە نیو سەعات زووترە یان درەنگترە. کرێکار، کارمەند، بەڕێوەبەر لە کۆمەڵی پیشەسازی مۆدێرندا دەبێت گرنگی بە کات بدات بە ڕادەیەك کە لە لایەن براکەی لە کۆمەڵگایەکی ناپیشەسازیدا بە شێت لە قەڵەم بدرێت. ئەگەر شتەکان لە کاتی خۆیاندا ئەنجام نەدرێن ئەوا کۆمەڵی پیشەسازی و سەرتاپای ئابوریەکەی لە کار دەکەون. پەیڕەوەکانی تریش هەر ڕاستن بۆ چۆنیەتیەکانی مرۆڤ: ڕێکوپێکی، دیسپلینەکانی کار.. هتد کاتێك ئەندامی خێڵێکی شەڕکەر حەز بە تاڵان کردن و کوشت و بڕ دەکات، کاتێك کۆیلەیەك ملکەچ و گوێڕایەڵە، یان بێگار پێکراوێك دڵسۆزانە کاردەکات، یاخود کاتێك کارمەندێکی مۆدێرن لە هەڵسوکەوت کردنی لەگەڵ کات و ژوانەکاندا جدیە، ئەوا باش فەرمانەکانیان جێبەجێ کردوە و هەماهەنگی و بەشداری دەکەن لە باش بەگەڕخستن و کارپێکردنی کۆمەڵگاکەیانداو لە بەرامبەر ئەو بەخششانەدا -جا هەرچیەك بێت- کە لە لایەن کۆمەڵگاکانیانەوە پێیان دەبەخشرێت. لە ڕاستیدا هاوجوت بون یان گونجانکاری لەگەڵ مەبەست و داواکاریەکانی کۆمەڵگادا وا دەکات کە مرۆڤ هەست بە ئارامی بکات، و مرۆڤ هەست ناکات گۆشەگیر بێت و بە شێوەیەکی دیاریکراو هەست دەکات تەندروستی باشە. ئەوە لەم مانایەوە کە چەمکی پێوانەیی سۆسیۆلۆژی مرۆڤی تەندروست

وەك مرۆڤـی بـاش و خۆگونجیـن پیناسـە دەكات.

بەڵام ئەو پرسـیارەش سـەرهەڵدەدات كـە ئایـا مرۆڤیـك كـە بـە سـودە بـۆ كۆمـەڵگا، بـە سودیشە بۆ خودی خۆی؟ یان بە دەربرینیكی تـر ئایـا ئـەوەی لـە روانگـەی بـە گەرخسـتنی كۆمەڵگاوە باشـە بـە شـیوەیەكی پیویسـت بـۆ بەگـەر خسـتنی مرۆڤیـش هـەر باشـە؟ بـا نمونەیـەكی زۆر سادەتان بۆ بهینمـەوە. گریمان ئیمـە لـە خیلیكـی شـەرانگیزدا كە لەسەر تاڵانكردن و كوشتار دەژین، پیاویك ئەدۆزینەوە كە لەبەر چەند هۆیەكی نامۆ حەز ناكـات كـاری تـاڵان كـردن و كوشـتن ئـەنجام بـدات و هـەركاتیكیش خیلەكـەی ملـی ریگـەی جـەنگ دەگـرن ئـەم هەڵدەگەریتەوە و نایـەویت بچیت. بەهـەرحاڵ ئەو پیاوە بە ئاگا نیە لەو راستیەی كە ئەو رقی لە شیوەی ژیانی خیلەكەیەتی. ئەو بە ئاگا نیە لەمە چونكە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ریچكەیـەی كـە خیلەكـەی بـیری لیدەكەنـەوەو پـەیرەوی دەكـەن، ئـەوا بـە شـیوەیەكی سـادە شـتیكی نەشیاوە كە پیاویك حەزی لەو كردارە نەبیت كـە لـەلای خیلەكـەی سروشـتی، و لۆژیكـی، گومان هەڵنـەگرە. هـەر بۆیـە ئـەوەی رودەدات ئەوەیە كە هەموو كاتیك كە پیویستە بروات بۆ جەنگ و رەنگە روبەروی رشانەوە یان هەندیك جـار توشـی حالـەتی شـەلەلی قـاچ ببیـت كـە هۆكارەكەی سایكۆجینییە. بە دەربرینیكی تر هـەركاتیك كـە ئـەو دەكەویتـە ململانیـی نیـوان كۆششـی مـرۆڤ و شـیوەی ژیـانی خیلەكـەی نیشانەكانی نەخۆشی دەماری لی دەردەكەویت. بیگومـان پزیشـكی نەخۆشـیە ئەقلیـەكانی خیلەكـەی خـۆی ئـەوە رادەگەیـەنیت كـە ئـەو نەخۆشـە، گومانیشـی لـەوە نیـە كـە ئەوانـەی بـە دلخۆشـیەوە دەچـن بۆ تاڵانگەری و كوشت و بر ئەوانەن كـە تەندروسـتن، بەڵام ئایا ئەمـە وەك پیویسـت وایە؟ لەوانەشە لە روانگەیەكی ترەوە هەمویان نـەخۆش بـن و ئەو بە تەنها تەندروست تریـن كەسیان بیت.

**ئایـا مرۆڤیـك كـە بـە سـودە بـۆ كۆمـەڵگا، بـە سودیشـە بـۆ خودی خۆی؟**

بـا زۆر قسـە لەسـەر مرۆڤـی سـەرەتایی نەكـەین، بـەلكو بـا قسە لەسـەر كۆمـەڵگای پیشەسـازی هاوچـەرخ بكـەین كـە بـە تایبـەت لـە چـەند سـەد سـالی رابردودا لە ئەوروپاو ئەمریكای باكور گەشەی كردوە. ئەم كۆمەڵگایـە لـە سـەدەی نۆزدەدا لـە دەوری چەند دامەزراویكی بچوك كۆبوبووەوە كە پیشبركییان لەگەڵ یەكدا دەكرد. ژیـانی مرۆڤ لـە دەوری كـاركردن، ئـەرك، خـیزان، سـەنتەری گرتبوو، و یـەكیك لـە باشیەكانی بریتـی بـو لـە پاشـەكەوت كـردن- باشیەك كـە زۆر ئاسـایی و سروشتـییە لـە ئابوریـەكدا كـە تیـایدا كەڵەكـە بونـی سـەرمایە هیشـتا یـەكیك بـوە لـە ئەركـە

سەرەكیەكان. كۆمەڵی پیشەسازی سەدەی بیست تەواو جیاوازە، ئەو كۆمەڵە لە دەوری دامەزراوی گەورە، دەستەی گەورە، حكومەتی گەورە، یەكێتی بازرگانی گەورە كۆبووبووە. كۆمەڵی لەو جۆرە مرۆڤی مێگەلی *Mass man*، مرۆڤی ڕێكخراوەیی دروست دەكات، مرۆڤێك كە هەست بە بەهێزی دەكات چونكە ئەو بەشیكە لە كیانێكی گەورە، لە ڕێكخراوێكی گەورە. ئەمە هەرچەندە ڕەنگە ئەو بەشێكی بچوكی كۆتا هاتوو بێت لەو كیانەدا. خەست بونەوەی سەرمایە ڕێی خۆش كرد بۆ دروستبونی دامەزراوی زەبەلاح كە لە لایەن چەند بیرۆكراسیەتێكی شێوە هەرەمیەوە بەڕێوە دەبران. كەڵەكە بوونی گەورەی كرێكاران وەك بەشێك لە ماكینەی ڕێكخراوی بەرهەمهێنان كە پێكەوەو بۆ ئەوەی كاری گشتی بەڕێبكرێت دەبێت بەبێ ڕاوەستان لە كاردا بن. تاكی كرێكارو كارمەند دەبنە برغویەك لەم ماكینەیەداو كارو چالاكیەكانیان لە لایەن سەرتاپای بونیادی ئەو ڕێكخراوەوە دیاری دەكرێت كە كاری تیادەكەن. لە دامەزراوە گەورەكاندا، خاوەندارێتی یاسایی هۆیەكانی بەرهەمهێنان لە بەڕێوەبردن جیابوەتەوە و گرنگیەكی لەدەست داوە. دامەزراوە گەورەكان لە لایەن بەریوەبردنیكی بیرۆكراتیەوە بەریوە دەبرین كە لە روی یاساییەوە خاوەنی دامەزراوەكە نین بەلكو لە روی كۆمەڵایەتیەوە خاوەنیەتی. ئەم بەریوەبەرانە چۆنیەتی یان سیفەتی خاوەنە كۆنەكەی تیا نیە (دەستپیشخەری تاك، بویری، خۆخستنە مەترسیەوە)، بەلكو سیفەتی بیرۆكراتیانەی وەك (نەبونی تاكگەرایی و بێ شەخسیەتی، ناوریایی، و نەبونی خەیاڵ) لەخۆ دەگریت و ئەوان شتەكان و كەسەكان بەریوەبەدەن و مامەلەشیان بۆ كەسەكان بە هەمان شیوەی شتەكانە.

نەك تەنها هەر لە بواری بەرهەمدا تاك بەریوە دەبریت و كۆنترۆل دەكریت، بەلكو لە بواری بەكاربردنیشدا كە بە حساب ئەو بوارەیە كە تاك هەلبژاردن (اختیار)ی ئازادانەی خۆی تیادا بەرجەستە دەكات. جا ئەوە بەكارهینانی خۆراك بێ یان پۆشاك، مەی، جگەرە یان بەرنامە تەلەفزیۆنی و فیلمەكان بیت، و سیستمیكی پیشنیاری بەهیز بە هۆی دوو مەبەستەوە دەخریتە گەر: یەكەم، بۆ زیادكردنی ئارەزوی تاك بۆ شمەكە تازەكان، دوەمیش بۆ ئاراستەكردنی ئەم ئارەزوانە بەرەو ئەو كەنالاَنەی كە زۆر بەسودن بۆ پیشەسازی. قەبارەی خستنە گەری سەرمایە لە بەكارهینانندا دەبیتە باشتركردنی پیشەسازی و كیبركیی نیوان چەند دامەزراوەیەكی زەبەلاحی كەمدا كە بەجینەهیشتنی بەكارهینان بۆ ریكەوت و بەجینەهیشتنی بەكاربەر لە بەردەم هەلبژاردنیكی ئازاددا كە ئایا دەیەویت زیاتر ببریت و یان ئەوەی كە دەیەویت چی بكریت، دەكاتە كاریكی زۆر پیویست. ئارەزوەكانی ئەو كەسە زۆرجار نامینن و تام و چیژەكان دەبیت

کۆنترۆلکراو، بەڕیوەبراو، و پیشبینیکراو بن.
مرۆڤ گۆڕراوە بۆ ئەو (بەکاربەرەی) کە وەك شیرەخۆرەیەکی هەمیشەیی وایە، کە تاکە ئارەزوی بریتیە لە بەکاربردنی شتی زیاتر و (باشتر). سیستمی ئیمە دەبیت مرۆڤگەلیك دروست بکات کە لەگەڵ پیداویستیەکانیدا بگونجیت، ئەبیت مرۆڤگەلیکی نەرم و نیان بن و بە ژمارەی زۆر پیکەوە هەماهەنگی بکەن، مرۆڤگەلیك کە دەیانەویت زیاتر و زیاتر بەکاربەن و ئارەزوەکانیان ستاندار و کراوە و بە ئاسانیش کاری لیدەکریت و دیاری دەکریت. ئەو سیستەمە پیویستی بە مرۆڤگەلیکە کە هەست بکەن سەربەست و سەربەخۆن، نەك پابەندی هیچ دەسەڵات یان بنەمایەکی ویژدانی بن و تییدا هەرکەسیك بیەویت فەرمانی بەسەردا بکریت بۆ ئەنجامدانی ئەوەی کە لیی چاوەڕوان دەکریت بۆ کۆك بون لەگەڵ ماکینەی کۆمەڵایەتیداو بێ وەستان، کەسیك کە بەبێ بەکارهینانی هیز رابەرایەتی بکریت، بەبێ سەرکردەو بێ مەبەست بریار بدات. مرۆڤی مۆدیرن نامۆ کراوە، مرۆڤیکە نامۆیە بە خۆی و مرۆڤەکانی تر. لە بەرهەمهینانی شتەکاندا خودی خۆی بوەتە شت و ئاشکراشە شت هەستی نیە، شتەکان بیروراو ئایدیایان نیە.

کاتیك دەربارەی دادگایی کردنەکەی ئایخمان *Eichmann* دەمخویندەوە، وا هەستم کرد ئەو لە هەندیك روەوە هیمایەکە بۆ مرۆڤی میگەل ئاسای مۆدیرن و دەستەوەستانە ئاکاریەکەی. ئایخمان کەسیکی بیرۆکرات بو، برغویەك بو لە ماکینەیەکی سەرقالدا تەنانەت هیشتاش هەر برغوە نەك مرۆڤ. ئەو چەندین مرۆڤی کوشت هەروەك ئەوەی گاگەڵی کوشتبیت، بەڵام ئەگەر کارەکەی بریتی بوبیت لە بارکردنی چەندین تەن خەلوز، ئەوا لای ئەو هیچ جیاوازیەکی نەبوە لەگەڵ بارکردنی ملیۆنەها مرۆڤدا. ئەوەی جیگەی بایەخ بوە بریتی بوە لە ریکخراوەکە، باشترین کارکردن لەناو ئەو ریکخراوەداو پیگەکەی لە بون بە برغویەکی بەنرخدا.

مرۆڤی مۆدێرن نامۆ کراوە، مرۆڤێکە نامۆیە بە خۆی و مرۆڤەکانی تر.

گرفتی ئاکاریی بەشەریەت لە سەرتاپای میژوی رابردودا بریتی بوە لە گرفتی (باش *Good*) و (خراپ *Evil*). هەندیك لە ئاین و فەلسەفەکان جەختیان لەسەر باش کردوەتەوە، و هەندیکی تریان جەختیان لەسەر خراپە کردوەتەوە، زۆربەشیان ئەو ململانییەیان بینیوە لە نیوان هەردو هیزەکەدا بەڵام تیروانینی لەسەر کیشەی نیسبی چاکەو خراپە لە رۆحی مرۆڤیدا هەرچیەك بیت، خراپە بریتیە لە مرۆڤ هەروەك چاکەش بریتیە لە مرۆڤ، لیرەشەوە ئیمە ئەتوانین بلیین کە تەنانەت خراپترین مرۆڤ لە دەرەوەی بەشەریەت نیە. کۆمەلگای میگەڵ هاوچەرخ گرفتیکی نویی دروست کردوە کە چیدی

گرفتی خراپە نیە بەلکو گرفتی نامرۆڤانەییەکی نوییە، نامرۆڤانەیی رۆبۆت، گرفتی مرۆڤیك کە کراوە بە شت، گرفتی مرۆڤیك کە هەستی تیا نیە چونکە گۆرراوەتە سەر شیوەی شت، گرفتی مرۆڤگەلیك کە مرۆڤی تر بەریوە دەبەن وەك ئەوەی بەم بەریوەبردنەشیان لە لایەن ئەوانی ترەوە کە خودی خۆیان ملکەچی هەمان یاسای ریکخراوەکەن ئەو گرفتەی کە کۆمەلگەی نویٚ هیناویەتە ئاراوە ئەوەیە کە (ئەمەش ئەو گرفتەیە لە کۆمەلگای بەناو سەرمایەداری رۆژئاواو کۆمۆنیستی سۆڤیتی‌دا هەیە) مرۆڤ، کە بە تەواوەتی لەگەڵ کۆمەلگادا خۆی گونجاندوە، لە هەمان کاتدا بریتیە لە مرۆڤیکی نامرۆڤ. ئایا من زیادەرۆیی دەکەم کاتیك ئایخمان بە هیمای نەزعەی سەردەم ناوزەند دەکەم؟ من لەو باوەرەدا نیم، لە تیروانینمان بۆ ئەو راستیەی کە چۆن حکومەتەکانی خاوەن دەولەتی پیشەسازی گەورە یاری بە بۆمبا ئەتۆمیەکان دەکەن و بە هیمنیش گفتوگۆ لەسەر لەناوبردنی نیوەی دەکەن، ئەگەر هەمو جیهانیش نەبیت. کاتیك تۆ گویٚ بیستی چەند گفتوگۆیەك دەبیت کە تیایاندا گوتراوە مردنی کتوپری نیوەی دانیشتوانی ولاتیکی گەورە هیشتا قبولکراوە (بۆ کیٚ قبولکراوە؟ بۆ مردوەکان یان زیندوەکان؟) ئگەر بیستت گوترا کە دوای کارەساتی جەنگیکی ئەتۆمی و ویران بونی نیوەی جیهان ژیان بەردەوام دەبیت و هەروەکو جاران خەلکیش هەر چیژ لە ئۆتۆمبیل و بەفرگر (ثلاجە)ەکانیان وەردەگرن لە راستیشدا دواتر، تۆ لە خۆت دەپرسیت کە ئایا ئەم جیهانە توشی شیت بونیکی گشتی نەبوە، وە یان ئایا ئەوەی ئیمە بە خۆمانیەوە دەبینین بریتی نیە لە هەستکردنیکی تەندروست کە لە هەمان کاتدا نەخۆشیشە.

ئەم حساب بۆ کردنانە ئەمانبەن بەرەو گفتوگۆکردنی پیگەی سیهەمی چەمکی مرۆڤانەیی تەندروستی ئەقلی. چەمکی مرۆڤانە راستی نەگۆری گشتی تایبەتی هەیە، یەکەمیان ئەوەیە مرۆڤ بۆ دەولەت، بۆ مەبەستەکانی کۆمەلگە دروست نەبوە، بەلکو دەولەت و کۆمەلگا دەبیت خزمەتی مرۆڤ بکەن. دوەمیان ئەوەیە کە مرۆڤ دەتوانریت چوارچیوەبەند بکریت نەك هەر لە روی ئەناتۆمی (تشریحی) و فسیۆلۆژیەوە و بەس، بەلکو لە روی فیزیکی و ئەقلیشەوە. سەرەرای جیاوازیەکانی نیوان تاکەکان، سەرەرای جیاوازی نیوان نەتەوە و نەژادەکان، مرۆڤ هەر یەك مرۆڤە. مرۆڤ پەروەردەی چەمکیکی روون نیە، بەلکو راستیەکە. هەرچەندیك ئیمە مرۆڤ بین ئەوا هەر یەکیك لە ئیمە مرۆڤایەتی دەنوینیت. ئیمە هەمو (قدیس)ین و هەموو (تاوانبار)یشین، ئیمە هەمو منالیشین و گەورەشین، ئیمە ئەوەین کە دەزانین هەمو دەمرین. ئیمە هەمو جیاوازین کەچی هەمومان یەك شتیشین، بە هۆی ئەمەوەیە کە ئیمە دەتوانین لە یەکتری تیبگەین و تەنانەت لە غەریبیکیش تیبگەین، ئەوە بۆیەشە ئیمە

ئەتوانین چیژ لە هونەری سەرەتایی و هونەری و گریکی کۆن و سیرڤانتس، شەکسپیر و دویستیۆڤسکی وەربگرین، ئەمە سەرباری ئەو راستیەی کە ئەوان هەریەکەو لە کەلتوریکدا ژیاون کە جیاوازن لە هی ئیستای ئیمە. هونەر چەندین گوزارشت و فۆرمی هەیە، کەچی هیشتا زمانیکی کەونی (گەردونی)یە، چونکە هونەر دەستەواژەی مرۆڤایەتی گەردوونیە. ئەم چەمکەی کە پیی وایە مرۆڤایەتی یەکیکەو هەموو مرۆڤەکانیش هاوبەشن لە هەمان سیفاتە مرۆڤیە سەرەکیەکاندا بریتیە لە چەمکی هیومانیزم، بریتیە لە چەمکی ئینجیل، بریتیە لە چەمکی بوداو لاوتسی، بریتیە لە چەمکی سپینۆزا، لەیبینز، هیگل و مارکس.

**ئیمە هەمو (قدیس)ین و هەموو (تاوانبار)یشین، ئیمە هەمو منالیشین و گەورەشین**

گریمانەی *Premise* سیهەم دەبارەی هیومانیزم ئەوەیە کە چەند بەهایەکی دیاریکراو هەیە بە تەنها بەلای دەولەتەوە گرنگ نیە، بەلکو بۆ هەر شتیك کە رەوایەتی (شرعیە)ی خودگەرایی هەبیت گرنگە. ئەم چەمکەی بەها خودگەراییەکان ئەمرۆ زۆر جەماوەری نیە لە کاتیکدا کە خەلك ئاسودە دەبن گەر پابەند بکرین بەهەر شتیکەوە جگە لە سودو سەرگەرمیەکانی خۆیانەوە. تەنانەت زۆر لە دەرونشیکارەکان قبولکردنی ئەم ئایدیایە رەت دەکەنەوە، کەچی خۆشیان لەم موفارەقە سەیرەدا دەبیننەوە: ئەگەر نەخۆشیك بیتە لایان و بلیت "دکتۆر" من رقم لە هەموو کەسیکە، رقم لە هاوسەرەکەمە، رقم لە منالەکانمە، رقم لە هەموو (غەریب)یکە، ئەوا گومانی تیدا نیە دکتۆرە دەروونناسەکە دەکەویتە ئەو باوەرەوەی کە ئەم پیاوە زۆر نەخۆشە. چارەسەرکەرە دەرونیەکە دەبیت دان بەوەدا بنیت کە لەم رووەوە لیوردبونەوە کلینیکیەکانی لەگەڵ چەند بەهایەکی ئاکاری دیاریکراودا ویکدیت کە لە لایەن هەموو فەیلەسوفە هیومانیستیەکانەوە دانی پیادا نراوە، بەوەی کە کینە لە رووی ئاکاریەوە خراپە، و ئەمەش نیشانەی نەخۆشیە لە روی سایکۆلۆژیەوە بەلام ئەو دکتۆرە دەروونیە قبولکردنی ئەو ئایدیایەی کە پیی وایە کە چەندین مەبەستی پۆزەتیڤانەی دیاریکراو هەیە کە وەك میراتیك لە سترەکتوری مرۆڤدا ماونەتەوە و لە هەردو روانگەی ئاکاری هیومانیستی تەقلیدی و روانگەی تەندروستی ئەقلیەوە پەسەندن. نمونەی ئەو مەبەستانەش وەکو خۆشەویستی، تیگەیشتن، رۆحیەتی دادپەروەرانە.

ئەی کەواتە ئەو پیناسە ئەقلانیە چیە کە بۆ (باش) دەکریت؟ بە شیوەیەکی گشتی، رەنگە بوتریت کە باش ئەوەیە کە باشە بۆ ژیانی مرۆڤ، کە تایبەتمەندیتیەکی تایبەت

دەدات بە وجود و ئەو یاسایانەی وجود بەریوە دەبەن. لە راستیدا ئەم گرفتە جیاواز نیە لە پرسیاری ئەوەی چی باشە بۆ تۆوی دارسیو. ئەگەر تۆوی سیویك توانی بیر بكاتەوە، ئەوە هەست دەكات كە (باش) ئەو هەل و مەرجانەیە كە لە روی خاك، خۆر، هەواوە دەخولقیت كە یارمەتیدەرن بۆ ئەم بۆ ئەوەی گەشە بكات و ببیتە دارسیویكی تەواو و پیگەیشتو، نەك دارسیویكی گەندەل و بیّبەر. ئەگەر ئیمە هەل و مەرجە دیاریكراوەكانی وجودی مرۆڤ بزانین، ئەوا لە راستیدا دەشتوانین بزانین كە مرۆڤی تەواو پیشكەوتو چیە یان وەكو ئەو مرۆڤە وایە كە بوەتە ئەوەی لە ریگەی ئەگەرەوە وەهایە، مرۆڤیك كە بنەما ئاكارییەكەی ئەوەیە كە ئەو دەتوانیت وەها بیت. لەم روانگەیەوە كە روانگەی هیومانیزنمی پیوەریە، تەندروستی ئەقلی ناتوانریت وەك غیابی نیشانەكان پیناسە بكریت، ناتوانریت وەك خۆگونجاندن لەگەڵ كۆمەلگادا پیناسە بكریت. ئەمە بە چاونوقاندن لە ئاستی ئەوەی كە ئایا كۆمەلگاكە خۆی تەندروستە یان نەخۆش. تەندروستی ئەقلی دەتوانریت تەنها لە هەل و مەرجی پراوپرترین ئاشكرابون و تەواوترین بەدەركەوتنی توانست و ئەگەرەكانی مرۆڤدا پیناسە بكریت. با هەول بدەین بزانین كە ئایا ئەتوانین شتیك بلیین كە زۆرتر تایبەتمەند بیت دەربارەی ئەوەی كە باش بوون یان رەفاهیەت لە روانگەی فەلسەفەی مرۆڤگەرایی دەرونشیكاریەوە چیە؟

یەكەم ریبازیك بۆ پیناسەكردنی تەندروستی (*Well- being*) دەتوانریت بەم شیوەیە گوزارشتی لیبكریت: تەندروستی هەمیشە هاوجوت (مطابق) بوە لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا. گەر ئیمە بە دوای ئەم لیدوانە رەسمیەدا بچین، ئەوا ئەم پرسیارە سەرهەلدەدات: لە پەیوەست بوون لەگەڵ بارودۆخەكانی بوونی مرۆڤدا (بوون) چیە؟ وە ئەو بارودۆخانە چین؟

وجودی مرۆڤ پرسیاریك دەوروژینیت. مرۆڤ تورهەلدراوەتە ئەم جیهانەو بەبیّ هیچ هەلبژاردن (اختیار)یكی خۆی، دوبارە دەبریتە دەرەوەی ئەم جیهانە هەر بەبیّ ویست و هەلبژاردنی خۆی. بە پیچەوانەی ئاژەلەوە كە لەناو پیكهاتە غەریزیەكەیدا میكانیزمیكی پتەوی هەلكردن لەگەڵ ژینگەكەیدا چەسپاوە و بە تەواوەتی لەگەڵ سروشتدا دەژی، بەلاّم مرۆڤ ئەم میكانیزمە غەریزیەی تیانیە. مرۆڤ دەبیت ژیانی خۆی بەسەربەریت. مرۆڤ لە سروشتدایەو لە هەمان كاتدا لە سروشت بالاّتریشە، و بە ئاگایە لە خودی خۆی و ئەم بە ئاگاییەش دەربارەی خۆی وەك كیانیكی جیا وایلیدەكات هەست بە تەنهایی بكات، هەست بكات كە ون بوەو بیدەسەلاّتە. لە راستیدا لەدایكبوون گرفتیك دەخولقینیت. لە كاتی لەدایكبوندا، ژیان پرسیاریك لە مرۆڤ دەكات و دەبیت وەلاّمی بداتەوە. دەبیت مرۆڤ لە هەمو چركەساتیكدا وەلاّمی بداتەوە، نەك هەر میشكی، نەك هەر جەستەی، بەلكو ئەو وەكو

ئەو کەسەی کە بیردەکاتەوە، خەون دەبینیت، کە دەنویت، و دەخوات، کە دەگری و پیدەکەنێ -مرۆڤ بە گشتی- دەبیت وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە، ئەبێ ئەو پرسیارە چی بیت کە ژیان بیخولقینیت؟

پرسیارەکە ئەمەیە: ئیمە چۆن دەتوانین زال بین بەسەر مەینەتییەکاندا بەسەر دیلیتی و زەلیلیدا کە ئەزمونی (جیابون *Separateness*) دروستی دەکات؟ ئیمە چۆن دەتوانین بەناو خودی خۆماندا یەکیتییەك لەگەڵ مرۆڤەکانی ترو لەگەڵ سروشتدا بەدی بکەین؟ پیویستە مرۆڤ بە چەند شیوازیك ئەو پرسیارانە وەڵام بداتەوە. تەنانەت لە ناتەواوی ئەقلیشدا (*Insanity*) وەڵامیك دەدریتەوە کە بریتیە لە توورهەلدانی واقیع بە تەواوەتی و ژیان گوزەراندن لەناو تویکلی خۆماندا، و بەمجۆرە بەسەر ترسی (جیا-بون)دا زال دەبین.

پرسیارەکە هەمیشە هەر یەکیکە. بەهەرحال چەند وەڵامیك هەیە، یان بە شیوەیەکی بنەرەتی دو وەڵام هەیە. یەکەم بۆ زالبون بەسەر دابران و جودایی و بۆ دۆزینەوەی یەکگرتنەوە بە هۆی گەرانەوە بۆ حالەتی یەکبون کە بەر لە سەرهەلدانی هۆشیاری بوونی هەبووە. ئەمە واتە بەرلەوەی مرۆڤ لەدایك ببیت. وەڵامەکەی تر کە ئەبیت بە تەواوەتی لەبەرچاو بگیریت ئەوەیە کە هۆشیاریی کەسیك، ئەقلی کەسیك، توانستی کەسیك بۆ خۆشەویستی گەشەی پیبدریت و بخریتە سەر ریکخستنیکی نوێ ئەویش لە یەکبونیکی نویدا لەگەڵ جیهاندا.

**تەندروستی یان سەلامەتی واتە لەکارخستنی خودگەرایی *Egoism*، و وازهینان لە چاوچنۆکی و لە دواکەوتنی بەرچاو تەنگیەکانی ئیگۆ، واتە لە کردەی (بوون)دا بیت نەك بەکارهینانیکی چاوچنۆکانەو رژدی کردنانەت هەبیت.**

ئیستا با بگەریینەوە بۆ پرسیاری تەندروستی (سەلامەتی)، ئیمە چۆن ئەو پرسیارە لەبەر رۆشنایی ئەوەی تۆزیك لەمەوپیش وترا، پیناسە یان چیوەبەند دەکەین؟

تەندروست بون ئەو حالەتەیە کە کەسیك گەیشتبیتە گەشەکردنی تەواوی ئەقل: ئەقل نەك تەنها بە مانای دادوەری روناکبیری بەلکو لە حالەتی بەدەستهیانی حەقیقەتیشدا ئەویش بە ((وازهینان لە شتەکان با وەك خۆیان بن (ئەمە بەکارهینانی دەستەواژەکەی هایدگەرە). خۆشگوزەرانی یان سەلامەتی تەنها لە پلەیەکدا شیاوە کە کەسیك زال بوە بەسەر نەرجسیەتی خۆیدا)) لە پلەیەکدا کە کەسیك کراوە، و وەڵامدەرەوە، و هەستیار، و بەئاگا

بیت. سەلامەتی مانای ئەوە دەگەیەنیت کە بە تەواوەتی پەیوەست بیت بە مرۆڤەوە و بە شیوەیەکی کارتیکەرانە بە سروشتیشەوە، بۆ ئەوەی زال بیت بەسەر جودایی و نامۆبونداو بگاتە ئەو ئەزمونەی کە یەك بیت لەگەڵ هەمو ئەو شتانەی کە هەن هیشتا بۆ ئەوەی لە هەمان کاتدا ئەزمونی خودی خۆم بکەم وەك کیانیکی جیاو وەك تاکیك. تەندروستی واتە بە تەواوەتی هەلکردن لەگەڵ ئەوەی کە تۆ چیت، ئەگەر تەندروستی هەموو ئەم شتانە بیت، ئەوا ئەو مانایە دەگەیەنیت کە دەبیت ئەفرینەر بم. واتە پەرچەکردار و وەڵامم هەبیت بۆ خودی خۆم و ئەوانی دی، بۆ هەمو شتیك کە بونی هەیە. پەرچەکردارم هەبیت و وەڵامم هەبیت وەك مرۆڤیکی واقیعی و هەمەکی. لە رەوتی کردەی ئەم وەڵامە راستەدا بواری ئەفراندن دیتە گۆرێ، لە بواری بینینی جیهان وەك ئەوەی کە هەیەو مامەلە کردن لەگەلیدا وەك جیهانی خۆم. دواجار، تەندروستی یان سەلامەتی واتە لەکارخستنی خودگەرایی *Egoism*، و وازهینان لە چاوچنۆکی و لە دواکەوتنی بەرچاو تەنگیەکانی ئیگۆ، واتە لە کردەی (بوون)دا بیت نەك بەکارهینانیکی چاوچنۆکانەو رژدی کردنانەت هەبیت.

رەنگە هیشتا شیواز و ریگای ترو ئاسانتریش هەبن بۆ دەربرینی مانای بەختەوەری و تەندروستی ئەقلی. رەنگە تۆ زۆر بە سادەو ساکارانە بلییت کەسی تەندروست بەردەوام لە گۆراندایە، کەچی هیشتا بە هەمان شیوە دەمینیتەوە. ئەو چەند قەناعەتیکی هەیە کە لە خودی خۆیەوە سەرچاوەیان گرتوە، نەك چەند بیروبۆچونیکی دروستکراو وەك ئەوەی کە ئەو دیسکیك یان ئامیریکی ریکۆردەر بیت. ئەو دەتوانیت سنوری ئەو خەیاڵانە ببەزینیت کە زۆرینەی خەلك وەك (راستی) باوەریان پییەتی. ئەو جیاوازی نیوان وشەکان و راستی دەزانیت و تیکەلیان ناکات. تۆ رەنگە ئەم مەسەلەیە بخەیتە سەر شیوەی فۆرمیکی سادەتر و بلییت کەسی تەندروست هەوەسیکی بە سۆزی *Passionate Interest* هەیە لە جیهاندا. هەمو کەسیکیش وەك پیویست لە هەمان رووی دنیادا نیە هیشتا ئەو جیاوازە لە حەزیك کە هەلیدەمژێ، کە دەیوروژینیت، وە بۆ بەدیهینانیش رەزامەندیتی دەداتێ. تەنانەت من لەوە زیاتر دەرۆم و دەچمە سەر وتنی شتیك کە تەواو نا مەحکەم و ناباوە: ئەگەر من کەسیك شك بەرم کە ئەم حەزە سۆزاویەی هەبیت، با بلیین لە زانستدا، لە هونەردا، لە پزیشکیدا، یان لەهەر شتیکی تردا، بەڵام بە داخەوە بە دەست کلۆستە فۆبیا (ترس لە شوینە داخراوەکان) وە دەنالینیت، و پیاویکی تر هیچ نەخۆشەیکی نیە بەڵام حەزی سۆزاوی لە هیچ شتیکدا نیە. من خودی ئەو پیاوەی کە کلۆستە فۆبیاکەی لەگەلدایە تەندروست تر دەبینم لەو پیاوەی کە حەزی نیە. ئیمە پیشتر دەربارەی پەیوەندی نیوان تەندروستی ئەقلی تاکە کەس و ژیانی کۆمەلگا، قسەمان کردو

شتیکی تەواو ئاشکرایە کە گەشەکردنی تەندروستی یان ئاسودەیی وەك هەولمداوە پیناسەی بکەم، لیرەدا پشت بە راستیە کۆمەلایەتیە دیاریکراوەکان دەبەستیت.

کۆمەلگایەك کە بە دەوری خۆیدا دەخولیتەوە یان بەسەر پیشکەوتنی خۆیدا داخراوە، کۆمەلگایەك کە بە دەست دژواریە چارەسەر نەکراوەکانی نیوان دەولەمەند و هەژارەوە دەنالینیت، کۆمەلگایەك کە سەرچاوەکانی خۆی گەشە پینادات، لە هەمان کاتدا ئەبیتە کۆمەلگایەك کە تیایدا زۆربەی خەلك هیوایان نابێ، بێهیوایش یەکیکە لە تەگەرە سەرەکیەکانی بەردەم تەندروستی ئەقلی. لەبەرئەوە یەکەم بارودۆخ بۆ گەشەپیدانی تەندروستی ئەقلی لەهەر کۆمەلگایەکدا ئەو راستیەیە کە هیوا هەیە، بەلام ئەو جۆرە خەیالیەی هیوا نا کە بە هۆی قسە سروتیەکانەوە سەری هەلداوە، بەلکو ئەو هیوایەی کە تیایدا ئەو راستیەی کە کۆمەلگا لە گەشەکردندایە سەرچاوەی لیوە گرتبیت، و ئەوەی کە ئەو کۆمەلگایە چۆنیتیەکەی *quality* هەردەم لە زیادبوندای بە برشت بەدەست دەهینیت و سەرچاوە مادیەکانی دەخاتەروو بۆ ژیانیکی شەرەفمەندانەو مرۆڤانەی بە بایەخ بۆ هەموو هاولاتیەکانی.

حەز ئەکەم ئەوەش زیاد بکەم بۆ سەر قسەکانم کە کاتیك باس لە تەندروستی ئەقلی دەکریت، خویندکاران لە بارودۆخیکی تایبەتمەندی زۆر گرنگدان ئەوان چالاکیەکیان هەلبژاردوە کە زۆر جیاوازە لە هەلگرتنی بەرد، جیاوازە لە کردنی کاری بیزارکەر. ئەوان چالاکیەکیان هەلبژاردوە کە لە خودی خۆیدا خۆش و وروژینەرە، کە زیاتر لە هەمو چالاکیەکانی تر خۆی لەگەل گەشەکردنی بەرژەوەندی سۆزاوی لەگەل جیهاندا دەگونجینیت. رەنگە کەسیك بلیت خویندکار گەر بە راستی خویندکارە، خاوەنی پیویستیەکی پیشینەیە *Pre- requsite* بۆ ئەوەی کەسیکی تەندروست بیت کە هیشتا ئیمە بە شیوەیەکی ئەزمونی دەزانین کە زۆر لە خویندکاران خاوەنی تەندروستی ئەقلی نین. دەشتوانریت ئەم دۆخە بە دوو ریگە بگۆرریت و هەردو ریگەکەش دەبیت بگیریتە بەر: یەکەمیان بەوەی کە خویندن بکریتە کاریکی بە تام و چیژ و خۆشی بەخش بە هەولدان بۆ کەمکردنەوەی ژمارەی ئەو خویندکارانەی کە تەنها لەبەرئەوەی پییانوایە خویندن ئاسانترین هۆکارە بۆ پارەپەیداکردن. دوەم ریگا بریتیە لە پشکنینی یان تاقیکردنەوەی فاکتەرەکانی تاك کەوا دەکەن بۆ خویندکار کاریکی قورس بیت بە راستی خۆشی و چیژ لە خویندن وەربگریت. سەرباری ئەو راستیەی کە ئەو مامۆستای باش و بواری باشی خویندنی هەیە. لیرەدا سایکۆلۆژیای کلینیکی بواری فراوانی خۆی هەیە، بەلام با هەرگیز ئەوەمان بیر نەچیت کە لە روانگەیترادیسیۆنی هیومانستیەوە مرۆڤی تەندروست ئەو مرۆڤەیە کە بەرهەمهینەرە، ئەو مرۆڤەیە کە پەیوەستە

بە جیهانەوە، و بایەخ بە جیهان دەدات، وە تەندروستی میشكی هەرگیز بریتی نیە لە غیابی نەخۆشی؛ تەندروستی میشكی تەنها ئەو توانستە نیە بۆ باش كاركردن، بەلكو دۆخیكی میشكە كە تیایدا كەسەكە لە لایەن جیهانی دەوروبەریەوە دەوروژینریت و لیرەشەوە ئەو ئەتوانیت ببیتە وروژینەریك بۆ ئەوانی دی.

## تیبینی

–ئەم دەقە لە زانكۆی (پریماس جۆرناداس *Primas Jornadas*) لە ٦ نۆڤەمبەری ١٩٦١ لە *UNAM* لە شاری میكسیكۆ سیتی پیشكەشكراوە. تا ئیستا بلاونەكراوەتەوە.

*ئەم دەقە كە لە بنەرەتدا موحازەرەیەكی فەیلەسوفی مەزن ئەریك فرۆمە، تا ئیستا بلاو نەبۆتەوە. و ئەم وەرگیرانە كوردیەی بەردەستتان بە پەیوەندی‌یەكی تایبەت و لە ریگەی كۆمەلەی ئەریك فرۆمی نیودەولەتی‌یەوە بۆ وەرگیر نیردراوەو مۆلەتی بلاوكردنەوەیشی دراوە بە وەرگیر بەو مەرجەی كە هەموو مافەكانی دەگەرینەوە بۆ(كۆمەلەی ئەریك فرۆمی نیودەولەتی).

***(The Inernational Erich Fromm Society*)**

# زانستە نوێکەی ئیبن خەلدون

• د. ئەلبێرت عیسا


ئیبن خەلدون

"لە پیشەکیەکەیدا بۆ میژوی گەردوونی، ئیبن خەلدون فەلسەفەیەکی بۆ میژوو دارشت و چوارچیوەی بۆ دانا کە بیگومان گەورەترین کارە تا ئیستا کراوە لە لایەن رۆحی مرۆڤایەتی لە هەموو سەردەم و لە هەموو شوینیکدا".

هەروەك جان بەتیستە ڤیکۆ (١٦٦٨-١٧٤٤)، ئیبن خەلدون یش کە نووسەریکی مەغریبی سەدەی پانزەهەمە، لە کارە مەزنەکەیدا، المقدمە، هیل بە ژیر ئەوەدا دینێ کە زانستیکی نویی داهیناوە[1]. ئەم هیل بەژیرهینانە ئاراستەیەك وەردەگرێ کە بە شیوەیەکی سەرەکی بەردی بناغەی پیك هاتوە لەم خالانەی خوارەوە:

یەکەم، ئەم زانستە، زانستیکی سەربەخۆیە کە بابەتەکەی پیکهاتوە لە شارستانیەت و ریکخراوی کۆمەلایەتی ئادەمیزاد[2].

دوەم، ئەم زانستە، ئامانجەکەی روونکردنەوەی میژوە. بۆ ئەم مەبەستە، پیویستە هەول بدرێ ئەو "هۆیانە" ئاشکرا بکرێ کە لە پشت روداوە میژووییەکانەوە خۆیان شاردۆتەوە.

نووسەری بەربەر دەلێ، بۆ تیگەیشتنی کاراکتەری راستەقینەی رووداوە میژووییەکان، پیویستە دیاردەکان شی بکرینەوە و بخرینە ژیر تاقیکردنەوەیەکی تەواو و هەلسەنگینرێ بە پشکنینی ئەو هۆیانەی کە بە بەرهەمەیان هیناون و چۆنیەتی دەرکەوتنیان[3]. کاتیك کە

وەسفی ڕووداوەکان دەکات، ئیبن خەلدون پێش هەموو شتێك ڕەخنە لە مێژوونووسەکانی پێش خۆی دەگرێت و هێڵ بەژێر ئەوەدا دەهێنێ کە مێژوونووسان کاتێك وەسفی ڕووداوەکانی سەدەکانی پێشوو دەکەن، تەنها بە شێوەیەکی ڕووکەش دەیگێڕنەوە و باسی لێدەکەن بەبێ ئەوەی ئیعتبار دابنێن بۆ ئەو بارودۆخانەی کە پەیوەندی پێیانەوە هەیە[٤]. بەم شێوەیە واقیعی مێژوویی تێکشکێنراوە و بواری توێژینەوە تەنها ئیکتیفای کردوە بە گێڕانەوەیەکی ئەفسانەیی ژیانی کۆمەڵایەتی و کردەوەی پادشا و میرەکان لە بواری سەربازی و سیاسیدا.

سێهەم، ئەم زانستە نوێیە تیشك دەخاتە سەر ئەوەی کە بارودۆخ و تایبەتمەندیەکانی کۆمەڵی مرۆیی لەسەر هەمان ئاست نامێننەوە، بەڵکو گۆڕانیان بەسەردێت و لە قۆناغێکەوە دەچنە قۆناغێکی تر[٥]. لەبەر ئەم هۆیانە، هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر گۆڕانی کۆمەڵان و کاراکتەری ئەو سەردەمانەی کە بەسەر دەچن پشت گوێ بخرێن. تێبینی دەکرێ کە هەموو پرۆسەیەکی گۆڕان وەك پرۆسەی پێشوو نیە چونکە دۆخە کۆمەڵایەتیەکان گۆڕانیان بەسەردێ و خووڕەوشت و ڕەفتار و هەڵسوکەوتی میللەتانی جیهان لەسەر یەك ئاست نامێننەوە، بەڵکو دەگۆڕێن و فۆرمێکی تر وەردەگرن لەگەڵ گۆڕانی شوێن و کات[٦].

لەبەر ئەم هۆیانە ئەرکی "زانستی نوێ" ئەوەیە کە تایبەتمەندیە کۆمەڵایەتیە ناوەکیەکان و شێوەی گۆڕانیان بە نەزەری ئیعتبار وەربگرێ. خووڕەوشت و دەزگاکان ناگۆڕێن چونکە پێویستە خۆیان ڕابهێنن لەگەڵ ئەو دەسەڵاتەی کە لەسەر حوکمە، بەڵکو گۆڕانیان بەسەردێت وەك ئەنجامێکی لە یەکدان لە نێوان ئەو چینەی کە لەسەر حوکمە و ئەوەی کە پێش ئەو لەسەر حوکم بوە. خەڵکی کە دەوڵەتێك دەڕوخێنن و دەسەڵات دەگرنە دەست، هەڵسوکەوت و بەهای نەوەکانی پێشوو شان بە شانی ئەوانەی خۆیان دەهێڵنەوە. لەم بارودۆخە، ململانێیەك پەیدا دەبێت لە نێوان دەزگا نوێکان و دەزگا و بەهاکانی پێشو. لە ئەنجامی ململانێی دەسەڵاتی نوێ و کۆن و بەهای تازە و پێشو، تازەبوونەوە دروست دەبێ؛ بارودۆخێك دروست دەبێ کە بە شێوەیەکی تەواو جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوەی پێشوودا. بەم شێوەیە، تێبینی دەکرێ کە نەبەتیەکان و فارسەکان و

> ئەرکی "زانستی نوێ" ئەوەیە کە تایبەتمەندیە کۆمەڵایەتیە ناوەکیەکان و شێوەی گۆڕانیان بە نەزەری ئیعتبار وەربگرێ.

ئاسوریەکان و ئیسرائیلیەکان دامودەزگای تایبەتی خۆیان و بیروباوەڕی خۆیانیان هەبوە. پاش ئەوان بیزەنتینی و عەرەبەکان ئەو میللەتانەی کە هاتن ئەوانەیش بە گوێرەی پرۆسەیەکی مێژوویی وردە وردە دامودەزگایان گۆڕا. پاش ئەمان ئیسلام هات کە بارودۆخی نەوەکانی پێشووی گۆڕی و میللەتان فیزیۆنۆمیەکی تازەیان وەرگرت. ئەویش، بە گەیشتنی ناعەرەبەکان و دیانە ئەوروپیەکان وردە وردە کاراکتەرێکی تری وەرگرت.

کاتێ ئەم زانستە نوێیە لە دیاردە کۆمەڵایەتیەکان دەکۆڵێتەوە و ئەو هۆیانە شی دەکاتەوە کە بە بەرهەمیان هێناون و ئیعتبار دادەنێ بۆ پرۆسەی گۆڕان، پێویستە کاراکتەری ڕاستەقینەی دیاردەکان تێبگات و ڕزگاری بێت لە چوارچێوەی "مێژووی ڕووداوی" و نۆرمەتیڤیزمی فەلسەفی و پرۆڤیدێنسیالیزمی (واتا حوکم یان دەسەڵاتی خودا بەسەر مەخلوقاتەکانیدا) میتافیزیکی. دەتوانرێ بوترێ کە لەسەر ئەم ڕێبازە. زانستی نوێی ئیبن خەلدون لەدایکبوە وەك وەڵامدانەوەیەکی میتۆدی وەسفیی ئەو مێژوونووسانەی کە پێش ئەو ژیاون: ئەلمەسعودی[٧] و ئەلتەبەری[٨] و زۆری‌تر، باسی مێژووی گشتی مرۆڤایەتیان کردوە، بەلام نەیانتوانیوە خەسڵەتی تایبەتی دیاردە کۆمەڵایەتیەکان جیابکەنەوە. لە ڕوانگەی ئیبن خەلدونەوە، بۆ تێگەیشتنی سروشتی ڕاستەقینەی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی، پێویستە کە ئەو دیاردەیە شی بکرێتەوە لەبەر ڕۆشنایی ناسینی سەرجەم لایەنەکانی دۆخی حازر و ڕابردوو و هەروەها پێویستیشە کە پسپۆڕی زانستی نوێ توانای جیاکردنەوەی لەیەکچوون و جیاوازی دیاردەکانی هەبێت لەسەر بناغەی میتۆدێکی بەراوردیی (*Comparative method*)[٩].

ناسینی پەیوەندیی نێوان مێژوو و تایبەتمەندیەکانی ئاوەدانی (عمران)[١٠] زۆر گرنگە بۆ تێگەیشتنێکی تەواوی ئەوەی کە تا ئێستا باسکراوە. ئیبن خەلدون ڕوونی دەکاتەوە کە ئەگەر مێژوونووس، سروشتی ڕوداوەکان و بارودۆخی ئاوەدانی و عومران چاك بناسێ، زۆر بە باشی دەتوانێ ڕاستی لە چەوت جیابکاتەوە[١١]. بۆ نمونە، کاتێك کە ئەلمەسعودی باسی لەشکری جولەکەکان دەکات و دەڵێ موسا زیاتر لە شەش سەد هەزار سەربازی ڕیزکردبوو لە بیابان، پرسیار ناکات ئایا ڕووبەری میسرو شام ئەم ژمارەیەی هەڵدەگرت؟ چۆن دەبێت ڕووبەرێکی جوغرافی ئەوەندە سنوردار بتوانێ ئەو هەموو سەربازە لەخۆ بگرێت و جوڵانەوەی مسۆگەر بکات؟ ئایا دارایی میسر و شام دەیتوانی لەشکرێکی ئەوەندە گەورە ئیدارە بکات؟ ئایا ژمارەی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە ڕێی دەدا کە ئەوەندە سەرباز بەشداری بکات؟ چۆن هەردوو لەشکر دەیان توانی شەڕ بکەن کاتێك لایەك لایەکی تری نەدەبینی؟ پاش ئەوە، دۆخی ئەمڕۆ

دەتوانێ ئەوە بە درۆ بخاتەوە چونکە ئیستا و رابردوو وەك دوو دلۆپی ئاو وان کە یەکسانن[١٢].

لەبەرئەوە زانستی میژوو پیك نەهاتوە لە گیرانەوەی دوابەدواکەوتنیکی میکانیکی رووداوەکان یان نابێ کەلەکەبوونی زانیاری پەیوەست بە رووداویك بکات بە شیوەیەکی میکانیکی. میژوو، وەك ئیبن خەلدون دەڵێ، ئاگادارمان دەکاتەوە لە ریکخراوی کۆمەڵایەتی مرۆڤ و رادەی شارستانیەت و جۆری دەسەڵاتی مرۆڤ بەسەر مرۆڤەوە و کارو پیشە و زانست و هونەر.. هتد. میژوو پیك هاتوە لە زانیاری سەبارەت بەو دیاردانەی کە لەگەڵ دۆخی کۆمەڵایەتی مرۆڤ دەرۆن لە سەردەمی جیاواز، واتا لە دۆخی سەرەتاییەوە "کاتیك کە ژیانی ئادەمیزاد پشت دەبەستێ بەوەی کە زەوی دەیبەخشێ، راو و بەخیوکردنی مەرومالات و.. هتد، هەتا دەگاتە "دۆخی شارستانیەت" کە لە ناویدا مرۆڤ دەست دەکات بە ناسینی دەزگای دەولەت و ئیدارەی دابەشبوونی کار[١٣].

بەم شیوەیە تیدەگەین کە زانستی نویی ئیبن خەلدون دەیەوێ وەڵامی ئەو شیوازە بداتەوە کە لە لایەن فەیلەسوفەکانەوە داریژراوە؛ وەڵامیکە پیش هەموو شتیك بۆ فەیلەسوفەکانی یۆنانی کۆن بە تایبەتی ئەریستۆتالیس کە زۆر جار لە کارە مەزنەکەیدا "المقدمە" باسی دەکات.

زانستە نویکەی ئیبن خەلدون کاتیك دەیەوێ خۆی رزگاربکات لە تیروانینی میتافیزیکی ئیدییالیست، دەخوازێ واقیع بناسێ لەسەر بناغەیەکی ریالیست و پراگماتیست نەك وەك کیانیکی چەمکیی یان زمانیی پوخت بەلکو وەك کیانیکی سەربەخۆ لەو یاسایانەی کە بەرهەمی دینن. رەخنەی ئیبن خەلدون بەرامبەر فەیلەسوفە یۆنانیەکان بریتیە لەوە کە ئەوان تیروانینیکی یۆتۆپیان هەیە؛ تیروانینیك کە دەیەوێ خۆی رابهینێ بەرامبەر پرنسیپی ئیستیتیال و ئیتیکی (ئەخلاقی) و سروشتی نۆرمەتیڤی شتە کۆمەڵایەتیەکان. بەلای ئیبن خەلدونەوە، فەیلەسوفە یۆنانیەکان کاتیك کە باس لە کاروباری دەولەت دەکەن، تەماشای سیاسەت دەکەن بە چاویلکەیەکی ئیدیالیزمی یۆتۆپی. واتا دەیانەوێ کە ریکخراوی سیاسی لەگەڵ پشتگیری هاولاتیان جیانەبیتەوە. کاتیك کە باسی "شاری تەواو" دەکەن دوورن لە واقیعەوە و ئەم کیانە سیاسیە سۆسیۆلۆژیە دادەنین تەنها وەك گریمانەیەك یان وەك بۆچوونیکی ساکار[١٤]. لە روانگەی ئیبن خەلدونەوە، ئەم شیوە تیروانینە هەلەیەو لە جیاتی ئەوە، پیویستە تەماشای واقیعی دەولەتان بکرێ نەك وەك "پیویستیەك" بەلکو وەك "بوونیك" لەناو ژیانی میژوییدا، واتا نەك وەکو شتیك کە بسەپینرێ، بەلکو وەکو شتیك کە تەماشا بکریت کە هەرچۆنیك بیت بوونی هەیە بە شیوەیەکی سەربەخۆ لە ویستی

خۆیی تاكەكەسان. ئەم شیوە تیروانینەی ئیبن خەلدون، كە چەند سەدەیەك پاش خۆی، كۆمەلناسیكی وەك ئۆگوست كۆت بە شیوەیەكی سیستیماتیك گوزارشتی لیدەكات زۆر گرنگە چونكە دەروازەی پرینسیپی نۆرمەتیڤ دەشكینیّ و تەماشای دیاردەكان دەكات وەك بوونیكی پۆزیتیڤ (وضعی).

هەروەها دەتوانین تیبینی بكەین كە زانستە نویكەی ئیبن خەلدون وەلامیكە دژی تیۆریزە كردنی ئیدیپالیستی فەیلەسوفە موسلمانەكانی وەك ئەلفارابی و ئیبن سینا و كیندی. فەیلەسوفە موسلمانەكان كە دەیانەویّ نمونەی فەیلەسوفە یۆنانیەكان دووبارە بكەنەوە خواستیان ئەگەری بەدیهینانی كۆمەلیكی تەواوە. بیّ گومان ئەلفارابی و فەیلەسوفە موسلمانەكانی تر هەلسان بە "سروشتاندنی" بیری یۆنانی لەناو جیهانی ئیسلامیدا. ئەوان خۆیان خەریك كرد بە (راڤەكردنی (*reinterpretation*) جیهانی ئیسلامی لە روانگەیەكی فەلسەفیەوە. هەروەها دەیانویست ریفۆرمی (اصلاح) سەرجەم ریكخراوی سیاسی جیهانی ئیسلامی بكەن

**دەتوانین تیبینی بكەین كە زانستە نویكەی ئیبن خەلدون وەلامیكە دژی تیۆریزە كردنی ئیدیپالیستی فەیلەسوفە موسلمانەكانی وەك ئەلفارابی و ئیبن سینا و كیندی.**

لەسەر بنچینەی تیروانینیكی ئیفلاتونی؛ بەم شیوەیە /بایەخی/ لە پیشتریان دەدا بە بیرۆكەی گەورەیی فەلسەفە بە پیشكەشكردنی وەك چارەسەریك بۆ كیشەكانی كۆمەل. فەلسەفەیان دادەنا وەك بكەریك كە توانای (*Validity*) گەردوونیی هەبیت و كە گوزارشت بكات لە راستیی وەك بیریكی ئەبستراكت (مجرد) كە جەوهەرەكەی لە هەموو شوینیك و لە لای هەموو میللەتیك و هەموو ئاینیك وەك یەك بیت چونكە ئاین وەك جەوهەر گوزارشت دەكات لە راستی.

زۆر گرنگ بوو بەلای فارابییەوە كە مەملەكیەتی لەو جۆرە دەسەلاتی بیر ببەخشیّ بە فەلسەفە و ریكخراوی كۆمەلیكی تەواو بداتە دەستی پادشایەكی (مەلیكیكی) فەیلەسوف. بۆ فارابی، فەیلەسوف پیاویكی تەواو بوو كە دەبوایە، بە مەزنی خۆی، ببیّ بە پادشا (مەلیك) بۆ ئەوەی حوكم بكات بۆ بەدیهینانی كۆمەلیكی تەواو. ئەوەی راستی بیت، فارابی لەم بارەیەوە، زیاتر لە بیری یۆنانی كۆن دەرۆی، چونكە جگە لەوەی كە داوای شار- دەولەتی تەواوی دەكرد، داوای بەدیهینانی ئومەتیكی تەواو بە

گشـتی و دەولـەتیکی جیـهانی تەواویشـی دەکـرد[١٥]. فەلسـەفە، بـۆ فـارابی، ریگایـەکی راسـتەوخۆی پیـك دەهـانی بـۆ ئیدارەکردنـی ریفۆرمی (اصلاح) زوو بە زوویی خەلافەت[١٦]. بەلام ئیـبن خـەلدون ریفۆرمیسـتیکی (مصلـح) سیاسـی نـەبوو، بـەلکو روناکبـیریك بـوو کـە بـارودۆخی بنـەرەتیی ژیـانی شـی دەکـردەوە؛ نـەك تەنـها بـارودۆخی ژیـانی عـەرەبی- موسـلمان، بـەلکو ئـەوەی جیـهانی رۆژهـەلاتی ناوەراستیش. لـەم ریگەیـەوە هـەولی دەدا کـە وەلامیـك بدۆزیتـەوە بـۆ کیشـەکانی رووداوە میژووییەکان.


فارابی

بـە راسـتی نابـیٚ خـالیکی زۆر گرنـگ فـەرامۆش بکـریٚ لـە زانسـتە نویکـەی ئیـبن خـەلدون. ئـەم خالـە پیکـهاتوە لـەوەی کـە زانستەکە دەیـەویٚ رەخنـەی پرۆڤیدینسـیالیزم بکا کـە دیـاردە کۆمەلایەتیـەکان شـی دەکاتـەوە لەسـەر بنچینـەی دەسـت تیوەردانـی یـەزدانی سەربەخۆ لە ویستی کۆمەل. ئیبن خـەلدون لـە سـەدەی چواردەهـەم دەیـەویٚ کیشـەیەك چارەسـەر بکات، کە بە راستی لـە سـەدەکانی پـاش رینیسانسـەوە لـە ئـەوروپا رۆشـنبیرانی وەکو لـۆك و مۆنتیسـکیۆ و رۆسـۆ ویسـتویانە بـەرەنگاری ببنـەوە، بـەلای ئیـبن خەلدونـەوە مـرۆڤ پیـش هـەموو شـتیك "بوونـەوەریکی ژیرە" و جیاوازی هەیە لەگـەل ئـاژەل چونکـە بیردەکاتەوە و ئەم بیرکردنەوەیە ریی پیدەدات کـە زانسـت و هونـەر بـە بەرهـەم بینـیٚ[١٧]. هـەروەها جیاوازی لەگـەل ئاژەل هەیـە چونکـە کاردەکات و ئامرازی ژیان پەیدا دەکات.

دوهـەم، مـرۆڤ "بونـەوەریکی کۆمەلایەتیە" کە ناتوانیٚ لـە دەرەوەی کۆمـەل بـژی. لـە روانگـەی ئیـبن خەلدونـەوە خـەلکی پیکەوە کۆدەبنەوە لەبەرئـەوەی مـەیلیان هەیـە بۆ ژیـان لـە کۆمـەلدا و پیویسـتیان بـە کۆمـەل هەیە چونکـە سروشـتیان وایـان لیدەکـات کـە یارمـەتی یـەکتری بـدەن بـۆ بەدەسـتهینانی هۆکـاری مانـەوە لـە ژیـان[١٩]. بە کۆمەلایـەتی بوونی مرۆڤ پیویستیەکی کاتیی نیە، بەلکو پیویسـتیەکی هەمیشـەییە. پـەیوەندی کۆمەلایـەتی بـۆ ئیـبن خـەلدون پیویسـتیەکی رەهایـە؛ بـە کۆمەلایـەتی بـوون دۆخیکـی پیویسـتی مانـەوە لـە ژیـان و پیشـکەوتنی کۆمەلە. لە روانگـەی ئیبن خەلدونەوە، بوون و هیشـتنەوەی جـۆر نـاتوانریٚ مسـۆگەر بکـریٚ ئەگەر لە ریی هاریکاری و یارمەتی هاوبەشەوە نەبیت[٢٠].

سیهەم، خەلکی پیویستیان بە دەسەڵاتی سەرکردایەتی هەیە و ئەم پیویستییەش ئەنجامی سروشتی و پیویستی بە کۆمەڵایەتی بوونە. پاش بەکۆمەڵایەتی بوونی ئادەمیزاد، کۆمەل پیویستی بە کۆنترۆلیکی بەهیز هەیە بۆ ئەوەی خەلکی لە نیوان خۆیاندا نەکەونە لەناوبردنی یەکتری[٢١]. کاتیك کە مرۆڤ دەگاتە "دۆخی کۆمەل" لە بەرژەوەندیەتی کە یەکیك ببیّ بە خاوەن دەسەڵات بۆ ئەوەی کۆمەل بتوانیّ لە ئاشتیدا بژی.

ئەم تیروانینە سوودگەرییە (*utilitarian*)ی ئیبن خەلدون، شی دەکریتەوە لە ریگەی پیویستی کەسەکان بۆ دەسەڵاتیك (وازع) کە بیانپاریزیّ لە یەکتری[٢٢]. دەسەڵات کۆی (سینتەزەی) ئەو هیزانە پیکدینیّ و دەیان کات بە یەك و دەشبیّ بوتری کە هاوبەشی دەکات لە سروشتی کۆمەڵایەتی ئادەمیزاد. بەلاّم دەسەڵات بە شیوەیەکی بەردەوام گوزارشت ناکات لە ویستی یەزدانی. بە جیاوازی لەگەلّ ئەو فەیلەسوفانەی پیش خۆی و ئەو رووناکبیرانەی پاش خۆی کە لە خزمەتی رەهایەتی ئەوروپادا بوون (*europen absolutisa*) (هۆبس، بۆدین، بۆسۆی.. هتد)، ئیبن خەلدون رەخنەی ئەو بیرە دەکات کە دەلی خەلکی دەبیّ، بە شیوەیەکی پیویست، حوکم بکرین لە لایەن دەسەڵاتیك کە نوینەرایەتی ویستی یەزدانی بکات. ئیبن خەلدون تیشك دەخاتە سەر ئەوەی کە فەیلەسوفەکان زۆر مبالەغە دەکەن و دەیانەویّ ئەوە پیشان بدەن کە دەسەڵات دەبی لەسەر بنچینەی یاسایەك بیت کە لە یەزدانەوە هاتبیت و ئەو کەسەی کە لەسەر ئەم بناغەیە حوکم دەکات مافی ئەوەی هەیە داوا لە هەموان بکات کە ملکەچی بۆ بکەن و خۆشی دەبیّ حوکم بکات بەبیّ ئەوەی کەس بتوانیّ بەرەنگاری بیتەوە[٢٣]. ئیبن خەلدون دەلیّ: ئەم باسە دەتوانریّ لەسەر ئاستی میژوویی بە درۆ بخریتەوە و هیچ بەلگەیەك نیە بۆ ئەوە چونکە دەبی تیبینی بکریّ کە پیش پیغەمبەرایەتی، جۆری مرۆیی هەبوە و پاریزگاری کراوە و حوکم کراوە لە لایەن دەسەڵاتیك کە خۆی فەرز کردوە لە ریگەی هیزی خۆی یان هیزی هاوخۆیی "عصبیە"[٢٤]. میژووی مرۆڤایەتی پرە لەو نمونانەی کە پیشانی دەدەن، ئەو کەسانەی دەسەڵاتی یەزدانیان هەبوە و ئەوانەی کە دوای رینماییەکانی پەیامبەران کەوتوون ئەگەر بەراورد بکرین بە ژمارەی ئەو مەجوسانەی کە کتابیان نیە کەمن، بەلاّم زۆربەی زۆری کۆمەلی جیهانی پیکدینن و ئەمانەش بونیان هەبوە و دەولەت و هیزی خۆیانیان هەبوە تەنانەت لەم سەردەمەشدا لە زۆربەی ولاّتی جیهاندا، زۆر کۆمەلاّن هەن کە حوکم دەکرین لە لایەن ئەو کەسانە کە نوینەرایەتی ویستیکی یەزدانی ناکەن و لە هەمان کاتیشدا سەرۆکی خۆیانیان هەیە و بەبیّ دەسەڵاتیکیش هیچ کۆمەلیك بوونی نیە[٢٥].

## پەراویزەکان

١-بروانە ابن خلدون، المقدمە، دار العلم، بیروت، لبنان، ١٩٧٨، ل ٣٨.

٢-ابن خلدون، المقدمە، ل ٣٨.

*3-De slane Mac Guckin W. Prolegomenes historiques d'Ibn Khaldun Cnotices et extraits des manucrits de la Bibliotheque Imperiale, Vol. XIX-XXI, Paris, 1862-1868, P.4.*

*4-De Slau, p.4.*

٥-ابن خلدون، المقدمە، ل ٢٨.

٦-ھ. س. ل ٢٨.

٧-المسعودی کە لە ساڵی ٩٥٠ مردوە، میژوونووس و زانای جوگرافی عەرەبە کە لە بەغدا لەدایکبوە. ژیانی خۆی بە سەفەر کردن بردە سەر پیش ئەوەی لە قاهیرە جیگیر بیت. زۆر سەفەری کردوە لە ئیران و هند و چین و مەدەگەسکەر.

٨-الطبری (٨٣٩-٩٢٢) لە تەبەرستان لەدایکبوە (خوارووی دەریای رەش). ئەویش وەکو المسعودی زۆر گەشتی کردوە پیش ئەوەی لە بەغدا جیگیر بێ. الطبری میژوونووسیکی مەزنە کە زانیاریەکی ئینسیکلۆپیدی هەیە و نووسەری کاریکی میژووییە کە لەناویدا باسی سەرجەم ئیتنیەکانی جیهانی ئیسلامی دەکات لە پیناوی پیشاندانی یەکیەتی ئاینی ئیسلامی.

٩-بروانە ابن خلدون، المقدمە، ل ٢٨.

١٠-العمران بە گویرەی چەمکاندنی خەلدونی زۆر لایەن دەگریتەوە: دەتوانێ واتای بە کۆمەڵایەتی بوون بگریتەوە لەناو چوارچیوەی ژیانیکی شارستانیەت، یاخود دەتوانێ واتای جوگرافی یان دیمۆگرافی ژیانی کۆمەڵایەتی هەبێ.. هتد.

١١-ابن خلدون، المقدمە، ل ٣٦.

١٢-ھ. س. ل ١٠.

١٣-ابن خلدون، المقدمە، ل ٣٥.

*14-De Slane, Ibid, P. 142.*

*15-B. Lewis, ch, Pellat et J. Schacht, Encyclopedie de l'Islam, Tome II, Paris,1960, P. 798.*

*16-Ibid. P. 798.*

١٧-ابن خلدون، المقدمە، ل ٤٢.

١٨-ھ. س. ل ٤٢.

١٩-ھ. س. ل ٤٢.

٢٠-ھ. س. ل ٤٢.

٢١-ھ. س. ل ٤٣.

٢٢-ھ. س. ل ٤٣.

٢٣-ھ. س. ل ٤٣.

٢٤-ھ. س. ل ٤٤.

٢٥--ھ. س. ل ٤٤.

**Arnold J. TOYNBEE, A Study of History, Vol, III, London, 1935. P. 322.*

**ئەم وتارەم لە گۆڤاری زانستی فەرەنسی بڵاوکردۆتەوە لە ساڵی ١٩٩٤ بەم ناونیشانەی خوارەوە:

*Albert Issa, "La science nouvelle" d'Ibn Khaldun, Regards Sociologiques, Surde Politique 2, STRASBOURG, n. 7. 1994, PP. 75-80.*

# کەوشدرووەکەی ستالین

• دیدیار ئیریبۆن
▪ لەئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

فۆکۆ پێش ئەوەی بانگهێشتەکەی لایلی[i] پێبگات، دەستی کردبوو بەوتنەوەی سایکۆلۆجیا لەپەیمانگای مامۆستایان. لویس ئاڵتۆسێر[ii] داوای لێکردبوو هەرئەوەندەی ئەگریگاسیۆنی[iii] تەواوکرد یەکسەر وەرزێك وانە بڵێتەوە. لەپایزی ساڵی ١٩٥١ بەدواوە، هەتا بەهاری ساڵی ١٩٥٥ فۆکۆ وانەیەکی ئێوارانی دەوتەوە. ژمارەیەکی تارادەیەك گەورەی پازدە تا بیستوپێنج کەسی لەپەیمانگا ئامادەی دەبوون، بەشێوەیەکی گشتی لەوکاتەدا هەردەرسێکی ئەو پەیمانگایە پێنج یان شەش کەس ئامادەی دەبوون. بۆیە ئەوە ژمارەیەکی گەورەو پەرۆش بوون کەئامادەی وانەکانی فۆکۆ دەبوون. ڕۆژێکیان جان کلۆد پاریسۆن کەلەیەکێك لەوانەکانی فۆکۆ هاتە دەرەوە، وتی" ئەمە شتێکی دڵگیرە". ئێستا پۆڵ ڤینی دەڵێت:"کۆرسەکەی بەناوبانگ بوو. وەکو ئەوە وابوو بچیت بۆ شانۆ" هەروەها جاك دێریدا[iv]: "منیش وەکو زۆرکەسی تر ئالودەی توانای ئاخاوتنی ببووم. ڕەوانبێژییەکەی، دەسەڵاتەکەی، درەوشاوەییەکەی، هەموویان کاریگەر بوون." هەندێك لەبۆچوونە مەزنەکانی فۆکۆ لەوماوەیەدا، لەوانەکاندا دەردەکەوتن و پاشان دەچوونە ناو تێکستەوە. لەساڵی ١٩٥٣دا، لەسەر داوای دێنیس هیوسمان پێشەکییەکی بۆ مێژووی سایکۆلۆجیا، ماوەی نێوان ساڵانی ١٨٥٠ ـ ١٩٥٠، نوسی. کەدەیویست مێژووی فەلسەفەکەی ئەلفرێد وێبەر نوێ بکاتەوەو نوێترین زانیاریی بخاتە ناوی. کتێبی یەکەمی فۆکۆش (نەخۆشییە عەقڵییەکان و کەسێتی)، بەنزیکەیی هەر لەهەمان ماوەدا نوسراوە.

فۆکۆ بەردەوام بوو لەسەر نەریتی بردنی خوێندکارەکانی بۆ سانت ئان بۆ بینینی



فۆكۆ

نمایشی نەخۆشەكان. بۆ نمونە، جان كلۆد پاریسۆن ئامادەی دەمەتەقێكانی داومیزۆن دەبوو، جاك دێریداش بیرەوەریی وردی لەم بارەیەوە لەیاد ماوە، زیاتر وەكو كۆبوونەوەی خەماویی: "فۆكۆ هەرجارەی سیان یان چوارمانی دەبرد بۆ ئەوێ. دەچووین بۆ ئۆفیسەكەی داومۆزین، لەوێ خوێندكارەكانی مەشقیان لەسەر تەكنیكەكانی ناو عەیادە دەكرد.. نەخۆشێك دەهێنرایە ژوورەوە، دكتۆرێكی لاو لێی دەپرسییەوەو تاقیدەكردەوە، ئێمە بۆ ئەوە لەوێ بووین. شتێكی زۆر بێزاركەر بوو. ئینجا دكتۆرەكە دوای نوسینی تێبینییەكانی خۆی دەڕۆیشت و، وانەكەی داومۆزین دەستی پێدەكرد.

لەم ماوەیەدا، فۆكۆ ببوو بەسەنتەر، ئەگەر نەڵێین سەركردەی دەستەیەكی بچووكی خوێندكارە كۆمۆنیستەكان لەئیكۆل. گرووپەكە پێكهاتبوو لەپۆڵ ڤینی، جان كلۆد پاریسۆن، جرارد جێنتی، مۆریس پینگۆت، جان مۆلینۆ، لەگەڵ جان لویس ڤان ریگمۆرتەر، كەئەمیان لاوێكی گوێڕایەڵ بوو بۆ پرۆفیسۆر. هەرهەموویان سێ یان چوار ساڵ لەفۆكۆ لاوتر بوون، كەمو زۆر هەموویان ڕێزیان لێدەگرت. ئەوانە كۆمۆنیست بوون، بەڵام لەراستیدا گرێدراو نەبوون. خوێندكارە

كۆمۆنیستەكانی تر لەئیكۆل، كەهەموویان ئارسۆدۆكسی بوون، بەمانیان دەووت " گرووپە فۆلكلۆرییەكە". لەكۆتایی هۆڵەكەی لای دەروازەی پەیمانگاوە، یان لەناو حەوشەكەیدا، رۆژانە چەند كاژێرێك دەمەتەقێیان دەكرد. رێۆییەكەش، وەك ناویان لێنابوو، هەركاتێك بهاتایە بۆ شەقامی ئۆلْم، ماوەیەكی زۆری لەگەڵ ئەواندا بەسەر دەبرد. فۆكۆ لەناو ئەو شوێنەدا كەپێشتر نامەخانەی تۆماركردن بوو، لەسەر بینای سال دوسان، ئۆفیسێكی رێكخستبوو. بەو شوێنەی دەوت تاقیگەی سایكۆلۆجی. لەلای كەلوپەلی ژوورەكەوە مشكێك لەناو سندوقی پێڵاوەكەدا دەژیا. سندوقەكەی پیشانی میوانەكانی دەداو بەپێكەنینەوە دەیووت تاقیگەكە لەوێیە. سەر رەفەكان تۆزی ساڵی حەفتاو هەشتیان بەسەرەوە بوو، تا ئەوكاتەی فۆنۆگرافەكەی بۆ هێنا. خوێندكاران و هاورێیان لەوێ سەریان لێدەدا. لەم شوێنەدا بەسەعات لەگەڵ مۆریس پینگۆتی هاورێیدا قسەی دەكرد، كەساڵی دواتر كتێبێكی جوانی نوسی " مەرگی خۆبەخشە یابانییەكە".

هەروەك ئەندامانی گروپە فۆلكلۆرییەكە، فۆكۆش پەیوەندیی كرد بەپارتی كۆمۆنیستەوە. دواتر زۆر بەكەمی دەربارەی ئەم بەئەندام بوونە قسەی دەكرد. بۆنمونە ئاوا باسی رەوشی سیاسیی دەكات لەو ماوەیەدا، لەساڵی ١٩٧٨دا لەچاوپێكەوتنێكدا لەگەڵ دوكۆ ترۆمبادۆریدا، وتی:

" بەنیسبەتی ئەوانەوە كەتەمەنیان بیست ساڵانەو جەنگیش تەواو بووە، دەبێت سیاسەت چی بێت، بۆئەوانەی كەزیاتر خۆیان بابەتی تراجیدیاكە بوون نەك بەشدار بن تێیدا؟ دەبێ سیاسەت مانای چی بێت كاتێك پرسیارەكە بریتی بێت لەهەڵبژاردنی یەكێتی سۆڤێتەكەی ستالین یان ئەمریكاكەی ترومان[v]، یاخود لەنێوانی پارتی سوسیالیستی فەرەنسا و دیموكراتە مەسیحییەكاندا، وەهەروەها؟ زۆر لاوی رۆشنبیر، كەمن یەكێك لەوان بووم، دژی بۆرجوازییەت بوون .. پرۆفیسۆر، رۆژنامەنوس، نوسەر، هەرچییەكی تر. هەموویان زێدەرۆ بوون. ئەزمون خۆی ئەو پێویستییەی خستە روو بۆ ئەوەی بەپەلە كۆمەڵگایەكی جیاواز بخولقێنرێت لەوەی ئێمە دەیناسین. ئەمەبوو ئەو كۆمەڵگایەی لەگەڵ نازیزمدا هێنرایە پێشەوە، كەخۆی پێ پۆخڵ كرد ، پاشان بەكۆمەڵ بەرەو پیری دیگۆڵ[vi] چوون. بەبەریكەكەوتن لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، بەشێكی زۆری لاوانی فەرەنسا كاردانەوەیەكی رەتكردنەوەیان لەلا دروست بوو.

بەم سەرنجانە، فۆكۆ هەوڵی نەدا، روونی بكاتەوە بۆچی پەیوەندیی كرد بەپارتی كۆمۆنیستەوە، بەڵكو لەجیاتی ئەوە باسی كرد كەبۆچی ئالودەی نیچەو باتای[vii] ببوو، هەروەها بۆچی پشتی كردە فۆرمە باوەكانی فەلسەفە، كەهیگڵییەكان و فینۆمینۆلۆجییەكان[viii] پێشكەشیان دەكرد. كاتێكیش دوێنەرەكەی

سەسوڕمانی خۆی دەربڕی لەو وەڵامەو جەختی کردە سەر کەلتوری مارکسییانەی ئەو ماوەیە، فۆکۆ وەڵامی دایەوە:

چونکە زۆرێك لەئێمەی رۆشنبیرانی لاو، چێژمان لەنیچە یان باتای دەبینی، نوێنەرایەتی شێوازێکی دوور لەمارکسیزم یان کۆمۆنیزممان نەدەکرد. لەبەرامبەریشدا، ئەوە تاکە شێوازیی پەیوەندیکردن بوو، تاکە رێگابوو لێیەوە بگەین بەوەی کە پێویستە لەکۆمۆنیزم چاوەڕێی بکەین. پێویستی ئەوەی بەتەواویی ئەو جیهانە رەت بکەینەوە کەتێیدا دەژین، کەئەمەش فەیلەسوفە هیگڵییەکانی زۆر کامەران نەدەکرد. لەلایەکی تریشەوە، ئێمە بەدوای رێگایەکی دیکەی رۆشنبیرییدا دەگەڕاین بۆئەوەی بەدڵنیایی بگەینە ئەو خاڵەی کەتێیدا شتێکی جیاواز خەریك بوو دەرسکا یان دەهاتە بوون: ئەوەش، کۆمۆنیزم بوو. ئەمەبوو کەچۆن بەبێ ناسینێکی راستەقینەی مارکس، هیگڵیزم رەت بکرێتەوە، شتێکی ئارامیبەخش نبیە، هۆیەکەشی سنورداریی بوونگەرایی بوو، من بڕیارم دا پەیوەندیی بکەم بەپارتی کۆمۆنیستەوە. ئەمە لەساڵی ١٩٥٠دا بوو. گەر بتەوێت مارکسیستێکی نیچەییانە بیت، ئەوە شتێك بوو لەمەحاڵەوە نزیکتر بوو، هەروەها ئەگەر پێت خۆش بێت، تاڕادەیەك شتێکی درێویش بوو. تەنانەت خۆشم دەمزانی کەوایە.

بەڕوونیی دیارە کەفۆکۆ بەکردار سەرلەنوێ رەوتی رۆشنبیریی و سیاسیی خۆی بیناکردەوە، چونکە بەراستی ئەوە مۆدێلی ئەو نەبوو لەگەڵ نیچەدا کەوای لێکرد پەیوەندیی بکات بەپارتی کۆمۆنیستەوە. بەپێی شایەتی چەند کەسێکی ئەو ماوەیە، دوای دەورووبەری ساڵی ١٩٥٣، نیچە کاریگەرییەکی گرنگی لەسەری پەیداکردووە. مۆریس پینگۆت باسی ئەوە دەکات کەچۆن فۆکۆ لەساڵی ١٩٥٣دا، سەرکەنارەکانی ئیتالیا نیچەی دۆزییەوە " هیگڵ، مارکس، هایدگەر[ix]، لەساڵی ١٩٥٣دا، ئەمە چوارچێوەی سەرچاوەکانی بوو، کاتێك رووبەڕووبوونەوەی نیچە هاتە گۆڕێ. دەتوانم میشیل فۆکۆ ببینم لەکەناری سیڤیتاڤیسچا لەبەر خۆرەکە دانیشتووەو " ئەو بیرانەی لەسەردەمی خۆیاندا نین" دەخوێنێتەوە"پۆڵ ڤینییش هەر ئەمە دەسەلمێنێت، دەڵێت لەساڵی ١٩٨٣دا، بەدرێژیی لەگەڵ نیچەدا قسەی کردووەو لەگۆڤارەکەی خۆیدا ئاماژەی بەو ئاخاوتنە داوە. فۆکۆ بەڕوونیی پێی وتووە کەساڵی ١٩٥٣دا، بریتیە لەوساڵەی کەتێیدا دەستی کرد بەخوێندنەوەی نیچە. هەروەها پێشی وتووە" کاتێك لەناو پارتی کۆمۆنیستدا بووم، مارکسیزم وەکو پێڕەوێك هەستێکی باشی لەلام دروست کردبوو".

لەوەش زیاتر، نیچە بەتەواویی لەو تێکستە بزرە کەفۆکۆ لەو ماوەیەدا بڵاوی کردۆتەوە، چونکە فەرهەنگی مارکسییەکان بەتەواویی ئامادەیی هەبوو، تەنانەت ئەگەر نەشتوانرێت بەمارکسییەکی سادەو پوخت

لەقەڵەم بدرێت. ئەوەندە بەسە بگەڕێینەوە بۆ چاپی یەکەمی " نەخۆشیی عەقڵیی و کەسێتی" . کەبەم نزیکانە دەگەڕێینەوە سەری) پێویستە سەرنج بدرێت کەفۆکۆ هەرگیز سەر بەپارتی کۆمۆنیست نەبووە، بەوشێوەیەی کەبەشێکی زۆری هاوخوێندنەکانی کردیان. ئەو ئامادەی کۆبوونەوەی شانە بووە. مۆریس پێنگۆت دەنوسێت: " هەرچۆنێك بێت، لەبیرمە شەوێکیان لەوێ بوو، لەسەرەوەی چایخانە بچکۆلەکەی ناوچەی قاچاخچییەکان، کۆببووینەوە. لەپڕێکدا هاواری لێهەستاو چەند سەرجێکی توندی دەربارەی پەیماننامەی خەڵوز و پۆلا دەربڕی". بەڵام فۆکۆ هەرگیز لەچالاکیی سەربازییدا بەشداریی نەکردووە. هەرگیز کەس نەیدیوە خۆی رۆژنامەکەی کۆمۆنیستەکان " مرۆڤایەتی" بفرۆشێت، یاخود دروشمێك هەڵبگرێت یان بەشداریی خۆپیشاندانەکانیان بکات. یەکجار نەبێت، ئەمیش بەپێی گێڕانەوەکەی جان لویس گاردایس، کەرۆژێکیان کاتێك مرۆڤایەتی دەرچوو، لەگەڵ فۆکۆو شەش حەوتێکی تردا، لەبەردەمی ئۆفیسی رۆژنامەکەدا کۆبوونەوە، بۆئەوەی چەند ژمارەیەکی بەسەر گەڕەکی لاتینییەکاندا دابەش بکەن. وەلێ دەشڵێت" نەمن و نە ئەویش بۆ ئەم کارە نەدەشیاین"، ئێمە رۆحی ئەوچەشنە کارانەمان تێدا نەبوو. بۆیە لەسەروو هەمو شتێکەوە شیاو نیە نە لەرووی سیاسییەوە یان رۆشنبیرییەوە فۆکۆ لەگەڵ ئەوانەدا بپۆلێنیت کەخۆیان بەستالینیی[x] ناو دەبرد. ئەمانوێل رۆی لادوری کەیەکێك بوو لەدەرکەوتووەکان لەنێوانیاندا، لەیادەوەرییەکانیدا نوسیویەتی کە " میشیل فۆکۆ لەوماوەیەدا زۆر دوور بوو لەوەی بەستالینیی لەقەڵەم بدرێت".

جان کلۆد پاسیرۆن و ئەلێکساندەر ماسیرۆن، دێتەوە بیریان کەفۆکۆ بەشداریی کردووە لەزنجیرەیەك وانەدا لەنامەخانەکەی ریو فێرۆی، نزیکی شوێنی سانت سوڵپی. بەپێی خوێندکارانی فەلسەفەی مارکسیست لەوماوەیەدا گروپێکیان پێکهێنابوو، "کەتێیدا ژمارەیەك لەو فەیلەسوفانەی کەئەندامی پارتەکە بوون ( دیسانتی ، ڤێرنانت.. هتد) رازیی بوون کەتێیدا بدوێن. هەروەها فۆکۆ، کەلەو کاتەدا لەلایڵ دەرسی دەوتەوەو لە شەقامی ئۆڵمیش پۆلی هەبوو، رۆژێکیان هات بۆ ئەوەی دەربارەی پاڤلۆڤ بدوێت"لەمیانەی دەمەتەقێدا دەربارەی پیشەی دەرونزانی کەدەبێتە نەسکی حەوتەمی نەخۆشی عەقڵیی و کەسێتی. پاریسۆن لەسەری دەڕوات: بێشك ئاخاوتنەکەی ئەو بەتەواویی لەگەڵ راستەرێی مارکسیزمی ئارسۆدۆکسی ئەو ماوەیەدا، فیت نەدەبوو. بەڵام بێشك فۆکۆ باسێکی ستالینی کرد. لەراستیدا وانەکەی بەهێنانەوەی وتەیەك کۆتایی هاتبوو کەستالین وتبووی دەربارەی ئەو مرۆڤە هەژارە بەدمەستە جگەرەکێشەی لەژنەکەی و منداڵەکانی دەدات، بۆ ئەوەی روونی بکاتەوە کەمەسەلەکانی پاتۆلۆجیای[xi]

عەقڵیی بریتین لەبەرهەمی هەژاریی و رەتاندن، هەروەها تەنیا وەرچەرخانێکی رادیکاڵانە لەمەرجەکانی بووندا، دەتوانێت کۆتاییەك بۆ ئەمە دابنێت. ئایا پێویستە ئەمە بەئاماژەیەك لەقەڵەم بدرێت بۆ گروپی فۆلکلۆریی کەلەوانەکەدا ئامادەبیان هەبوو، هەروەك پاسیرۆن پێشنیار دەکات؟ یان لەوانەیە بەسادەیی بریتی بێت لەکاردانەوەیەکی ئەو حەقیقەتەی کە شتێکی بیرلێکراوە نەبوو ناوی ستالین لەوانەیەکدا پشتگوێ بخرێت کەلەلایەنی پارتەکەوە رێکخرابێت، ئیتر گرنگ نیە بابەتەکە چیە، تەنانەت ئەگەر فۆکۆ سودی لە حاڵەتێکی تارادەیەك تایبەتی وەرگرتبێت: کەس لۆمەی نەکات لەسەر نائامادەبوونی لەکۆبوونەوەکانی شانەکەدا . یان تەنانەت شتێکی دوور لەوەی کە شتێکی جیدیی بێت . گاڵتەجارییەکەی لەگەڵ جان لویس ڤان ریگێمۆرتەر، دەربارەی وتارەکەی لە "مرۆڤایەتی" دا دەربارەی یەکێتی سۆڤێت.

هەموو بەڵگەکان دەری دەخەن کەفۆکۆ ئەندامێکی شێلگیر نەبووە. تەنانەت دەشتوانین بڵێین کەئەو تاڕادەیەك دوورەپەرێزیش بووە. کەواتە چۆن دەتوانین ئەم دەمەتەقێ غەریبەی خوارەوە لێکبدەینەوە کەلەساڵی ١٩٧١دا کراوەو کلۆد مۆریاك[xii] لەگۆڤارەکەیدا بلاوی کردۆتەوە؟ فۆکۆ بەجێن کلۆد پاسیرۆن دەڵێت: بیرتە کاتێك لەنۆڤێل کریتیکدا بەناوی خەڵکەوە دەمان نوسی، هەروەها ئەو وتارە ناودارەی هەمووکاتێك دەربارەی دەدواین: پێویستە سەرچاوەکە بگەڕێتەوە بۆ مێرلۆ. پۆنتی، کەبریتی بوو لەو وتەیەی بەکارمان دەهێنا. پێوانیە ئەو وتارە هەرگیز نوسرابێت. بەڵام ئێمە نوسەرانی یەك دنیا لاپەڕی ترین لە گۆڤارەدا. مۆریاکیش دەڵێت: ئایا ئەوە رێکەوت بوو کەناوی کاناپایان پێوە بوو؟[٦] دوای ئەم بەرگەی ساتە نائاکاریەکان، تەواو کرا، بیرۆکەکە بەتەواویی دامەزرا، وەك چەشنە راستییەکی حاشا هەڵنەگر، کە فۆکۆ هەندێك وتاری لەژێر ناوی جان کاناپادا نوسیوە. کاناپا سەرنوسەری نۆڤێل کریتیك بوو، رەگەزپەرستێکی ستالینی بوو، کەسارتەر لەساڵی ١٩٥٤دا، لەساتە نوێیەکاندا پێی دەڵێت "عەقڵ ناتەواو". لەوەش زیاتر، فۆکۆ هەرگیز نکولیی لەو چاپە نەکرد. بەمۆریاکی نەووت کەشتەکان بەشێوەیەکی تر روویانداوە، بەلکو روونی کردونەتەوە. بپێی قسەی مۆریاك لەبەرگی دواتری ساتە نائاکارییەکاندا:" من بەناوی کاناپاوە هیچم نەنوسیوە. یان بەراستی دوان یان سیانیان، دەتوانین بڵێین ... " دانپیانانەکەی فۆکۆ بەناتەواویی جێهێڵرا، چونکە لێرەدا مۆریاك بەروونیی پێی دەبڕێت بۆ ئەوەی ئاماژە بکات کەئەو پەرچەکرداری نەبووە بۆئەوەی لەبەرگی پێشووتردا وتراوەو وازی لێهێناوە تێبپەڕێت.[٧]

شوێنکەوتنی درێژەی ئەم چیرۆکە شتەکانمان لێ ئاڵۆزتر دەکات. لەراستیدا کاناپا ئەو پیاوە نەبوو کەناوی خواستراو بۆ نوسینەکانی خۆی بەکاربهێنێت. پییر دێکس

کەیەکێکە لەدەستەی نوسەرانی گۆڤارەکە، ئەمەی بەتەواویی روون کردەوە. کاناپا وتارەکانی خۆی زۆر بەبایەخەوە نوسیوەو رێگەی نەداوە کەس خۆی لەقەرەی بدات. ئەوپەڕەکەی رەنگە هەندێك گوزارشتی بگۆڕییایەو هیچی تر، بەڵام ئەوەش چەندان سەعات دەمەتەقێی دەویست. کوڕەکەی جان کاناپا، کەناوی جیرۆمە، لەحەفتاکانا فۆکۆی بینیوە، فۆکۆش زانیبووی ئەو کوڕە کێیە، بەڵام ئاماژەی بۆ مەسەلەکە نەکردووە. لەوەش زیاتر جیرۆم کاناپا، باسی بینینی فۆکۆی بۆ باوکی کرد، بەڵام ئەو بەهیچ جۆرێك ئاماژەی نەکرد بۆ بوونی پەیوەندییەکی رابردوو لەگەڵ فەیلەسوفی دوارۆژدا. بەنیسبەتی دیسانتییەوە، کاتێك دەربارەی ئەوە پرسیاری لێکرا، دایە قاقای پێکەنین: " ئەمە هیچ نیە جگە لەفرت و فێڵی فۆکۆ". رەنگە وەڵامێکی تریشی هەبێت. واتە فۆکۆ بەراستی بۆ نۆڤێل کریتیکی نوسیبێت، بەڵام نەك وتارەکانی کاناپا، بەڵکو چەند وتارێك کەبەناوی خواستراوەوە بڵاوکراونەتەوە. بەڵام هیچ یەکێك لەئەندامانی دەستەی نوسەران یان ئەوانەی لەنزیکەوە کاریان لەگەڵدا کردوون . ئانی کیریگێڵ، جان تۆسیانت دیسانتی، فرانسیس کۆهێن، ڤیکتۆر لێدوك یان گیلبەرت رۆدریگێس (کەسکرتێری تەحریر و یاریدەدەری کاناپا بوو) . بەبیرەوەرییاندا نایەت فۆکۆیان بینیبێت، یان گوێیان لێبووبێت باسی کرابێت. ئیتر چۆن دەتوانێت بڕوا بەوە بکات کەدەشێت کاری لەگەڵدا کردبن. میشێل ڤیرێت، خوێندکاری فەلسەفە لەپەیمانگای مامۆستایان، لەساڵی ١٩٤٨دا، کەبەردەوام بۆ نۆڤێل کریتیکی دەنوسی، بەقووڵیی ئەمەی سەلماند. بەلای ئەوەوە ئەوە شتێك نیە بەبیردا گوزەر بکات، چونکە، وەك ئەو ئاماژەی پێدا، بەکارهێنانی ناوی خواستراو تەرخان کرابوو بۆ ستافی بەڕێوەبردن، ئەوانەی لەپلە باڵاکانی خزمەنی مەدەنییدا کاردەکەن، یاخود ئەندامانی سوپا. ئەو خۆشی بەشێوەیەکی گشتی وتارەکانی خۆی ، وەك ئەوەی ستایشی کۆمۆنیزمەکەی لویس ئاراگۆن[xiii] دەکات و داکۆکیی لەپەیمانی ئەڵمان . سۆڤێت دەکات، لەلایەنی ئەلکساندەر ماسیرۆن فرانسیۆس فۆرێتەوە نوسرابوو، هەروەها ئیمزاش کرابوو. کۆمۆنیستێکی دیاری تریش لەپەیمانگگای مامۆستایان، مۆریس کاڤین، هەموو شێمانەیەکی وەهای وەلانا کەفۆکۆ بەوشێوەیە بۆ گۆڤارە رۆشنبیرییەکەی پارتەکەی نوسیبێت. ئەوەشی وت کەهەرچۆنێك بێت ئەگەر شتی وەهاش کرابێت ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ میزاجە ناسەقامگیرەکەی فۆکۆ. میشیل گرۆوزێت کە لێپرسراوی شانەکە بوو، وتی کەئەو هیچ شتێك لەم بارەیەوە نازانێت. هێشتا ئەو کەسە دەمێنێتەوە کەفۆکۆ لەدەمەتەقێکەدا لەگەڵی دەدوێت، کەمۆریاك بڵاوی کردۆتەوە: جان کلۆد پاسیرۆن. بەڵام ئەو وتی بەهیچ جۆرێك بۆ نۆڤێل کریتیکی نەنوسیوە، بەهیچ جۆرێك، هەروەها پێشی وابوو کەرێی تێناچێت فۆکۆش

شتی وای کردبێت. ئەو بەتەنیا دەربارەی چەند سەرنجێکی کورت دواوە کەدەشێت خوێندکارەکانی پەیمانگای مامۆستایان نوسیبێتیان، چەن رەشنوسێك کەدەشێت بۆ وتار بەکەڵك بێن، کەبەناوی نوسەری سەرەکیی گۆڤارەکەوە نوسرابێت. هەروەها چەند تێکستێکی کورتی بێ ناو کەلەو کاتەدا لەدوا ژمارەکانی نۆڤێل کریتیکدا دەبینران، روداوەکانی گەرەکی لاتینییەکان یان پەیمانگای مامۆستایانی تۆمار دەکرد، پاسیرۆن نکولیی لەوە کرد کەرەنگە فۆکۆ نوسیبنی. ئاڵتۆسێریش بەراشکاویی جەختی لەوە کرد، پێدەچێت کەتاکەکەس زانیبێتی چی روودەدات ئاڵتۆسێر بێت. ئەو روونی کردەوە" پێموایە، مەبەستی فۆکۆ ئەوە بووە بڵێت، ئێمە لێپرسراوێتی کاناپیزم لەئەستۆی ئێمەدا بووە".

کەواتە، ئینجا چی؟ ئیمرۆ کلۆد مۆریاك شتێك ناڵێت لەگەڵ ئەوە دابگونجێت کەپێشتر نوسیویەتی. ئەو بەسادەیی دەڵێت کەفۆکۆ لەئامادەیی ئەمدا ئەو قسانەی کردووە. هەروەها جین فرانسیۆس سیرینلی، لەساڵی ١٩٨١دا بۆلێکۆڵینەوەیەك دەربارەی خوێندکارە کۆمۆنیستەکانی ناو پەیمانگای مامۆستایان، لەماوەی دوای جەنگدا، پرسیاری لەفۆکۆش کردبوو، دەڵێت فۆکۆ پێی وتووە خوێندکارەکان بۆ نۆڤێل کریتیکیان دەنوسی، بەقسەکانییەوە دیاربوو کە خۆشی دەخاتە ناو ئەو گروپەوە.

بەلاَم مەتەڵەکە هەر بەهەڵنەهێنراویی دەمێنێتەوە.

تەنیا لەدوو شت دڵنیاین. یەکێکیان ئەوەیە فۆکۆ وتارێکی نوسیوە دەربارەی دیکارت[xiv] بۆ رۆژنامەی کلارتێ، کەرۆژنامەی خوێندکارە کۆمۆنیستەکان بوو، ئەوەش لەسەر داوای میشێل ڤاریێت کەسەرنوسەری رۆژنامەکە بوو. بەلاَم ئەم وتارە قەشەنگە (بەپێی ئەلیکساندەر ماسیرۆن، کەئەندامی کۆمیتەی نوسەران بوو) بەوتارێکی زۆر قورس دانرا " بۆ جەماوەری خوێندکاران". لەبەرئەوە بلاَو نەکرایەوە، گەرچی ماسیرۆن و ڤێرێت رایان بەرامبەری زۆر باش بوو. ئەوەی تریشیان ئەوەیە کەئەندامێتی فۆکۆ زۆر پەراوێزیی بووە. لەچاوپێکەوتنەکەی ساڵی ١٩٨١دا، هەمان شتی بەسیرینێلی وتبوو. بەلاَم ئەوەی لێ زیادکردبوو، کەژیانێکی تارادەیەك کورت بوو. بەپێی ئەم قسانە مانەوە کاتییەکەی فۆکۆ لەگەڵ کۆمۆنیستەکاندا، لەوە درێژتر بوو لەوەی کە دواتر حەزی دەکرد بیڵێت: سێ مانگ، شەش مانگ، هەژدە مانگ، بەپێێ ئەو کەسەی پرسیارەکەی دەکرد. فۆکۆ لەساڵی ١٩٥٣دا پارتەکەی جێهێشت، چەند هۆیەکی لەژمارە نەهاتووی هەبوو بۆئەوەی بێتە دەرەوە. پێش هەموو شتێك دەبێت هەستی بەنائارامییەکی زۆر کردبێت لەناو پارتێکدا هۆمۆسێکسیی[xv] رەت دەکردەوەو بەرەفتاری بۆرجوازییەتی دادەناو بەنیشانەی هەرەسهێنانی ئاکاریی لەقەڵەمی دەدا. فۆکۆ

هەستی کورد کەهۆمۆسێکسییەکەی خستویەتییە لاوە. لەوکاتەدا هەندێکی تریش هەبوون کەلەبەر هەمان هۆ لەشانەکانیان وەدەرنرابوون. ئەم لێکدانەوەیە لەلایەنی شایەتێکی نایابەوە بەهێزکرا، واتە خودی ئالتۆسێر. بەوەڵامە بێدوودڵییەکەی بۆ پرسیاری بۆچی فۆکۆ پارتی کۆمۆنیستی جێهێشت " لەبەر هۆمۆسێکسییەکەی".

فۆکۆ خۆی هۆیەکی تریشی دابەدەستەوە: ناڕەحەتیی بەرامبەری ئەو مەسەلەیەی پێی دەوترا " پیلانی دکتۆرەکان". لەساڵی ١٩٥٢دا، دکتۆرەکانی ستالین تاوانبار کران بەگێڕانی پیلان دژی ژیانی " باوکە پرشنگدارو خۆشەویستەکەی گەل" . ناڕەزاییەکە ئەنتی ستالینیزمی لێکەوتەوە. بەڵام هەموو ئەندامانی پارتی کۆمۆنیستی فەرەنسە، بەفۆکۆشەوە، هاتنە دەرەوە بۆ دەربڕینی پشتیوانی خۆیان لەکۆمۆنیزمەکەی سۆڤێت. لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ دوسیۆ ترۆمبادۆریدا، فۆکۆ باسی ئەوە دەکات کەئەو چیرۆکە چۆن چۆنی کاری کردۆتە سەری:

کاتێك پارتی کۆمۆنیستی فەرەنسەم جێهێشت، ئەوە دوای پیلانە نێودارەکەی دکتۆرەکانی ستالین بوو، لەزستانی ١٩٥٢دا، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ هەستێکی نائارامیی کەتێمدا دروست بوو. ماوەیەکی کورت پێش مردنی ستالین دەنگوباس بڵاو بووەوە کە دەستەیەك لەدکتۆرەکان هەوڵیانداوە لەناوی ببەن. ئەندرێ وێرمسێر داوای کۆبوونەوەی شانە خوێندکارییەکەمانی کرد، بۆئەوەی بۆمان روون بکاتەوە کەچۆن پیلانەکە پووچەڵکراوەتەوە. تەنانەت بەوەش هێشتا قایل نەبووین.


ستالین

زۆر هەوڵماندا بڕوا بەوە بکەین کە وترا. ئەمەشیان هەر بەشێکە لەوەی کەدەمەوێت وەك هەڵویستی نائارامم باسی بکەم، بەڵام بۆخۆم هێشتەوە. ئەوە شێوازی بوونم بوو لەناو پارتەکەدا. بوونی ناچاریی بەوەی لەپشتی راستیەکەوە بوەستم کەبەتەواویی پێچەوانەی

بڕواکردن بوو، کەبریتی بوو لەبەشێك لەمەشقی تواندنەوەی (من)، بەشێك بوو لەگەڕان بۆ ڕێگایەك بۆئەوەی ئەویتریێك بیت. سەرەنجام تۆزێك متمانەمان بەوقسانە کرد کە وێرمسێر کردنی. سێ مانگ دوای مردنی ستالین، بۆمان دەرکەوت پیلانی دکتۆرەکان بوختانێکی رووت بوو. چی رویدا؟ کەم و زۆر بۆ وێرمسێرمان نوسی کەبێت و سەردانمان بکات، بۆئەوەی بۆمان روون بکاتەوە کەمەسەلەی ئەو پیلانە هەمووی چۆن چۆنی بووە. هەرگیز وەلأمێکمان دەست نەکەوت. تۆ دەڵێیت ئەوە شتێك بوو بەردەوام دەیانکرد، شتێکی نائاسایی نیە... بەلأم راستییەکە ئەوەیە لەوساتەوە من لەپارتی کۆمۆنیستی فەرەنسی دوورکەوتمەوە.

لەمردنی ستالین بەدواوە لە ٥ی مارتی ساڵی ١٩٥٣دا، دەشێت ئەو دوورکەوتنەوەیەی فۆکۆ باسی کرد، بگەڕێنرێتەوە بۆ هاوین یان پایزی ئەو ساڵە. جان پۆڵ ئارۆن حیکایەتێك دەگێڕێتەوە دەربارەی ئەوەی کە فۆکۆ لەبەهاری ساڵی ١٩٥٣دا هێشتا هەر ئەندامی پارتی کۆمۆنیست بووە. لەبەهاردا هەمان ئەو ئەندرێ وێرمسێرە لە لێل کۆبوونەوەیەکی سازکرد. ئەمجارەیان بۆئەوەی رەخنە لەپۆرترێتەکەی پیکاسۆ بگرێت کە بۆ ستالینی کێشابوو، لەسەر بەرگی لێتەر فرانسیس بلأوکرابووەوە کە گۆڤاری کەلتوریی پارت بوو، سەرنوسەرەکەی لویس ئاراگۆن بوو. میشیل سایمۆن و فۆکۆ لەو کۆبوونەوەیەدا ئامادە بوون. وێرمسێر بەگوێگرەکانی وت " ئەو پۆرترێتە ئیدانە دەکەین چونکە گوزارشت لەپەرستنی کەسێتی دەکات، کەلەتوێی هەڵەکانی خۆیەوە مرد یان لەتوێی شتێکی تری لەوبابەتەوە، ئەوە زیانبەخشە. بەپێێ ئارۆن فۆکۆ کەوتە ئەوەی تووشی شۆك ببێت، بەهۆی ئەو چەشنە عەقڵییەتەوە. ئیتر فۆکۆ ئامادەی هەموو ئەو کۆبونەوانە دەبوو کە وێرمسێر قسەی بکردایە. هەروەها لەوکاتەوەی لەساڵی ١٩٥٠دا پەیوەندیی کردبوو، شتێکی روونە کەنزیکەی سێ ساڵ لەناو پارتی کۆمۆنیستدا ماوەتەوە.

فۆکۆ لەوەش زیاتری پێچوو بۆ ئەوەی لەمارکسیزم دوور بکەوێتەوە. میشال سایمۆن لەبیرێتی، کەجارێکیان لەساڵی ١٩٥٤دا گوێی لەفۆکۆ بووە لەبەردەمی کۆمەڵێك لەخوێندکارە مارکسیستەکاندا وتویەتی " مارکسیزم فەلسەفە نیە، بەڵکو بریتیە لەئەزمونێك بەناو ئەو رێچکەیەدا کەدەگات بەفەلسەفە". هەروەها ئیتین ڤێرلی کەخوێندکارێکی کۆمۆنیست بوو لەپەیمانگای مامۆستایان، لەگەڵ فۆکۆدا بەشداری کردووە لەکۆبونەوەیەکدا کەلەلایەنی ئاڵتۆسێرەوە بەڕێوە دەبرا، بۆ پێکهێنانی گروپێك کەئەرکی دامەزراندنی سایکۆلۆجیایەکی مارکسیی بگرێتە ئەستۆی خۆی. بەپێی ڤێرلی، ئەو کۆبوونەوەیە یەکسەر دوای بلأوبوونەوەی نەخۆشی عەقڵی و کەسێتی، ئەوەش لەبەهاری ساڵی ١٩٥٤دا بوو.

تەنیا ئەمەمان پێ دەوترێت: فۆکۆ پارتی کۆمۆنیستی جیهێشت و پشتی کردە مارکسیزم پێش ئەوەی لەبەهاری ساڵی ١٩٥٥دا بەرەو سوید بکەوێتە ڕێ. بەڵام نزیکییەکەی لەئالتۆسێرەوە هەر مایەوە. "کاتێك پارتی کۆمۆنیستم جیهێشت، بەڵام ئالتۆسێر نەفرەتی لێنەکردم، نەیویست پەیوەندییەکانی لەگەڵ مندا بپچڕێنێت"[١٠]. ئەم پەیوەندییە لەگەڵ ئالتۆسێردا، بەبێ شك یەکجار گرنگ بوو بۆ هەردوکیان. لەساڵی ١٩٦٥دا کاتێك خوێندنەوەی سەرمایە کەوتە بازاڕەوە، ئالتۆسێر سوپاسگوزاریی خۆی بۆ فۆکۆ دەربڕیبوو، باسی ئەوەی کردبوو کە" گەورەکان فێرمان دەکەن کارەکانی مەعریفە بخوێنینەوە . بۆ ئێمە ئەوانە بریتی بوون لەگاستۆن باشلارو[xvi] کاڤالیس، بەڵام ئەمڕۆ ئەوانە بریتین لەجۆرج کانگیلم و میشیل فۆکۆ". ئالتۆسێری ناسراو بە"پشێویی" یان "کۆنترین شانازیی" وەك فۆکۆ بانگی دەکرد، هەستی زۆر دەجۆشا بەرامبەری کتێبی یەکەمی خوێندکارەکانی. ئەو خۆی هێشتا هیچی چاپ نەکردبوو کاتێك مێژووی دێوانەیی و لەدایکبوونی عەیادە لەهەردوو ساڵی ١٩٦١ و ١٩٦٣دا بڵاوبوونەوە. بەگەرمییەوە بۆ فۆکۆی نوسی و باسی " کاری پێشەنگ" و " سەربەست بوونی کرد. بەڵام ئەم کایمانە لەشەقامی ئۆلمەوە، کەتازە دەستی کردبوو بەچاپکردنی کاری خۆی لەفۆکۆ جیاواز نەبوو لەهێرشکردنیدا بۆسەر مارکسیزم لەوشەکان و شتەکاندا . ١٩٦٦. کاتێك بەشێوەیەکی تەماویی باسی حەوزی منداڵەکانی کرد کە گێژەڵۆکەی تیوریی دەمەونخونی کردبۆوە، هەموان لەمەبەستەکەی تێگەیشتن کە ناو حەوشەکەی پەیمانگای مامۆستایانی دەووت[١١]. کاتێك خوێندنەوەی سەرمایە لەساڵی ١٩٧٠دا بەزمانی ئینگلیزیی چاپکرا، سەرنجێکی تێدابوو دەربارەی فۆکۆ، کەنوسرابوو : " ئەو یەکێك بوو لەخوێندکارەکانم، شتێك لەلێکۆڵینەوەکانم بۆئەو دەگەڕێتەوە، کەبەشێك لەپێکهاتەشم دەگرێتەوە. بەڵام لەبیرکردنەوەو نوسینیدا، ئەو چەمکەی لەمنی وەرگرتبێت بەشانازییەوە مانایەکی جیاوازی پێبەخشیوە لەچاو ئەو مانایەدا کەمن بەکارم هێناون". لەپاڵ ئەوەدا کەناکۆکیی تیورییەکانی نێوانیان، بەشێوەیەکی تۆکمەو حەکیمانە دەکەوێتە روو، بەڵام ئالتۆسێرو فۆکۆ بەهاوڕێیەتی دەمێننەوە. فۆکۆ بەردەوام تێڕوانینێکی بەرزی بۆ ئالتۆسێر هەبوو، ڕێزێکی زۆری لێدەگرت. هەروەها هیچ وشەیەکیشی بەلاوە زبرو ناخۆش نەبوو تا بەکاری بهێنێت بۆ تەقاندنی ئەوانەی رقیان لەپرۆفیسۆرەکەی دەبۆوە، بەتایبەتی کاتیك مارکسیزم کەوتە بەر بای زەمانەو باوی نەما.

ڕەنگە فۆکۆ بتوانێت بڵێت من مارکسیستێکی نیچەییانە بووم، چونکە ئەو هێشتا لەناو ئەو فەزا تیورییەدا دەمێنێتەوە کە بەفینۆمینۆلۆجیاو مارکسیزم دیاریی دەکرێت،

كاتێك چەند نوسەرێكی مەزنی دۆزییەوە كەكاریگەرییان لەسەری زۆر بوو، كەلەگەڵ ئەواندا دەناسرێتەو لەهەموو فرسەتێكدا لێیان دەخوازێتەوە: جۆرج باتای و مۆریس بلانشۆ. سوپاس بۆ ئەو دوو نوسەرە، فۆكۆ لەراستیدا هەموو گرێكانی تێكشكاند تائەو ساتەی گەیشتە ناواخنی فەزای بیناكراوی فەلسەفەو سیاسەتی ئەوكاتە، سەرباری ئەو حەقیقەتەی كە دۆزینەوەی ئەو دوو نوسەرە لەو ماوەیەدا لەرێی سارتەرەوە بووە، كەلەساڵی ١٩٤٨دا بەدرێژیی لەسەری نوسیون. جاك دێریدا روونی دەكاتەوە:" ئێمە لەرێی سارتەرەوە كەوتین بەسەر باتای و بلانشۆدا، ئێمە لەدژی ئەو دەستمان كرد بەخوێندنەوەیان. لەهەر حاڵەتێكدا، وەك فۆكۆ دواتر تێبینی دەكات، ئەو دوانە باشترین دەروازە بەرەو نیچەیزم پێشكەش دەكەن. هەروەها رینیَ شار[xvii] و كارەكانی ساموێل بێكێتیشی[xviii] كەشف كرد. لەساڵی ١٩٥٣دا، لەچاوەڕوانی گۆدۆدا پێشكەش دەكرا، "هەناسەیەك دیمەنێك داگیر دەكات ".

ئینجا ماوەی سەرسامبوونی فۆكۆ بەئەدەب دەستی پێكرد، كە هەتا كۆتایی شەستەكان دەخایەنێت، دوای ئەوە دەسبەرداری دەبێت بۆ تێڕوانینێكی زیاتر سیاسییانە. جارێكیان فۆكۆ باسی پەنجاكانی بۆ پۆڵ ڤینی كردووە: "لەوكاتەدا، خەوم بەوە دەبینی ببم بە بلانشۆ" هەروەها وتی كەخوێنەرێكی بەردەوامی ستونەكەی بلانشۆ[xix] بووە كەبەشێوەیەكی رێكوپێك لەنۆڤێل ریڤیو فرانسیسدا بڵاو دەكرایەوە، لەكانونی دووەمی ساڵی ١٩٥٣وە دەستی پێكردبوو. لەتشرینی دووەمی ١٩٥٣دا، بلانشۆ وتارێكی درێژی دەربارەی ناكۆتاییەكەی بێكێت نوسی، توانەوەی من و نوسەری تێكستەكەی شیدەكردەوە. هەروەها لەهەمان ساڵدا بلانشۆ پێشەكییەكی بۆ وەرگێڕانی كتێبەكەی كارل یاسپەرس[xx] دەربارەی "ستریندبێرگ[xxi] و ڤان كوخ" نوسی. فۆكۆ دەمێك بوو خوێنەرێكی وریای یاسپەرس بوو، زۆرجار لەوتارەكانی سەرەتایدا، ئاماژەی بۆ سایكۆلۆجیا گشتییەكەی یاسپەرس كردبوو. یاسپەرس لە ستیندبێرگ و ڤان كوخدا، یاسپەرس بەراشكاویی چوارچێوەی مێژووی شێوازەكانی شێتیی كێشا:" شتێكی سەرنجراكێشە باسی نزیكایەتیی بەرچاویی نێوان هیستریاو رۆحی باوی پێش سەدی هەژدەیەم بكەیت، كەنزیكایەتییەكە دەشێت ئەمڕۆ لەنێوانی شیزۆفرینیاو رۆحی ئەم سەردەمەماندا هەبێت"[١٥]. لەپێشەكییەكەیدا بەناونیشانی "شێتی و بلیمەتی" بلانۆشۆ نوسیبووی: "چ زانستێك دەتوانێت ئەوە لێكبداتەوە كەبەشێوەیەكی هۆكاریی قابیلی تێگەیشتن نیە. تێگەیشتنی گەڕان بەدوای ئەوەداخۆی نادات بەدەستەوە، كەبەتین و تاوو سەقامكیریی بەرەو پێشەوە دەجوڵێت بەرەو ئەو ساتەی كەچیتر تێگەیشتن شیاو نیە، كەلەراستیدا، لەواقیعە كۆنكرێتییە رەهاكەیدا،

دەبێتە داخرانێکی تەڕم". بێ"شك بلاشۆ یەکێکە لەسەرچاوە بنەڕەتییەکان بۆ تێگەیشتنی کارەکانی فۆکۆ لەو سالانەدا.

بەنیسبەتی شیعرەکانی شاریشەوە، دەشێت کاریگەرییەکی بەرچاویان لەسەر نوسینەکانی فۆکۆ جێهێشتبێت، لەیەکەمین کارییەوە بۆ دوایین کاری: هەرزوو لەپێشەکییەکەیدا بۆ تێکستەکەی بێنسوانگەر لەسالی ١٩٥٣دا، پاشان لەپێشەکییەکەیدا بۆ " شێتی و گەمژەیی" لەسالی ١٩٦١دا. لێرەدا فۆکۆ رادەگەیەنێت: " تاکە یاساو میتۆد کەمن هێشتومەتەوە ئەوەیە کە لەتێکستێکی شاردا هەیە، دەشێت لەوێدا پێویستترین و جلەوگیراوترین پێناسەی راستیی دیسان بخوێنرێتەوە: من لەشتەکانەوە ئەو وەهمە وەردەگرم کەبەرهەمی دەهێنن بۆ ئەوەی خۆیان لەئێمە بپارێزن و وازیان لێبهێنین تا خۆیان تەسلیمان ببن"[١٧]. پێ"شەکییەکە بە خواستنەوەی وتەیەك لەشارەوە بەبێ هیچ لێکدانەوەیەك کۆتایی پێدێت: هاوڕێ خەمبارەکان بەدەگمەن سکالا دەکەن، بەرۆشناییە کوژاوەکەتەوە بڕۆ گەوهەرەکان بهێنەرەوە. نهێنییەکی نوێ لەئێسکەکانتا دیارە، پەرە بدە بەتوانا شەرعییەکانت"[١٨]. سەرلەنوێ لەسالی ١٩٨٤دا وتەی رینیە شار لەسەر بەرگی دوایین کتێبەکانی فۆکۆ دەردەکەوێتەوە: بەکارهێنانی چێژەکان و بایەخدان بەخود. پۆل ڤینی دەلێت فۆکۆ لەسەرەتای پەنجاکاندا، هەندێك لەشیعرەکانی رینێ شاری لەبەر بووە، بەردەوام چەند بڕگەیەکی لێ دەخواستنەوە. چەند سالێك دواتر لەسوید، فۆکۆ داوای لەو خوێندکارو هاوڕێیانە دەکرد کەسەریان لێدەدا، شیعرەکانی رینێ شار بخوێننەوە بۆئەوەی لەپێشەکییەکانی ئەم تێبگەن.

پۆل ڤینی دەلێت فۆکۆ لەسەرەتای پەنجاکاندا، هەندێك لەشیعرەکانی رینێ شاری لەبەر بووە

دواتر فۆکۆ بەشێوەیەکی سەیر تێکەلاوی زۆرکەس بوو، کەبەهیچ شێوەیەك لەئایدیاکانی نەدەگەیشتن. ماوەیەکی کەم دوای گەڕانەوەی فۆکۆ بۆ فەرەنسە باتای مرد. ئیتر هەرگیز هیچ پەیوەندییەکی بەبلانشۆ یان شارەوە نەما. بلانشۆ لەفایلەکەی تێل کێلدا دوای مردنی فۆکۆ وتی کەتەنیا یەك جار پێکەوە دواون. من هەرگیز ئەوم نەبینیوە، یەك جار نەبێت لەگۆڕپانەکەی سۆربۆندا، ئەویش لەماوەی روداوەکانی سالی ١٩٦٨دا، رەنگە لەمایس یان تەموزدا بووبێت ( گەرچی خەلك پێیان وتبووم کەلەوێ نیە)، کاتێك چەند وشەیەکی کەمم پێ وت، بەلام ئەو نەیدەزانی ئەوەی قسەی لەگەلدا دەکات کێیە"[١٩]. بلانشۆ دیمانەیەکی لەسەر مێژووی شێتی کرد کاتێك

بڵاو کرایەوە، ئینجا دوای دوو ساڵیش رایمۆند رۆسێڵ کردی. فۆکۆ لەساڵی ١٩٦٦دا لەوتارێکی درێژدا "بیرەکانی دەرەوە"ی بلانشۆی شیکردەوە. بلانشۆ وتی تاکە دەمەتەقێ لەتوێی وتارو کتێبەوە بوو. ئێمە یەکترییمان لەکیس چوو[٢٠]. بەڵام رەنگە بەقووڵی ئەمە ئەوە بووبێت کەدەیانویست؟

پۆڵ ڤینی کە هاورێی فۆکۆش و رینێ شاریش بوو، دەڵێت، فۆکۆ هەرگیز رینیە شاریشی نەبینی، هەرگیز تەلەفونیشی بۆ نەکردووە. رۆژێکیان لەساڵی ١٩٨٠دا، ڤینی و فۆکۆ پیلانیان دانا بۆئەوەی شار بێنن بۆ کۆلیج دوفرانس. پیلانەکە زۆری نەخایاند، لەبەرئەوەی بۆیان دەرکەوت کە شاعیرەکەیان تەمەنی خانەنشین بوونی تێپەڕاندووە. رینێ شاریش لەلای خۆیەوە رێزێکی زۆری بۆ فەیلەسوفەکە هەبوو، بەمێژووی شێتییەکەی سەرسام بوو. تەنانەت یەکێك لەدوایین شیعرەکانی خۆی تەرخان کرد بۆ میشیل فۆکۆ، کە مرد. بەڵام ئەو شیعرە " نیو رۆژ لەناو گۆڕدا" بۆ فۆکۆ نەنوسرابوو. بەرواری ٢١ی مایسی ١٩٨٤ی لێدرابوو، چوار رۆژ پێش مردنی فۆکۆ. شار بەسادەیی دەسنوسە ئەسڵییەکەی دا بەڤینی، کەلەونزیکانە لەباشوری فەرەنسە دەژیا. ئەوە دیارییەك بوو بۆ سێبوریی هەست بەئازارکردن لەمردنی یەکێك لەهاوڕێکانی. بەڵام کاتێك پۆڵ ڤینی ئەمەی خوێندەوە:

جوتێك رێوی بەفرەکە هەڵدەدەنەوە
زەویی زەماوەندەکەیان دەپەستنەوە
شەویش خۆشەویستییەکی زبر
تینویەتیەکی تاڵ ئاشکرا دەکات
لەسەر هەر لایەك لەناو دڵۆپی خوێندا

چاوی فرمێسکی تێزاو بەشاعیرەکەی وت:" ئێمە بە فۆکۆمان دەوت رێوی" ئینجا شار پێشکەشکردنەکەی زیاد کرد. شیعرەکەش لەبۆنەی ماتەمی فۆکۆدا لەپۆیاتێ خوێنرایەوە. هیچ پەیوەندییەکی بەتین لەنێوانی شارو فۆکۆدا نەبوو زیاتر لەوەی هاوزەمانی یەکتریی بوون، دژی ئەفسانە باش داڕێژراوەکە." پێم خۆش دەبێت بڕوا بکەم ( کەپەیوەندییەکی وەهامان بووە). پۆڵ ڤینی لەکارێکدا کەئێستا لەسەر رینێ شار ئامادەی دەکات، دەڵێت:" بەڵام ئەوە شتێکی دادپەروەرانەیە لەکورتی بیبڕینەوە"[٢١].

## پەراوێزەکان

[i] لایل، زانکۆی *Lille, University of* کۆمەڵە پەیمانگایەکی ناوخۆیی خوێندنی باڵایە، لەشاری لایل لەفەرەنسا. دەزگایەکی رەسمییەو لەچێر سەرپەرشتی وەزارەتی پەروەردەدایە. یەکەمجار زانکۆ سەرەکییەکە لەشاری داوی بوو کە ٣٢کیلۆمەتر لەباشوری لایڵەوەیەو لەژێر چاودێری پاپادا بووەو لە ٣١ی تەموزی ساڵە ١٥٥٩دا دامەزرێنراوەو شافیلیپی دووەم پادشای ئیسپانیا، ٤٠٠٠٠ پاوەندی زیوی بۆ تەرخان کردووە. لەساڵی ١٥٦١دا کراوەتەوەو تەرخان

# پان عەرەبیزم؛ ئەفسانە یان ڕاستی؟

• محەمەد کازم ئاسایش

▪ لە فارسییەوە: محەمەد کەریم

بەکارهێنانی زاراوەی "ئەعراب" هەرچەندە لە رووی مێژوویی و فەرهەنگییەوە لە تێکستە جیاوازەکانی ئەدەبیاتی ئێمەدا جێگیر بوەو دەتوانرێ جێگایەکی بۆ بدۆزرێتەوە، بەڵام وا دیارە تەرحکردنی ئەم زاراوەیە لە سەردەمی نوێ و لە تێکستە سیاسییەکاندا، بەلای کەمەوە، تەواو وردەکاریی تێدا نەبێت. جیهانی عەرەب کە بەشێکی گەورە لە ناوچەی خۆرئاوای ئاسیاو باکوری ئەفریقا دەگرێتەوە، بێگومان چەند خەسلەتێکی هاوبەشی هەیە بە تایبەتی لە بواری مەسەلە فەرهەنگییەکاندا. گرنگترین فاکتەری هاوبەشی ئەم بوارە زمانی عەرەبییە کە بە درێژایی مێژوو فاکتەری سەرەکی پێکەوە گرێدانی نەتەوەکانی ئەم ناوچەیە بوەو هەمان فاکتەریش چەندین جار هەوڵ و کۆششی عەرەبەکانی وروژاندوە بۆ دروستکردنی قەوارەیەکی سیاسی هۆمۆجین. بەڵام ئایا بە راست ئەم فاکتەرە هاوبەشە بە تاقی تەنیا توانای دروستکردنی یەکێتی سیاسی هەبوە یان دەیبێ؟

لەم بارەیەوە، لەم وتارەدا هەولدەدەین لەگەڵ لێکۆڵینەوەی دوو سەدەی هەولی فیکری و پراکتیکی عەرەبەکان بۆ ئاشکراکردن و دامەزراندنی قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆ نیشان بدەین کە بە شێوەیەکی سەرەکی دەربارەی میحوەری مەفهومی پان عەرەبیزم و ناسیونالیزمی عەرەبی فۆرمەلە بوە، هەروەها هەولدەدەین ئەوەش نیشانبدەین کە ئایا ئەوان لەم هەولەیاندا سەرکەوتوو بوون یان روبەروی ناکامی بوونەتەوە. ویرای سەرنجێک لە پرۆسەی گۆرانی مێژوویی جیهانی عەرەب،

لەم لێکۆڵینەوەیەدا لە ڕووی تیۆریشەوە بیری پان عەرەبیزم دەخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوەوەو لەم ڕووەوە باس لە دەوری چەند فاکتەرێکی وەکو ئاینی و ئیسلام و قەڵەمڕەوە سەربەخۆکانی "دەوڵەت نەتەوە" و ڕوانینی کەمینە ئاینی و مەزهەبی و نەژادییەکان و باسی فاکتەری ئابوریش دەکەین. بەم پێیە

**دەربارەی سەرەتاو سەرچاوەی ناسیونالیزمی عەرەبیش چەند بۆچونێکی جیاواز هەن.**

وێڕای باسکردنی پێگەی ئێستای جیهانی عەرەب، هەوڵدەدەین بەپێی توانا لە ڕووی تیۆریشەوە پێگەی پان عەرەبیزم ڕونبکەینەوە. بێگومان ڕەوتێکی ئاوا بۆ شیکردنەوەی هەر جۆرە هەوڵێکی نوێ بە مەبەستی بەدەستهێنانی یەکێتی لە لایەن عەرەبەکانەوە، دەشێ کاریگەریی هەبێت. ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیە هەرچیەك بێت نابێ خۆمان لەو خاڵە گێل بکەین کە لە حاڵی حازردا بەرژەوەندیی نیشتمانیی وا پێویست دەکات، بنەمای پەیوەندییەکان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی لەسەر بنچینەی پرانسیپی یەکسانیی و ڕێزی بەرامبەر بێ لە نێوان دەوڵەت- میللەتانی دنیاداو کەمتر لەسەر قەوارەی درۆزنانەی نێودەوڵەتی و ئەو واقیعەی کە گرەنتی جێبەجێکردنی نییە بینا بکرێ. هەرچەندە ئەم سیاسەتە بە مەعنای فەرامۆش کردنی ئەو قەوارانە نییە.

## ڕەوتی ئاڵوگۆڕی مێژوویی پان عەرەبیزم

چەمکی پان عەرەبیزم زۆرجار بەهاو واتای ناسیونالیزمی عەرەبی هاتوە. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ کەس ئاماژەیان بۆ جیاوازییە بچوکەکانی نێوان ئەم دوو چەمکە کردوە؛ هەندێ لەوانە پان عەرەبیزمیان بە خەتی سەرەکی فیکری ناسیونالیزمی عەرەب یان ئامانجی سەرەکی ناسیونالیزمی عەرەب لە قەڵەم داوە. هەندێکیشیان لە ئاشکراکردنی ئامانجی ناسیۆنالیزمی عەرەبدا ئاماژەیان بۆ هەردوو میحوەری سەربەخۆیی جیهانی عەرەب و یەکێتی هەموو بەشەکانی لەیەك وڵاتدا کردوە، کە نزیکی و جودایی قبوڵ نەکردنی ئەم دوو چەمکە نیشاندەدات.

دەربارەی سەرەتاو سەرچاوەی ناسیونالیزمی عەرەبیش چەند بۆچونێکی جیاواز هەن. هەندێ لە نوسەرانی عەرەب ڕەگ و ڕیشەی هۆشیاریی سەبارەت بە یەکێتی عەرەب بۆ سەردەمی جاهیلیەتی پێش ئیسلام یان بۆ سەردەمی ڕاپەڕینی شعوبیەت دەگەڕێننەوە. لەبەرامبەر، ئەمەدا ئەلبێرت حۆرانی کە یەکێکە لە ئەندێشمەندە دیارەکانی عەرەب، لەو باوەڕەدایە کە ئەگەرچی هوشیاریی عەرەب سەبارەت بە هاوزمانی و ئەو شانازیانەی کە بەو زمانەوە کردوویانە

پێشینەیەکی مێژوویی هەیەو بۆ بەر لە ئیسلام دەگەڕێتەوەو هەتا بەر لە هاتنی ئیسلامیش لە جۆرێك هەستی هاونەژادیی چوە. ئەم هەستی هاونەژادی و هاوخێزانیە لە دوای دەرکەوتنی ئیسلام و بڵاوبوونەوەی، لەگەڵ هاتنە ناوەوەی عەرەبی زمانە نارەسەنەکان بۆ ناو ئەم خێزانە، لەناوچوە. هەندێکیش لە نێوان ئامادەگی نەتەوەی عەرەب و بانگهێشتکردندا بۆ ناسیونالیزمی عەرەبی جیاوازی دەکەن و ناسیونالیزم بە هوشیاریی نەتەوەی عەرەب سەبارەت بە بوونی جیاوازی ڕۆشنبیریی لەگەڵ نەتەوەکانی تراو پەیوەستی عەرەب بە قەوارەیەکی تایبەت و ئارەزوو بۆ تەرجەمەکردنی ئەم هوشیارییە بۆ بەیاننامەیەکی سیاسی دەزانن (کە ئاواتەکانی خەڵك بۆ سەربەخۆیی و خودموختاری و ژیانی باشتر بەرجەستە بکات) لەم ڕووەوە ئەمانە ناسیونالیزمی عەرەبی بە چەمکێکی تازە دەزانن کە پەیوەندی بە سەدەی نۆزدەوە هەیە.

جۆرج ئەنتۆنیوس کە یەکێکە لە توێژەرە هەرە دیارەکانی عەرەب، جوڵانەوەی وەهابیەتی لە نیمچە دورگەی عەرەب و جوڵانەوەی محەمەد عەلی پاشای لە میسر بە سەرقافڵەی عەرەب چێتی لە قەڵەم داوە. بەڵام بەڕای ئەو جوڵانەوەی نەتەوەیی عەرەب بە شێوەیەکی جدی و ڕێکخراو لە ساڵی ١٨٧٥دا لەگەڵ فۆرمەڵەبوونی ئەنجومەنێکی نهێنی لە بەیروت کەوتەگەڕ، کە سەرەتاکەی دەگەڕایەوە بۆ دامەزراندنی ئەنجومەنی هونەری و زانستی کە لە ساڵی ١٨٤٧دا لە بەیروت دامەزرا.

ئەم ئەنجومەنە نهێنیە، لە دیمەشق و تەرابلوس و سەوەیدا چەند لقێکی هەبوو بەرنامەکەی بریتی بوو لە: سەربەخۆیی سوریاو لوبنان، قبوڵکردنی زمانی عەرەبی وەکو زمانی ڕەسمی ئەو وڵاتانە، هەڵگرتنی سانسۆرو لابردنی قاڵبەکانی ئازادی ڕادەربڕین، بەکارنەهێنانی سەربازی خۆماڵی لە دەرەوەی سنوری سوریاو لوبنان. بەرەبەرە چالاکی ئەم ئەنجومەنە کەم بۆوەو لە ساڵی ١٨٨٥دا تەقریبەن لەناوچوو. هەندێك بۆچونەکەی ئەنتۆنیوس ڕەت دەکەنەوەو باوەڕیان وایە کە ئەگەرچی ساڵانی دەوروبەری ١٨٧٥ لوتکەی هەستی نەتەوەیی عەرەبی بە خۆیەوە دیوە، بەڵام هەتا سەرەتای سەدەی بیست، هیچ جوڵانەوەیەکی سیاسی گرنگ و بەرچاو لە ئارادا نەبوە کە ناسیونالیزمی کردبێ بە سەرچاوەی کارکردنی. بەم پێیە زۆربەی ئەو نوسەرانەی لەم بارەیەوە شتیان نوسیوە باوەڕیان وایە کە ڕونترین هەست دەربڕینی ناسیونالیزمی عەرەب بۆ یەکەم جار لە "طبایع الاستبداد"ی عەبدولڕەحمان کەواکبیدا بەدی دەکرێ کە لە ساڵی ١٨٩٨دا لە میسر بڵاوبۆوە. ئەم نوسەرە سورییە کە بە یەکەم بیریاری ڕەسەنی بڵاوکەرەوەی بیری عەلمانی یەکێتی عەرەب ناسراوە. عەرەبەکانی بۆ جیابونەوە لە تورکەکان و هەوڵدان لە پێناوی یەکێتیدا هان دا، وێڕای جیاوازی

مەزهـەبیان. كـەواكبی لـە كتێبـی (ام القـری)دا داوای گەڕانـــەوەی خەلافـــەت دەكـــات بـــۆ سەرچاوە سەرەكیەكەی كە لە ڕوانگەی ئەوەوە سەرچاوەكەی لای عەرەبە.

## پان عەرەبیزم، كاردانەوەیەك لە بەرامبەر پان توركیزمدا:

بە جیا لەوەی كە بیری یەكێتی عەرەب و عەرەبچێتی لە كەیەوە دەستی پێكرد، دەبێ لە ئـاوابوونی دەسـەڵاتی حكومەتی عوسمانیدا بۆ ڕەگ و ڕیشە سیاسـی و كۆمەڵایەتییـــەكانی دەركـــەوتن و گەشـەكردنی ئـەم بـیرە بگـەڕێین. لـە سـەرەتای سـەدەی شـانزەدا تەقریبـەن هـەموو وڵاتـە عەرەبـەكان كەوتنـە ژێـر ڕكێفـی توركـە عوسمانیەكانەوەو لەناو دەوڵـەتی عوسمـانیدا توانەوە. جەماوەری عەرەب بە درێژایی ماوەی دەوڵـەتی عوسمـانی هـەتا سـەرەتای سـەدەی بیست لـە بەرامبـەر توركـەكاندا هەسـتیان بـە بێگانـەیی نـەدەكردو لـە یـەكێتی ناوچـە موسـڵمان نشـینەكانی تـورك و عـەرەب ڕازی بوون و بـە ڕاسـتی سـوڵتانی عوسمانییـان بـە فـەرمانڕەوای موسـوڵمانان دەزانـی. عوسمانیـەكانیش لە بەرامبـەر عـەرەبدا ڕەگـەز پەرستیان بەكارنـەدەهێناو فـەرمانڕەوای هـەر ناوچەیـەكی عـەرەبیان لـە خـەڵكی ناوچەكـە دادەنا كە بـە نـەقیب نـاودەبرا، هـەتا كۆتـایی سـەدەی هـەژدەش هەسـتی پابـەندیی بـە (دار الاسـلام)ەوە بەسـەر هەسـتی پابـەندیی نیشـتمانی بـۆ فەرهـەنگ و سـەرزەمینی تایبـەتیدا زاڵ بـوو. كۆتاییـەكانی سـەدەی حـەڤدە سـەردەمی ئـاوابوونی دەوڵـەتی عوسمـانی و قەیرانـە توندەكـانی بـوو، ئـەو قەیرانانـەی كـە هـەموو لایەنـەكانی ژیـانی كۆمەڵایەتییان گرتـەوە. ئـەم قەیرانانـە فشـاری ئاشـكرای فەرمانڕەوایانی بەدوادا هـات بـۆ سـەر ڕەعیەتـەكانی دەوڵـەتی عوسمانی و بە تایبـەتی ئـەو ڕەعیەتانـەی تـورك نـەبوون لـەوانیش عـەرەب. لـەم ماوەیـەدا بـیری پـان ئیسـلامیزم وەكـو ئـامرازێك بـۆ پاراسـتنی دامودەزگـای ڕەسمـی فـەرمانڕەوا لـە قەڵـەم دەدرا. چاكسـازییەكانی سـوڵتان عەبدولحـەمیدی دووەمیـش كـە بـە "تنظیمـات" ناسـراوە، هیـچ دەوری نـەبوو. ڕاپەڕینـە جیاجیـاو ناوبـەناوەكان لـە قەڵەمڕەوی عوسمانیدا گوزارشتیان لەو وەزعە دەكرد.

كەواكبی لە كتێبی (ام القری)دا داوای گەڕانەوەی خەلافەت دەكات بۆ سەرچاوە سەرەكیەكەی كە لە ڕوانگەی ئەوەوە سەرچاوەكەی لای عەرەبە.

شۆڕشـی توركـە لاوەكـان و گەڕاندنـەوەی دەسـتور لـە سـاڵی ١٩٠٨دا عـەرەبی بـە

ئەنجامدانی ریفۆرم و ئەگەری سودوەرگرتن لە ئازادی ئومیدەوار کرد. لەم شۆرشەدا، عەرەبەکان ئومیدیان لەسەر تورکە لاوەکان هەلچنی و مەلبەندی جولانەوەی نەتەوەیی عەرەب کە پیشان لە تاراوگە فۆرمەلە ببوو گویزرایەوە ئەستەمبول. لەو کۆبوونەوە گەورەیەدا کە لە شەعبانی ١٩٠٨دا لە گەرەکی عەرەبەکان لە ئەستەمبول بەریوە چوو، دامەزراندنی یەکەم ریکخراو بەناوی (الاخاء العربي العثماني) راگەیەنرا، کە تا رادەیەك ریکخراویکی جەماوەری بوو. ئەم ریکخراوە رۆژنامەیەکی تایبەتی بلاوکردەوەو تەقریبەن لقی لە هەموو ولایەتەکاندا کردەوە. سەرانی ریکخراوەکە، پان عوسمانیزم و بوونی نەتەوەی عوسمانیان قبول کردو ئەوەیان راگەیاند کە نەتەوەی عوسمانی لە نەتەوەی جۆراوجۆر پیکهاتوە کە عەرەب گرنگترینیانە. لەبەرنامەی ئەم ریکخراوەدا ئاماژە بۆ سەربەخۆیی یان خودموختاری نەتەوەی عەرەب نەکرابوو. لە نیشانەکانی ناسیونالیزم لە بەرنامەی ئەم ریکخراوەدا تەنها دەتوانرێ ئاماژە بۆ داوای یەکسانی نەتەوەیی و پەرەپیدانی فیرکردن بە زمانی عەرەبی و ریزگرتن لە نەریتی عەرەب بکرێ.

راگەیاندنی بەرنامەی تورکە لاوەکان لە پاییزی ١٩٠٨دا گورزیکی جدی لە بۆچوونی ناسیونالیستەکانی عەرەب وەشاند. تورکەکان لەو بەلینانە پاشگەزبوونەوە کە لە کۆنگرەی ١٩٠٧دا لە پاریس بە کەمایەتیەکانیان دابوو. کوشتاری ئەرمەنەکان وەکو سەردەمی عەبدولحەمیدی دوەم بەردەوام بوو و ئەنجومەنە عەرەبییەکان و ئەنجومەنی گروپەکانی تر داخران و لە سالی ١٩٠٩دا ریکخراوی "الاخاء العربي العثماني"ش بە نایاسایی لە قەلەم درا. تورکەکان بە زۆرەملی سیاسەتی بە تورك کردن– Turkification یان بەسەر ئەو نەتەوانەدا پەیرەو کرد کە تورك نەبوون. قوتابخانە میللیەکان داخران و زمانی تورکی وەکو تەنها زمانی رەسمی راگەیەنرا. گۆرانی سیاسەتی تورکە لاوەکان کە خوازیاری بالادەستی فەرهەنگی تورك بوون بەسەر تەواوی قەلەمرەوی عوسمانیدا، بوو بە هۆی ئەوەی عەرەبەکانیش تەئکید لە شوناسی عەرەبی خۆیان و بەدەستهینانی سەربەخۆیی نیشتمانی بکەنەوە. لەم روەوە هەندیك باوەریان وایە کە بە راستی تۆوی جولانەوەی جوداخوازی عەرەب لە خاکی ناسیونالیزمی تورکدا چەکەرەی کردوە.

> **راگەیاندنی بەرنامەی تورکە لاوەکان لە پاییزی ١٩٠٨دا گورزیکی جدی لە بۆچوونی ناسیونالیستەکانی عەرەب وەشاند.**

## كاریگەریی دوو لایەنەی خۆرئاواو ڕۆڵی كەمینەی عەرەبی مەسیحی:

فاكتەرێكی دیكە كە هوشیاری نەتەوەیی و نیشتمانی عەرەبی وروژاند ڕوبەڕوو بوونەوەی جیهانی عەرەب بوو لەگەڵ خۆرئاوادا، چ لە ڕوانگەی بەربەرەكانی ئیمپریالیزم و چ لە ڕووی ئاشناییەوە بە بیرو چەمكە سیاسی و كۆمەڵایەتیەكانی ئەو ژیارە نوێیە. هەندێك باوەڕیان وایە كە بەربەرەكانی میسرییەكان لە بەرامبەر هێرشی ناپلیۆندا لە ساڵی ١٧٩٨دا بوو بە هۆی بێداركردنەوەی هەستی نەتەوەییان و لە مافی حوكمڕانیی سەربەخۆ بەسەر وڵاتەكەیاندا ئاگاداری كردنەوە. بەهەرحاڵ ئەو سەربەخۆییەی كە میسر لە دوای ئەو هێرشەو پاش دەسەڵات پەیداكردنی محەمەد عەلی پاشاو بنەماڵەی خدێوی، لە بەرامبەر (بابی عالی)دا بەدەستی هێنا یەكەم بەڵگەیان دەركەوتنی یەكێتی عەرەب بوو. بەڕای ئەلبێرت حۆرانی، محەمەد عەلی بە نیازی دامەزراندنی مەملەكەتی پاشایەتی عەرەب نەبوو بەڵام بوو بە هۆی فراوانكردنی قەڵەمڕەوی عەرەبەكان. لە دوای محەمەد عەلی ئیسماعیلی كوڕی هەوڵی دا كە لە بەرامبەر ئیمپریالیزمی فەرەنسەو بەریتانیادا بوەستێ، بەڵام لە ساڵی ١٨٧٩دا بە گوشاری دەسەڵاتدارانی ئەوروپا لەسەر كار لابرا. لەوە بەدواوە مەڵبەندی سەرەكی بەرگری سوپایەك بوو كە ژمارەیەكی زۆر لە ئەفسەرەكانی میسری بوون. یەكەم جوڵانەوەی ناسیونالیستی میسر بە مەبەستی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی و دەركردنی ئیستیعمار لە ساڵی ١٨٨١دا فۆرمەڵە بوو بە سەركردایەتی سەرهەنگ عوڕابی پاشا. ئینگلیزەكان ئەم جوڵانەوەیەیان سەركوت كرد. لە كۆتایی سەدەی نۆزدەشدا جوڵانەوەیەكی دیكەی ناسیونالیستی بە سەركردایەتی مستەفا كامیل دەستی پێكرد. ئەم جوڵانەوەیە بوو بە هۆی فراوانبوونی چاپەمەنی و بە تایبەتی بوو بە هۆی فۆرمەڵە بوونی حزبی سیاسی كە بە هەنگاوێك بەرەو پێشەوەچوونی ناسیونالیزمدا لە قەڵەم دەدرا. بەم پێیە قاهیرە بوو بە پەناگەی ئەو ناسیونالیستە عەرەبانەی كە لەناوچە عەرەب نشینەكانی دیكەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا پۆلیس بە شوێنیاندا دەگەڕا.

زۆر كەس یەكەمین ئاشنایی فراوان و سیستماتیكی جیهانی عەرەب لەگەڵ بیرو مەفهومی ناسیونالیزمدا وا دەبینن كە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە بەدواوە لە چالاكی فەرهەنگی مەسیحیەكانی ناو قەڵەمڕەوی عوسمانیەوە سەرچاوەی گرتوە. مەڵبەندی زۆربەی ئەم چالاكیانە سوریا بوە. هەروەها هەندێك باوەڕیان وایە كە زانكۆی ئینجیلی ئەمریكایی لە بەیروت و زانكۆی یەسوعی (فەرەنسایی) سین جۆزیف بەیروت– كە گروپە مژدەبەرە مەسیحیە ئەمریكایی و فەڕەنسیەكان ساڵی ١٨٦٦ یەكەمیان و ساڵی ١٨٧٤

دوەمیان دامەزراند، لە وروژاندنی راپەرینی عەرەبدا زۆر دەوریان هەبوە. نەوەیەك لە رابەرانی یەکەمی رەوتی فکری ناسیۆنالیزمی عەرەبی (بە مەسیحی و موسلمانەوە) لەم زانکۆیانەدا پەروەردە ببوون و ئەوانیش بوون کە بۆ دەربرینی مەفهومە تازەکانی ناسیونالیزم، چەند زاراوەیەکی تازەی وەکو "القومیة" و "الوطنیة" و زاراوەی دیکەیان داتاشی یان لە زەخیرەی کۆنی زمانی عەرەبییەوە وەریانگرت و رەواجیان پیدان. لەو بیریارانەش دەتوانین ئاماژە بۆ (بتروس بوستانی، ناسیف یازجی و نەجیب عازوری) بکەین. بوستانی (١٨١٩-١٨٨٣) و یازجی (١٨٠٠-١٨٧١) پیشرەوترین ئەندیشمەندانی ئەو سەردەمەیان کۆکردەوە. لە سالی ١٨٥٧دا پەیرەوانیان ئەنجومەنی زانستی سوریایان دامەزراند کە بۆ یەکەمجار لە میژووی سوریادا، بە چاوپۆشی لە پابەندیی مەزهەبیان رۆشنبیرانی عەرەبی یەکخست. ئەو ئەنجومەنەی کە تیایدا لە دوای ماوەیەك باس و خواسی تایبەت بە نویکردنەوەی ژیانی رۆشنبیری جیگای خۆی بۆ بانگهیشتی گەرم و گوری خەبات لە پیناوی سەربەخۆییدا چۆلکرد. نەجیب عازوری-ش لەگەڵ کەواکبیدا (کۆمەلی عەرەب)یان لە پاریس دامەزراندو مانگنامەیەکیان بە ناوی (استقلال العرب) بڵاوکردەوە کە زۆرجار تەئکیدی لە جیاوازییە نەژادی و فەرهەنگی و سیاسیەکانی نیوان عەرەب و تورکەکان دەکردەوەو جاری وابوو جەختی لەوە دەکردەوە کە عەرەب لە تورك باڵاترەو پیویستە عەرەب لە دەولەتی عوسمانی جیابیتەوە. دروشمی عازوری ئەوەبوو کە وڵاتە عەرەبییەکان بۆ عەرەب بیت و عەرەبی بۆ راپەرین و جیابوونەوە لە دەولەتی عوسمانی و دامەزراندنی دەولەتی سەربەخۆ هان دەدا. لەنیو مەسیحیەکاندا ئەگەرچی گروپیکی بچوك لە مارۆنیەکانی لوبنان ناسیونالیزمیان لە قالبیکی ئاینیدا تەرح دەکرد، بەڵام ئەمانە زیاتر لەسەر بنەمای زمانی عەرەبی کاریان بۆ ناسیونالیزم دەکرد.

## هەولە ناکامەکانی عەرەب لە پیناوی یەکیتیدا:

بەهەرحاڵ، ئەنجامی زۆرداریی تورکەکان ئەوەبوو کە عەرەبەکان لە سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانیدا مەیلیان بەلای ئینگلیزەکاندا هەبیَو شەریف حسین "شەریفی مەککە" لە دوای نامەنووسین بۆ حکومەتی بەریتانیاو بە بەلینی پشتیوانی کردنی ئینگلیز لە عەرەب لە سالی ١٩١٦دا لە دژی تورکەکان راپەری. حسین کە لە خەیالی دامەزراندنی دەولەتیکی سەربەخۆی عەرەبیدا بوو، لە هەمان سالدا خۆی بە پاشای نەتەوەی عەرەب لەقەلەم دا. لەگەڵ ئەوەشدا بەریتانیاو فەرەنسە بە رەسمی تەنها ناونیشانی پاشای حیجازیان پیرەوا بینی، بەپیی ریکەوتننامەی سایکس- پیکۆ لە هەمان سالدا باقی ناوچەکانی تری عەرەبیان

خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە. بەم شێوەیە جوڵانەوەی ناسیونالیستی عەرەب لەت لەت بوو. لێرە بەدواوە ناسیونالیزمی عەرەب ئاراستەی خۆی گۆڕی بۆ دژایەتی کردنی خۆرئاوا، چونکە خۆرئاوا بە نفوزی خۆی و دامەزراندنی دەولەتی بچوك و لاواز، عەرەبی لەو یەکێتییە مەحروم کردبوو کەبەلێنی پێدابوو. هێشتا هاتوهاواری ریکەوتننامەی سایکس- پیکۆ کپ نەبووبوو کە ریکەوتنی ئینگلیزو جولەکەکان بۆ دامەزراندنی دەولەتی جولەکە لە فەلەستین بەپیی (بەلینی بەلفۆر) بە تەواوی عەرەبی نیگەران و نائومید کرد. گرنگترین کاری ناسیونالیستەکانی عەرەب لەم ماوەیەدا هەتا جەنگی دووەمی جیهانی لە سێ میحوەردا بوو: بەدەستهینانی خودموختاری لە ریگەی راپەرین و خۆپیشاندان و هاوکاری نەکردنی داگیرکەرانەوە، بە زیندویی هیشتنەوەی بیری یەکیتی عەرەب، پشتیوانی کردن لە عەرەبی فەلەستین لە روبەروبونەوەی کۆچەرانی جولەکەو کاری دەستدریژکارانەی زایۆنیەکاندا.

لەم ماوەیەدا هەندێ لە سەرانی عەرەب - بە زۆری بنەماڵەی هاشمی- لە عیراق و ئوردن لە پیناوی دامەزراندنی یەکیتیەك کە لە ولاتە عەرەبیەکان پیکهاتبێ چەند هەنگاویکیان نا کە سەرکەوتنیان بەدەست نەهینا، لەو هەنگاوانەش نەخشەی فەیسەلی یەکەم پاشای عیراق بوو بۆ دامەزراندنی یەکیتیەك کە لە ولاتانی عیراق، سوریا، ئوردن، فەلەستین، حیجاز پیك بیت لە دوای مردنی فەیسەل براکەی واتە عەبدوللای پاشای ئوردن، دریژەی بە نەخشەکەی دا: بەلام دژایەتی کردنی عەرەبستانی سعودی و میسرو کارەکانی نوری سەعیدی سەرۆك وەزیرانی عیراق بە مەبەستی بەدەستهینانی پشتیوانی بەریتانیا سەبارەت بە دامەزراندنی یەکیتیەك کە عیراق، سوریا، فەلەستین لە خۆی بگرێ کە دەسەلاتی عەبدوللایان دەخستە مەترسیەوە بوون بە هۆی شکستهینانی نەخشەکە. نەخشەی عەبدولعەزیز ئال سعودیش لە سالانی ١٩٣٦-١٩٣٧ بۆ دامەزراندنی یەکیتیەکی عەرەبی بە سەرکردایەتی خۆی لە کاریگەری نەمانی نەخشەکانی پیش خۆیدا دەوری هەبوو.

**هیشتا هاتوهاواری ریکەوتننامەی سایکس- پیکۆ کپ نەبووبوو کە ریکەوتنی ئینگلیزو جولەکەکان بۆ دامەزراندنی دەولەتی جولەکە لە فەلەستین بەپیی (بەلینی بەلفۆر) بە تەواوی عەرەبی نیگەران و نائومید کرد.**

لـە دوای دووەم جـەنگی جیـهانی، لـە ئـەنجامی کۆششـی پەراگـەندەی ناسیونالیستەکاندا ژمارەیـەکی زۆر لـە ولاتـە عەرەبییەکان سەربەخۆییان بەدەست هینا. بەلام ئەم کارە نەك تەنها ناسیونالیستەکانی عەرەبی یەکنەخست بەلکو زیاتر بـوو بە هۆی پارچەپارچە بـوون و ناوچـەیی بوونیـان، بۆیـە عەرەبـەکان لـە ناوەراسـتی چلەکاندا ئەزمونیکی دیکەیان تـاقی کـردەوە، لـە چـەند کۆبونەوەیـەکی بـەراییدا لـە ئەسـکەندەریە لـە ١٧ی ئوکتۆبـەری ١٩٤٤ بریـاری دامـەزراندنی (جامیعـەی عەرەبی)یان دا. ئەم جامیعەیە بـە مەبەسـتی داکۆکـی لـە سـەربەخۆیی ئەندامـەکانی و فەراهەم کردنی ئاسانکاری بۆ هاوکـاری لـە نیوانیـاندا لـە بـواری ئـابوری و فەرهـەنگی کۆمەلایـەتیدا لـە ٢٢ی مـارتی ١٩٤٥دا بـە رەسمی دامەزرا. ئەندامە دامەزرینەرەکانی ئەم ریکخـراوە بریتـی بـوون لـە: میسـر، سـوریا، عیراق، لوبنـان، ئوردن، عەرەبستانی سعودی، یەمـەن، هـەر ولاتیکـی سـەربەخۆی عـەرەبی دیکـەش دەیتوانـی لـەو ریکخـراوەدا ببیتـە ئەندام. جامیعـەی عـەرەبی لـە دەرەوەی خـۆی هیـچ دەسـەلاتیکی نـەبوو و جیبـەجیکردنی بریارەکـانی تەنـها بـۆ ئەندامـەکانی خـۆی ئیجبـاری بـوو. بـە دەربرینیکـی دیکـە، ناسـیونالیزمی عـەرەب توانـای یەکخسـتنی عـەرەبی نـەبوو. خـالیکی گرنـگ کـە جامیعـەی عەرەبی بەپیی پـەیرەوی نـاوخۆی خـۆی مـۆری تەئیدکردنی لیدا، قبولکردنی جودایـی ولاتـە عەرەبیـەکان بـوو لـە یـەکتری. لەبەرئـەوە پەیرەوی ناوخۆی جامیعـەی عـەرەبی سـەربەخۆیی ولاتـە ئەندامـەکانی تـەئید دەکـردو پیویسـتی جیبـەجیکردنی بریارەکـانی بـە دەنگدانـی گشـتی ئەندامەکانـەوە دەبەسـتەوە لەسـەر ئـەو بریارانـە ریگـەی بـە دەسـتیوەردان لـە کاروبـاری نـاوخۆی ولاتـە عەرەبیـەکان نەدەدا.

> **فاکتەریکی گرنگی دیکە کە سەرلەنوێ بوو بە هۆی پەیوەستی عەرەب و لەدایکبوونی ناسیونالیزمیکی توندرەو بریتی بوو لە دامەزراندنی دەولەتی ئیسرائیل لە سالی ١٩٤٨دا**

فاکتـەریکی گرنگی دیکـە کـە سـەرلەنوێ بـوو بـە هـۆی پەیوەسـتی عـەرەب و لـەدایکبوونی ناسـیونالیزمیکی توندرەو بریتـی بـوو لـە دامـەزراندنی دەولـەتی ئیسـرائیل لـە سـالی ١٩٤٨دا، مەسـەلەی فەلەسـتین کـە وەکـو مەلەسـەیەکی هاوبەشـی هـەموو عـەرەب و موسـلمانان لیکدرایـەوە بـوو بـە هـۆی بیدارکردنـەوەی ویژدانـی گشـتی و هەسـتی هـاودەردی و پەیوەسـتی لـە نیـوان عـەرەبدا

بزواند. لەو رۆژانەدا (حركة القومیین العرب)یش فۆرمەلە بوو كە جولاّنەوەیەك بوو خویندكارانی زانكۆی ئەمریكایی لە بەیروت دایانمەزراند. بەرای ئەو خویندكارانە كە زیاتر فەلەستینی بوون، یەكیتی هەموو عەرەب سەرەتای ئازادی فەلەستین بوو.

بەهاتنە سەركاری جەمال عەبدولناسر لە سالی ١٩٥٢دا لە میسرو دەستپیكردنی كارەكانی، هاوزەمان لەگەلّ شكست هینانی پان عەرەبیزمی لیبرال و موحافیزكاردا، ناسر وەكو گوتەبیژو رەمزی رەوتی توندرەوی پان عەرەبیزم ناسرا. ناسر لەگەلّ خۆمالیكردنی كەنالی سویس لە سالی ١٩٥٦دا لە راستیدا بوو بە كەسایەتی سەرەكی لە جیهانی عەرەبدا، تا كار گەیشتە ئەوەی (ناسریزم) كە یەكیتی عەرەبی بە سۆسیالیزمەوە گریدابوو هاوتا بە ناسیونالیزمی عەرەب تەعبیری لیدەكرا. كەسایەتی دیارو خۆشەویستی لە رادە بەدەری ناسر لە جیهانی عەرەبدا، بوو بە هۆی ئەوەی كە هەتا شەستەكان فراوانبوون و بەهیزبوونی بزوتنەوە ناسیونالیستیەكان بەردەوام بێ دواجار بوو بە هۆی پتەوبوونی یەكیتی عەرەب. یەكەم هەنگاوی عەمەلی ناسر بۆ یەكیتی عەرەب بریتی بوو لە یەكخستنی

میسرو سوریا لە سالی ١٩٥٨داو دامەزراندنی كۆماری یەكگرتووی عەرەب كە بە شیوەیەكی چاوەروان نەكراو لەلایەن عەرەبەوە پشتیوانی لیكرا. هەرچەند ئەم یەكگرتنە زیاتر خواستی حزبی بەعسی سوریا هەلومەرجی ئەوكاتە بوو. حزبی بەعس كە تەنها لە چوارچیوەی سوریادا نەبوو لەو حزبە ناسیونالیستە توندرەوانەیە كە باوەری وایە هەركەسێ بە زمانی عەرەبی قسە بكات، بە چاوپۆشی لە مەزهەب و قەومیەتەكەی بە عەرەب حساب دەكریێ. ئامانجی ئەم حزبەش بریتی بوو لە سەقامگیربوونی كۆمەل یان دەولەتی عەرەب. حزبی بەعسیش وەكو ناسر هەلی دەدا كە سوسیالیزم بە ناسیونالیزمی عەرەبەوە گری بدات. بەهەرحال بە یەكگرتنی میسرو سوریا زۆر لە عەرەبەكان چیتر یەكیتیان بە خەونیك نەدەزانی و زیاتر بە ئایندە ئومیدەوار بوون. بەلاّم شكست و هەلوەشانەوەی ئەم یەكگرتنە لە سالی ١٩٦١دا، دوبارە نائومیدی بۆ عەرەب هینایەوە.

> شەری عەرەب-ئیسرائیل لە سالاّنی ١٩٦٧و ١٩٧٣دا بۆ ماوەیەك عەرەبەكانی لەیەك نزیك ختستەوە

شەری عەرەب-ئیسرائیل لە سالاّنی ١٩٦٧و ١٩٧٣دا بۆ ماوەیەك عەرەبەكانی لەیەك نزیك خستەوە، بەلاّم شكستی عەرەب لەم شەرانەدا نیشانەی بیتوانایی

ناسیونالیزمی عەرەبی بوو. جگە لەمەش، وازهینانی میسر لە رابەرایەتی جیهانی عەرەب و ئیمزاکردنی ریکەوتننامەی کامپ دیڤید لەگەڵ ئیسرائیلدا لە حەفتاکاندا، جیاوازی هەلویستەکانی عەرەب و گروپ بەندیان لە بەرامبەر دەستدریژی عیراق بۆ سەر ئیران لە سالی ١٩٨٠دا، هیرشی عیراق بۆ سەر کویت کە خۆی هەلگری دروشمی یەکیتی عەرەب بوو، هەروەها پشتیوانی زۆربەی ولاتەکانی کەنداوی فارس لە دەستیوەردان و بوونی هیزەکانی خۆرئاوا لە ناوچەکەدا لە بەرامبەر عیراقدا، ویرای ئەمانەش ئیمزاکردنی ریکەوتنی ئوردن و راف لەگەڵ ئیسرائیلدا لە نەوەدەکاندا، هەموو ئەمانە گوزارشتیان لە ئاوابوونی پان عەرەبیزم کردو بە خیرایی متمانەی ناسیونالیزمی عەرەبیان نەهیشت.

### بنەما فیکرییەکانی پان عەرەبیزم:

زۆر لە بیریارانی عەرەب چەند بەرهەمیکیان سەبارەت بە رونکردنەوەی بنەماکانی پان عەرەبیزم بەجیهیشتوە کە لەوانەش دەتوانری ئاماژە بۆ (تەهتاوی، کەواکبی، مستەفا کامیل، ساتع ئەلحوسەری، عەبدول رەحمان بەزاز) بکری.

خەمی گەورەی ئەم بیریارانە دەشی لە دوو بابەتدا کورت بکریتەوە، واتە شیوەی رونکردنەوەی ئیسلام و ناسیونالیزمی عەرەب و پەیوەندی دەسەلاتی نیشتمانی (ناسیونالیزمی ناوچەیی) لەگەڵ پان عەرەبیزمدا.

تەهتاوی (طهطاوی) ١٨٠١-١٨٧٣ یەکیکە لە بیریارە سەرقافلەکانی عەرەب کە بۆچوون و تیۆرەکانی لە بیدارکردنەوەی عەرەبدا پشکیکی زۆریان هەبوە. تەهتاوی بەردەوام لە بەرهەمەکانیدا زاراوەی (وطن) و (حب الوطن)ی بەکاردەهیناو باوەری وابوو کە دەبی میحوەرو مەلبەندی سەرەکی عەشق و دلسۆزی و وەفاداری عەرەب (وطن) بی.

بەر لە تەهتاوی مەفهومی ناسیونالیزم لەلای میسرییەکان هیندە بەکارنەدەهات. تەهتاوی دەیویست ئەوە بسەلمینی کە ناسیونالیزم لەگەڵ ئیسلامدا ناکۆك نیە. لەگەڵ ئەوەشدا بۆچوونی سەبارەت بە (العروبة) تەمومژاوی بوو. لەبەرئەوەی لە مەبەستەکەیدا تەنها رەچاوی نەتەوەی میسری کردبوو. کەواکبی باوکی ناسیونالیزمی عەرەبیش نیشتمان-ی لە (العروبة) بە پیرۆزتر دەزانی و خوازیاری یەکیتی عەرەب بوو بە بی حساب کردن بۆ جیاوازییە مەزهەبیەکانیان. کەواکبی لەگەڵ هاوبیرانیدا بنەمای ئایدیۆلۆجی نویکردنەوەی ژیانی میللی عەرەبی دارشت. مستەفا کامیلی ئەندیشمەندی میسریش کە جولانەوەی نیشتمانی لە میسردا بە ناوی ئەوەوە دەستپیدەکات لەناو عەرەبدا دەوری بالای هەبوە سەبارەت بە بایەخپیدانی چەند مەفهومیکی وەکو نیشتمان و نیشتمان

پەروەری، کامیل ریبازەکەی خۆی بە "وطنیة" نیشتمانپەروەری نـاوبردو بـۆ سـەربەخۆیی سودی لە ئامانجی ناسیونالیزمانە وەردەگرت. بەڵام مەبەستی لە نیشتمان تەنها میسر بوو، هەرچەندە باوەری وابوو ئاین پـەروەری لەگـەڵ نیشتمان پەروەریدا ناکۆك نیە، بەڵام ئاینی بە ئامرازیك دەزانی بۆ خزمەت کردنی نیشتمان.

سـاتع ئەلحوسـەری بـاوەری وابـوو کـە هەرکەسێ بە زمانی عـەرەبی قسـە بکـات یـان مەیلی بەلای عەرەبدا هەبێ بە عـەرەب حساب دەکـرێ. بـە رای سـاتع ناسـیونالیزمی عـەرەبی هەرچـەندە زیـاتر لـە ئـاین دوربکەویتـەوە سـەرکەوتووش دەبیـت. ئەلحوسـەری لـە داکۆکیکردن لە قەومیـەتی عەرەبدا ئەوەندە زیادەرەوی کرد کە رایگەیاند، عەرەبایـەتی لـە پیـش هـەموو شـتیکەوەیە و ناونیشـانی "العروبـة اولا"ی بـۆ کتیبەکـەی خۆی هەلبژارد. ئەلحوسەری باوەری وابوو کە ئەگـەرچی ئاین توانای دروستکردنی جۆش و خرۆشـی هەیـە، بـەڵام ئاینـەکان لـە روو ناسـیونالیزمەوە وەك یـەك نـین، ئاینـە نەتەوەییـەکان نـەك تەنها کیشـەیەك دروست ناکـەن بـەلکو دەبنـە هـۆی بـەهیزبوونی ناسیونالیزمیش. بـەڵام ئـاینی جیـهانی وەکـو ئـاینی ئیسلام دژی ناسیونالیزم دەوەستنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەلحوسەری لەو کتیبانەدا کە لەسەرەتادا نوسیونی ئیسلام و ناسیونالیزمی وا نـەدەبینی کـە پیکـەوە هەلناکـەن. عـەبدولرەحمان بـەزازی بیرمـەندو سیاسـەتمەداری عـیراقیش وەکـو ئەلحوسـەری زمانی بە یەکەم پایـەی بـاوەری میللی عـەرەب دەزانـی و یـەکیتی عـەرەبی لـە پیـش یـەکیتی ئیسلامیەوە دادەنا. بەڵام ئەلبیرت حۆرانی لەم بارەیەوە باوەری وابوو کە جیابونەوەی ئیسلام لە ناسـیونالیزم بـەو شـیوەیەی کـە تورکـەکان دەستیان داوەتێ کاری کردە نیە، لەبەرئـەوەی کە میژووی عـەرەب لەگـەڵ ئیسـلام هەلشـیلراوەو ئیسـلام فاکتـەری یـەکیتی عەرەب بوە.

> بەپیی تیروانینی ئیسلام، موسولمانان لە هەموو دنیادا یەك نەتەوەن و یەك شوناسی هاوبەشیان هەیە.

بەدەر لـە هـەولی تیۆرسـینە ناسیونالیستەکانی عـەرەب لـە چارەسـەرکردنی ئـەم ناکۆکیـەدا، بـەپیی تـیروانینی ئیسـلام، موسولمانان لە هـەموو دنیادا یەك نەتـەوەن و یـەك شوناسـی هاوبەشیان هەیـە. ئیسـلام ئـەوە دوپـات دەکاتـەوە کـە (زمـان، نـەژاد، رەنـگ) بنـەمای یـەکیتی و ئیمتیـاز نیـە. مورتـەزا موتەهـەری لەگـەڵ رەتکردنـەوەی بـیری ناسیونالیستی عـەرەبدا ئـەوە دەردەبـری کـە لـە قورئـاندا گوتارەکـان زیـاتر رویـان لـە هـەموو خەلکی سەرزەویەو لە هیچ جیگایەکی قورئاندا گوتاری "ایها العرب" یان دەربرینی لەو جۆرە نـەهاتوە. هـەروەها سـەرهەلدانی جوڵانـەوەی ئیسـلامی و ئیسـلامیەکان لاوازی کاریگـەریی

ناسیونالیزمی عەرەبی نیشان دا، رەخنەی توندی کەسانیکی وەکو "حەسەن ئەلبەننا، نەواب سەفەوی، سەید قوتب، محەمەد ئەلغەزالی، مەودودی" لە ناوەوەو دەرەوەی جیهانی عەرەبدا، کە هەلویستی راشکاوانەو بی چەندو چونیان هەبوو لە رەتکردنەوەی جۆرەها ناسیونالیزمی زمانی و قەومیدا، گوزارشتی لەم مەسەلەیە دەکرد. ئیسلامخوازیش لەناو جەماوەری عەرەبدا بەسەر پان عەرەبیزمدا بالادەست بوو، ئەم ئارەزوومەندییە دەتوانری لە فراوانبوونی بزوتنەوە ئیسلامیەکاندا بەدی بکری لەوانەش "ئیخوان موسلمین".

سەربەخۆبوونی ولاتە عەرەبییەکان لە دوای جەنگی دوەمی جیهانی و سەقامگیربوونی دەزگای فەرمانرەوایی و سیستمی دەولەتی نەتەوەیی عەرەبیش پاش ئەوە، مەسەلەیەکی نویی لە بەرامبەر پان عەرەبیزمدا هینایە ئاراوە کە هەندیك بەم جۆرە راڤەیان کرد: لە کاتیکدا کە سەرانی عەرەب بەرژەوەندیی خۆیان و دریژەدان بە ژیانی دەولەتەکانیان وەکو پاراستنی بنەمای فەرمانرەوایی دەبینی. وەکو ئامرازیکیش بۆ شەرعیەتدان بە دەسەلاتی خۆیان پیویستیان بە پان عەرەبیزم و یەکیتی خوازیی هەبوو. لە لایەکی ترەوە، ناسیونالیستە ناوچەییەکانیش لە بەرامبەر لایەنگرانی یەکیتی عەرەبدا بەلگەی ئەوە دەهیننەوە کە لەنیو عەرەبیشدا چەند نەتەوەیەکی دیاریکراو هەن و بە پیی ئەو بۆچونە داوای سەربەخۆیی ولاتەکەی خۆیان و جیابوونەوەیان لە نەتەوەی عەرەب دەکرد، لەوانەی ئەو بەلگەیە دەهیننەوە (ئەنتوان سەعادەو تەها حوسین)ن سەرهەلدانی ناسیونالیزمی ناوچەییش وەکو فیرعەونیزمی میسرو فینەقیزمی لوبنان و پان سوریزم دەتوانری وەکو چەند نمونەیەك بۆ روبەروبونەوەی پان عەرەبیزم لە قەلەم بدری. ناکۆکی نیوان دەسەلاتی نیشتمانی و پان عەرەبیزم بە پشتیوانی و دوپاتکردنەوەی جامیعەی عەرەبی لەسەر سەربەخۆیی ئەندامەکان، بە کیش کرایە ناو جامیعەکەشەوە. لەم روەوە ئەم جامیعەیەش لە ریبەری کردنی عەرەبدا بەرەو یەکیتی سەرکەوتنی بەدەست نەهینا.

بوونی کەمینە نەژادی و مەزهەبیەکانی وەکو (کورد، بەربەرەکانی جەزائیرو مەراکش، مارۆنیەکانی لوبنان و سوریا، قیبتیەکانی میسر، شیعەکان، هەروەها ئەفریقاییە مەسیحیەکان و رەش پیستەکانی باشوری سودان)یش دەتوانری وەکو کۆسپی بەردەم پان عەرەبیزم لەقەلەم بدری.

هەروەها جیاوازی و درزی قوولی نیوان زمانی عەرەبی فەسیح و زمانی عامیەو قسەکردن و هاتنە ناوەوەی زمانە بیانیەکان بۆ ناو زمانی عەرەبی، بە تایبەتی لە ولاتانی باکوری ئەفریقا، بۆتە هۆی مشتومر لەسەر ئەو بۆچونەی کە زمانی عەرەبی بە پایەیەکی پتەوی یەکیتی دادەنی. جیاوازی ئاستی

ئابوریش لە نیوان ولاّتە عەرەبییەکاندا بە تایبەتی لەگەڵ زیادبوونی بەهای نەوت لە حەفتاکاندا بە شیوەیەکی کاریگەر یەکیتی عەرەبی هەلوەشاند. جگە لەوەش ناکۆکیە جۆراوجۆرەکان لەسەر سنور حەزنەکردنی عەرەب بە یەکیتی نیشاندەدات و داهاتووی یەکیتی عەرەب لیڵ دەکات.

دەرکەوتنی یەکیتیە ناوچەییەکانیش وەکو ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی فارس ١٩٨١، یەکیتی خۆرئاوای عەرەبی ١٩٨٩ و ئەنجومەنی هاریکاری عەرەب لە کۆتایی هەشتاکاندا، نیشانەی سەرنەکەوتنی پان عەرەبیزم بوە هەروەها ریگایەك بوە بۆ هەلاّتنی لە مەیلی فەرمانرەوایی نەتەوەیی و پان عەرەبیزم. بەهەرحال شکستی پان عەرەبیزم لە بەدەستهینانی ئەنجامی مەلموسدا بە دریژایی سەدەی بیست بوو بە هۆی ئەوەی کە هەندیّ لە بیریارانی عەرەب بە رەسمی "کۆتایی پان عەرەبیزم" رابگەیەنن. لە بەرامبەر ئەمەشدا ژمارەیەکی زۆریش تەئکیدیان لە بەردەوامبوونی ژیانی پان عەرەبیزم کردەوە. بۆ ئەم مەبەستەش سەنتەری "دراسات الوحدة العربية" بە مەبەستی لیکۆلینەوەی ئەم جۆرە تیۆریانەو لیکۆلینەوە دەربارەی یەکیتی عەرەب لە قاهیرەو بەیروت دامەزراوە، بۆ دوا دیدگای بەرچاویش بۆ بەدەستهینانی یەکیتی عەرەب دەتوانریّ ئاماژە بۆ ئەو ریگەچارەیە بکریّ کە پشتی بە دیموکراسی بەستوە. لەم بارەیەوە هەندیّ لە بیریاران ئاماژەیان بۆ خودسەری و سەرکوتکردنی جولاّنەوە سیاسیە چالاکەکان و لەدەستدانی بەشداری جەماوەر کردوە لە جیهانی عەرەبداو ریگای بەدەستهینانی یەکیتی عەرەب بە قبول کردنی دیموکراسی و فرە مینبەری دەزانن.

## ئەنجام:

ئەندیشەو جولاّنەوەی پان عەرەبیزم لە سەرەتاوە، بەرلەوەی رەوتیکی ئاسایی و داهینراو بیّ، رەوتیکی پر هەلچوون بوە. وا دیارە ئەگەر عەرەبەکان لەناو ئیپمراتۆریەتی عوسمانیدا مافەکانیان بدرایەتیّ هیچ کاتیّ پالنەریکیان بۆ جیابونەوە نەدەبوو. بە تایبەتی لەبەر ئەوەی کە ئاین واتە ئیسلام و مەسەلەی خەلافەت لەو ئیمپراتۆریەتەدا فاکتەریکی بەهیز بوون بۆ پاراستنی ئەو پەیوەندیە. بەم پییە پان عەرەبیزم لە رەوتی میژوویی خۆیدا سەرەتا کاردانەوەیەك بوو لە بەرامبەر رەوتی رەگەزپەرستانەی پان تورکیزمدا. لە ئەنجامیش ویرای ئامادەگی ئیمپریالیزمی بەریتانی و فەرەنسی لە ناوچەکە، دەرفەتیك بۆ یەکیتی عەرەب نەهاتە پیش و لەم ماوەیە سەرلەنویّ جولاّنەوەی ناسیونالیزمی عەرەب وەکو وەلاّمیك لە بەرامبەر ئیمپریالیزمدا گەشەی کرد. لە دوای جەنگی دوەمی جیهانیش لەگەڵ سەربەخۆبوونی زۆر لە ولاّتە عەرەبیەکاندا ئەنگیزەی یەکیتی رۆژ بە رۆژ زیاتر لاواز دەبوو و بە قبولکردن و

سەقامگیربوونی سیستمی دەولەت - نەتەوە دوور دەهاتە بەرچاو کە یەکیتیەکی سیاسی کامل بەدەست بهینرێ. دەرکەوتنی دوژمنیکی هاوبەشی وەك ئیسرائیل-یش هەرچەندە بۆ ماوەیەکی کورت بوە هۆی لەیەك نزیك خستنەوەی عەرەب بەلام بە شیوەیەکی ئاسایی نەیدەتوانی بۆ ماوەیەکی زۆر فاکتەریکی گرنگ بێ بۆ پاراستنی ئەو نزیکیە. جامیعەی عەرەبی وەکو تاکە رەمزی تەقریبەن کاملی پان عەرەبیزم، بە تەئکیدکردنی فەرمانرەوایی نیشتمانی تەنها یارمەتی سەقامگیرکردنی سیستمی دەولەت- نەتەوەی داو هیچ کاتێ نەیتوانیوە ببیتە سەرچاوەی کاریگەرییەکی جدی. جیاوازییە ئابورییەکان چ لە رووی سیستمی ئابوری و چ لە رووی ئاستی ئابورییەوە، بوونی کەمایەتی سەرەکی نەژادی ناعەرەب، گۆرانی زمانی عەرەبی لۆکالی هەر ناوچەیەو دوورکەوتنەوەی لە زمانی عەرەبی فەسیح و لەپال ئەمانەشدا ناکۆکی پرانسیپەکانی ناسیونالیزم لەگەڵ ئیسلامداو بیتوانایی بیریارانی عەرەب لە راڤەکردن و ئاراستەکردنی ئەمەدا، ئەوەی نیشان دا کە عەرەبەکان توانای دامەزراندنی قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆیان نیە لەسەر بنەمای زمان و دواجاریش ئەو تایبەتمەندییە هاوبەشە گرنگە واتە زمانی عەرەبی بۆ بەدەستهینانی یەکیتی توانای پیویستی نەبوە. بەهەرحال حالی حازر، قسەکردن لەسەر عەرەب بەلای کەمەوە وەکو یەکبوونی سیاسی به زیادەرەوی دیتە بەرچاو. ئاشکرایە کە ولاتە عەرەبیەکان لەبەرامبەر ولاتی ناعەرەبدا بۆ زیادکردنی سەنگی خۆیان، لەژیر پەردەی عەرەبدا خۆیان نیشاندەدەن، بەلام واقیع ئەوە نیە.

ولاتە عەرەبیەکان هەریەکەیان وەکو دەولەتە نەتەوەییەکانی تر شوین بەرژەوەندی و ئامانجە تایبەتیەکانی خۆیان کەوتوون و هەتا ئەو شوینە خۆیان بە بەرگی عەرەبییەوە دەردەخەن کە بەرژەوەندیان دەیخوازێ و هەرکاتێ ئەو بەرگە عەرەبیە کیشەیەك بۆ دەسەلاتی سەربەخۆیان دروست بکات، یان عەرەبیزم و مەسەلەی یەکیتی بۆ خزمەت و لە پیناوی دەسەلاتی نیشتمانیی خۆیاندا دەخەنە لاوە.

## سەرنج

*محمد کاظم آسایس طلب طوسی پسپۆرە لە (مرکز مطالعات خلیج فارس و خاورمیانة) لە (دفتر مطالعات سیاسی و بین المللی).

**پەراویزەکانی ئەم بابەتەم فەرامۆش کردوە لەبەرئەوەی ئاماژەن بۆ سەرچاوە فارسی و ئینگلیزییەکان و بۆ خوینەری کورد ئەو بایەخەیان نیە.

## سەرچاوە

فصلنامەی سیاست خارجی
شمارەی ٣ پاییز ١٣٨٠
لاپەرە ٧٨٣-٧٩٥

# ڕەخنەو لێکۆڵینەوە

- کێشەکانی ڕەخنەی هونەری — ئێدمۆند فێڵدمان
- میراتی دانپیانەنراوی سێرڤانتس — میلان کۆندێرا
- ئەو ڕۆژەی کە ئیدی پانۆرژ کەس ناخاتە پێکەنین — میلان کۆندێرا

# کیشەکانی رەخنەی هونەری

• ئیدمۆند فیلدمان

■ لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید

زۆر کەس لە ئیمە خۆی بە رەخنەگر دەزانیّ، چونکە هەریەکیکمان بەلانی کەمەوە خاوەنی بریک دیدی رەخنەیین، جگە لەوەی خاوەنی چەند زانیارییەکین دەربارەی هونەرو تیۆرەکانی هونەر. رەنگە هۆی ئەمەش بگەریتەوە بۆ سروشتی هاولاتیان لە کۆمەلگە دیموکراتیەکاندا، کە بروایان وایە دیدو بۆچوونیان دەربارەی هەر بابەتیك خاوەنی هەمان ئەو قورساییەیە کە دەنگیان لە بوارە سیاسیەکاندا هەیەتی. لیرەدا ئیمە رۆشنایی دەخەینە سەر ئەم کیشەیە. بەلام بە داخەوە لەبەرئەوەی



سیستمی فیرکاری تەنها دەرفەتیکی بچوکی تەرخان کردووە بۆ پەرەپیدانی بنەماکانی پراکتیزەکردنی رەخنە، ئەو کەسانەشی کە زۆر رۆشنبیر بن-بە هونەرمەندەکانیشەوە- هەندیّ جار جۆریك لە راوبۆچوون دەردەبرن کە بە سەریاندا دەسەپیّ، یان هەندیّ بۆچوون دەخەنەروو کە خۆشیان نازانن چۆن و بە چ جۆریّ دایبریژن. هەرچی سەبارەت بە تیزەکانیشیانە لە بواری رەخنەی هونەریدا، ئەوا زۆربەیان پشت ئەستوورن بە ئارەزوەکانیان. هەرچەندە شیکردنەوەو هەلسەنگاندنەکانمان

هەمیشە ڕاستی ناپێکن، بەڵام دەکرێ چەند کردەیەکی سیستماتیك ئەنجام بدەین بۆ بە ئاکام گەیاندنی پرۆسەی ڕەخنەیی. کەواتە، پێشتر دەبێ بزانین ئەو کردانە چین تاکو بتوانین پێڕەویان بکەین. یان دەبێ بەلانی کەمەوە بتوانین بەرگری لە شێوازی داڕشتنی ڕاوبۆچوونە ڕەخنەییەکانمان بکەین.

دواجار ڕەخنە هەرچییەك بێت، ئەوەیە کە ئێمە دروستی دەکەین، چالاکییەکی پراکتیکییە کە پشت ئەستور بە چەند بنەمایەکی تیۆری و لە ڕێگایەوە لێهاتویی و وردەکاریی خۆمان دەخەینەڕوو. بەڵام بەر لە هەر شتێك پێویستە لە گرنگی ڕەخنەو ڕەفتارو پاساوی ڕەخنەگرەکان تێبگەین. واتە دەبێ ببینە خاوەنی ئەو کردە ڕەخنەییە چالاکانەی کە گەشە بە تێگەیشتنمان دەدەن بەرامبەر هونەر بێئەوەی چێژی تەماشاکردنی هونەرمان لێبستێننەوە.

## تیۆری ڕەخنەی هونەری

ئامانجی یەکەمی ڕەخنەی هونەری بریتیە لە تێگەیشتن، بۆیە دەبێ شێوازێکی ڕەخنەیی پێڕەو بکەین بۆ هەڵسەنگاندنی بابەتە هونەرییەکان، شێوازێکی ئەوتۆ کە ئەوپەڕی بەرچاوڕوونیمان پێببەخشێ بۆ تێگەیشتن لە ماناو خەسڵەتەکانی هونەر. ئەڵبەتە کاری هونەری لە خودی خۆیدا چەند زانیارییەك بە تەماشاکاری شارەزا دەبەخشێ، بەڵام ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگە دۆزینەوەی پەیوەندییە لە نێوان ئەو زانیاریانەو ئەو کارە هونەرییەدا کە قسەی لێدەکرێ. هەر لەبەر ئەم هۆیە ڕەنگە زانیاریە ئارکۆلۆجی، مێژوویی و بایۆگرافییەکان دەربارەی هونەرو هونەرمەندان زۆر گرنگ بن بەڵام لە ڕەخنەی هونەریدا زۆر گرنگ نین، بۆیە مەبەستی ئێمە لێرەدا بریتیە لە تێگەیشتنی ئەو هۆکارانەی لە کاری هونەریدا هەن و ئەو کاریگەرییەی کە بەسەرمانەوە بەجێی دێڵێ.



ئامانجی دووەمی ڕەخنەی هونەری بریتیە لە بەدەستهێنانی چێژ یان ئاسودەیی. ئەم ئامانجەش هیچی کەمتر نیە لە ئامانجی یەکەم. بۆ دڵنیابوونی زیاتریش دەکرێ ئێمە لە ڕێگای تێگەیشتن و ناسینی شتێك لە هونەردا چێژ بە دەست بێنین و ئاسودە ببین. بۆیە دەبێ تەماشاکاری شارەزا توانای ئەزموونکردنی

بەشێکی زۆری ئەو چێژی تێرکردنەی هەبێ کە کاری هونەری پێشکەشی دەکا. ڕەخنە توانای ئەوەمان پێدەبەخشێ بە شێوەیەکی سیستماتیک درێژە بە گەڕان و لێکۆڵینەوە بدەین. ئەو چێژی تێربوونەش کە لە ڕێگای هونەرەوە چنگمان دەکەوێ هەڵگری دوو خەسڵەتە: بەها یان جۆری ئەو بابەتەی وەری دەگرین، لەگەڵ توانای بەکارهێنانی شارەزاییمان لە بینیندا. واتە لە کاتێکدا کە ڕەخنەی هونەری فێری ئەوەمان دەکا چۆن مەعریفەو شارەزایی خۆمان لە ئاستی دۆخێکی ئیستاتیکیدا چڕبکەینەوە، چێژی وەرگرتنیشمان بەرامبەر ئەو دۆخە قووڵتر دەکاتەوە.

هەندێ کەس لەو باوەڕەدان کە لێکۆڵینەوەی جدی دەربارەی هونەر ئەو چێژە لەناو دەبا کە پێمان دەبەخشێ. واتە ئەوان پێیان وایە کە ناسینی قوڵی هونەرو خۆشەویستی، بەهای ئەو هونەرو خۆشەویستییە کەمدەکاتەوە. هەندێ لێکۆڵینەوەش جەخت لەسەر ئەم مەترسیانە دەکەنەوە. بەڵام ئەو زانیاریانەی کە ڕەخنەگرەکان پێشکەشی دەکەن بە شێوەیەکی بنەڕەتی پەیوەندییان بە سەرچاوەی قەناعەتەکانیانەوە هەیە دەربارەی کاری هونەری، واتە دەربارەی کاریگەری یان مەغزای ئەو کارە لەسەر جیهانی ئەوان و مانای بوونی ئەوان لەناویدا. واتە کاتێ ئێمە تەماشای کارێکی هونەری دەکەین هەست دەکەین ئێمە یان وروژاوین یان خامۆشین، یان ترساوین یان خاوەن حەماسەتین، یان تووڕەین یان ئارامین، بەڵام لەبەرئەوەی ئێمە مرۆڤین و مرۆڤیش حەزی لە پەردەلادانە، ئارەزوویەکی بەهێزمان تێدا دروست دەبێ بۆ پەردەلادان لەسەر هۆکاری ئەو هەست و سۆزەی تیاماندا دەوروژێ.

**هەندێ کەس لەو باوەڕەدان کە لێکۆڵینەوەی جدی دەربارەی هونەر ئەو چێژە لەناو دەبا کە پێمان دەبەخشێ.**

بەڵام گەڕان بە دوای مانا و چێژدا تاقە وەزیفەی ڕەخنەی هونەری نیە؛ چونکە ئێمە بە کردەیی چێژ لەوە وەردەگرین کە کەسانی تر بەشداری بکەن لە بینینی ئەو شتانەی ئێمە پەنجەیان دەخەینە سەر، چونکە زۆر سەختە شتێك بناسین و چێژی لێوەربگرین ئەگەر پەرچەکرداری خەڵکانی تر بەرامبەر ئەو شتە بەهەند وەرنەگرین. ئەمەش ئەو هۆکارەیە کە لە پشت قسەکردنی ئێمەوە هەیە سەبارەت بە هونەر، مۆسیقا، فیلم و کتێب: بە مانایەکی تر ئێمە دەخوازین ئەوە بزانین ئایا خەڵکانی تریش هەمان پەرچەکردارو ڕاوبۆچوونیان هەیە یان نەء؟! یان دەمانەوێ قەناعەتیان پێبکەین کە ئەوانیش هەمان شیکردنەوەو ڕاوبۆچوونی ئێمەیان هەبێ. بۆیە هەمیشە

هاندەرێکی کۆمەڵایەتی لە ڕەخنەدا هەیە، ئەم گریمانەیەش ئەوە دەردەخات کە ڕەخنەی هونەری بریتیە لە قسەکردن دەربارەی هونەر.

داخۆ بۆچی چێژ لەوە وەردەگرین کە دەربارەی هونەر بدوێین؟

وەڵام: چونکە ئەو قسەکردنە گونجاوترین ڕێگایە بۆ گەیاندنی هەست و سۆزمان بێئەوەی هەست بە هیچ تەنگەتاوییەك بکەین. هەر ئەم هۆکارەشە وا لە خەڵکانێکی زۆر دەکا کە ئارەزووی پێشکەشکردنی حوکمی ڕەخنەییان هەبێت: چونکە ئێمە خوازیاری ئەوەین کە خەڵکانی تر بە جۆرێکی تایبەت بمانناسن. بەڵام ڕەخنەگرە باشەکان جگە لە قسەکردن ئارەزوی تریشیان هەیە: ئەوان هەڵگری چەندین جۆر تواناو وزەن لە چێژوەرگرتنی ئیستاتیکیدا. کاتێکیش کە ڕاوبۆچوونی خۆیان دەدرکێنن توانای ئێمەش لە تێگەیشتن و چێژوەرگرتنندا فراوانتر دەکەن. لە دۆخێکی وادا ڕەخنەی هونەری ڕۆڵی پرۆسەی فێرکردن دەبینێ. واتە ڕۆڵی ئامرازێك دەبینێ بۆ گەیاندنی ڕاوبۆچوون دەربارەی هونەر، یان دەربارەی ژیان، ئەڵبەتە ژیانیش ئەو خاکەیە کە هونەری لەسەر دەپیتێ.

یەکێك لە ئامانجە بڵاو و باوەکانی ڕەخنە بریتیە لە داڕشتنی قسەگەلێك دەربارەی بەهاو پۆلێنکردنی کاری هونەری. واتە ئەو ئامانجانەی کە پێشتر باسمان کردن وەك بەراییەك بۆ حوکمدان لەسەر ئاستی باشیی کاری هونەری لە قەڵەم دەدرێن. بە مانایەکی تر ئێمە ڕووبەڕووی ئارەزوویەك دەبینەوە کە لە ناخی مرۆڤدا ڕەسەنایەتی هەیە -ئەویش ئارەزووی ئاشکراکردنی ئەوەی کە شتێك لە شتێکی تر باشترە یان شایەنی زۆرترە. ڕەنگە ئەم ئارەزوەش هەڵقوڵاوی خواستی موڵکدارێتی هەموو شتێکی گرانبەها بێت، ئەو خواستە مرۆییەی کە دەبێتە مایەی گەشەسەندنی ڕەخنەی هونەری و دەیکاتە میتۆدێکی جدی.

لێرەوە، ئێمە پێویستمان بە بناغەیەکی گونجاو هەیە بۆ حوکمدان بەسەر باش و باشتر و باشتریندا. بەڵام داخۆ بۆچی ئێمە پێویستمان بەم بناغەیە هەیە؟ ئەڵبەتە بۆ ئەوەی دڵنیابین لە ئاست ئەو شتەدا کە خۆشمان دەوێ. هەروەها ناوبانگ پەیداکردن و دەوڵەمەندی و شکۆداری، کاریگەریی خۆی لەسەر حوکمی ڕەخنەیی هەیە، چونکە مێژووی هونەر کۆششێکی زۆری خستۆتە گەڕ بۆ پۆلێنکردنی هونەرمەندان و کارە هونەرییەکانیان، میتۆدی ڕەخنەییش شێوازی تازەی دۆزیوەتەوە بۆ دیاریکردنی کارە هونەریەکان بە تایبەتی کاتێ بازرگانی کارە هونەریەکان پاش دەرکەوتنی گەورەیی خاوەن کارێك دەیانەوێ بازاڕ بۆ شمەکەکانیان بدۆزنەوە. ئەگەر بکرێ کارێکی هونەری بدەینە پاڵ هونەرمەندێکی گەورە، ئەوا ڕەنگە شایانی بەهایەکی دارایی گەورە بێت (بەهای مادییش پەیوەندییەکی زۆری بە بەها

ئیستاتیکیەکانەوە هەیە). بەڵام لیکۆڵەرەوەکان وانەگەلیکی زۆر لە بەهای ئیستاتیکی کارە هونەرییەکانەوە فیربوون بە تایبەتی کاتێ وەڵامی ئەو پرسیارانە دەدەنەوە کە پەیوەندییان بە رەسەنایەتیو بە دۆکیۆمینت کردنەوە هەیە. میژوی هونەرو رەخنەی هونەریش ئەو میتۆدانەیان بەرهەم هیناوە کە توانای بینینی پردی نیوان هونەرو نمونە سەرەکیەکانی فیکرو رەفتاری مرۆییمان پیدەبەخشن.

بەوپییەی رەخنە هەموو ئارەزوومەندانی هونەر کۆدەکاتەوە، بازاری کرینی کارەکان جەخت لەسەر حوکمە رەخنەییەکانیان، یان حوکمی رەخنەیی کەسانی تر دەکاتەوە، چونکە سەرجەم چالاکیەکانی بازاری کرین و فرۆشتن و نمایشکردنی کارە هونەرییەکان گرنگیی رەخنەیی خۆی هەیە. هەروەها نوسەرو رۆژنامەنوسەکان لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا رەخنەکانیان بڵاودەکەنەوەو، لە پیشانگاو مۆزەخانەکانیشدا گفتوگۆی رەخنەیی سازدەدەن و دواجار کاریگەری لەسەر جۆری داهینانی هونەرمەندان جیدیلن. ئەمەش بەسەریەکەوە ئەنجامیکی زۆر گرنگی لیدەکەویتەوە: رەخنە کاریگەری لەسەر بەرهەمهینانی هونەری رەخنەکراو جیدیلێ، چونکە هونەرمەندان پیویستیان بە پشتیوانی ئەو جەماوەرە هەیە کە لەلایەن رەخنەگرانەوە پیشبینیەکانیان گەڵاڵە دەبێو دەستنیشان دەکرێ. واتە هونەرمەندەکان لە پیناو وەدەستهینانی ناوبانگدا هەولدەدەن ئەو پیوەرە رەخنەییانەیان چنگکەوێ کە دەیانگەیەننە پیگەیەکی شایستەو گشت کەسیکیش هیوای بۆ دەخوازێ.

رەخنە هاوشانی تیگەیشتن و چیژوەرگرتنە لە هونەر، بەڵام هاوکات لەگەڵ فۆرمەلەبوونی ئەو بیروبۆچوونانەی کە پیوەری ئەفراندنی هونەرییان لیدەکەویتەوە ئەویش کۆتایی دیت. واتە رەنگە ئیمە خاوەنی کاریگەری نەبین لەسەر ئەوەی کە هونەرمەندەکان بەرهەمی دینن. بەڵام لەگەڵ فیربوونی هونەر، قسەکردن دەربارەی هونەرو کرینی هونەر، دەبینە خاوەنی ئەو پیوەرانەی کە حوکمی لەسەر دەدەن. هەرچەندە زۆرجار ئەو پیوەرانە دەگۆرین و بە وردی نیشانەکانیان ناپیکن، بەڵام پرۆسەی پەیوەندیی رەخنەیی هەمیشە پرۆسەیەکی چالاکە چونکە ئیمە هەموومان بە جۆریك لە جۆرەکان بەشداری لەو چالاکیانەدا دەکەین کە کار لە سیاسەت و ئابوری و ئیستاتیکای هونەر دەکا. بۆیە پیویستە لەسەرمان بە هەموو تواناو ئەمانەتیکەوە کاری رەخنەیی بە ئەنجام بگەیەنین.

## کەرەستەکانی رەخنەی هونەری

بۆ ئەوەی رەخنەگر رۆڵی خۆی بە شیوەیەکی گونجاو ببینێ، پیویستی بە کەرەستەگەلیکە. بەڵام داخۆ ئەو کەرەستانە چین؟ داخۆ پیویستمان بە ناسینی چی هەیەو

دەبـێ خـاوەنی چ ئاسـتیکی زیرەکـی و شارەزایی بین؟

ئاشـکرایە بـەئاگابوونی بـەرفراوان دەربارەی هونـەر پیداویسـتییەکی بنـەرەتیی هـەر هونەرمەندیکـە بـە تایبـەتی بـەئاگابوون دەربارەی ئـەو هونـەرەی حوکمـی رەخنـەیی بەسەردا دەدەین. زۆرجار ئەم بەئاگابوونە لـە ریگـای لیکۆلینـەوە بـە تایبـەتی لیکۆلینـەوە دەربارەی میژوی هونەر دەستەبەر دەبێ. بۆ ئـەم مەبەسـتەش پیویسـتە کـارە هونەرییـە رەسەنەکانمان بینیبیت یان ئەو کۆپیانەی کە لیـوەی وەرگـیراون. هـەروەها زۆر پیویسـتە چاومـان بـە کـاری هونـەریی خویندکارەکـان و ئەو کارانەی کە ئەنجامیان داوە بکەوێ بە کارە خراپەکانیشـیانەوە، چونکـە هونەرمـەندان خـاوەن خەسـلەتیکی تایبـەتن لـەم بـوارەداو دەتوانـن ئـەو هەلـە تەکنیکیانـە دەستنیشـان بکـەن کـە زۆرجـار تیوریزەکـاران دەرکـی پیناکـەن. هـەروەها بـەئاگابوون لـە کـارە هونەرییـە مەزنـەکان لـە ریگـەی تویـژە جیاوازەکانەوە کاریکی باشە، بەلام تەنها ئەو بەئاگابوونـەش بـەس نیـە، بـەلکو پیویسـتە بەپیی توانـا سـەردانی پیشـانگاو مۆزەخانـەو هۆلـەکانی نەخشەکیشـان لـە سەرانسـەری جیـهاندا بکـەین. باشـترین پاسـاویش بـۆ چوونەدەرەوە لەمال بینینی هونەری جیهانیە.

ناسینی هونەر لەوە گـەورەترە کـە تەنـها شوینەوارە مەزنەکانی میژوی هونـەر بناسـین، بـەلکو هانمـان دەدا لـە شـیوازو وەزیفـەکانی هونەرو کرۆکی کۆمەلایەتی و شارستانی کاری هونەرمـەندان تیبگـەین، هـەروەها لـەو فاکتـەرە تەکنیکیانـە بگـەین کـە لـە نیوەنـدە جۆربەجۆرەکاندا کـار لـە دەرهینـانی هونـەری دەکەن. لە ریگای بەئاگابوونی بەرفراوانەوە لە هونـەر سودیکمان چنگ دەکـەوێ کـە ئـەویش فراوانبوونـی مـەودای چیژوەرگرتنمانـە. واتـە دەبـێ کەسـی رەخنـەگر بـواری بـەرفراوانی چـالاکیی هونـەری بـە هینـد وەرگـرێ و دژی بەرتەسـکبوونەوەی ئاسـۆی رەخنـەیی بیـت، واتـە دژی ئـەو پیوەرانـە بیـت کـە پشـت ئەسـتوورن بـە زانینیکـی کرچوکـال دەربـارەی شیوازە هونەریـەکان و ئـەزموونیکی دیاریکراو لـە بـواری شـیوازە تەکنیکیـەکاندا. ئیمـە ئـەو شانسـەشمان هەیـە کـە دەتوانـین بگەینـە ئـەو هونەرەی لە سەرانسەری جیهاندا بەرهەم دیت، جا لە ریگـای سـەفەرەوە بیت بۆ ئەو شـوینانە یـان لـە ریگـای کۆپـی کارەکانـەوە. بـەلام تـا ماوەیـەکی رابوردوش نـەوەکانی پیش خۆمـان نەیاندەتوانی ئەو کارە بکەن و ئەو شانسـەیان نەبوو.

> **ناسینی هونەر لەوە گەورەترە کە تەنها شوینەوارە مەزنەکانی میژووی هونەر بناسین**

رەنگە هونەرمەندان ریزیکی زیاتر بۆ ئەو رەخنەگرانـە دابنیـن کـە لـە حوکمـەکانیاندا پشتئەسـتورن بـە شـارەزایی هونـەری.

رەخنەگرەکان هەندیکیان خاوەنی شارەزاییەکی لەو جۆرەن و هەندیکیشیان خۆیان هونەرمەندن، بەلام بەشیکی زۆری رەخنەگرانیش خاوەنی پاشخانیکی ئەدەبی و تیۆری پەتین. رەنگە ئەو لیکۆلەرەوانە باش بن کە توانیویانە خۆیان لە کیبرکیٔ و وەلا بۆ هونەرمەندانی ترو ئیرەیی کردن رزگارکردبیٔ، چونکە لەم جۆرە حالەتانەدا راوبۆچوونی هونەرمەندان تیکەل بە کاری هونەرمەندانی دیکە دەبیٔ. هەندیٔ لە لیکۆلەرەوان بروایان وایە هونەرمەندان بە شیوەیەکی خۆرسك توانای هەلسەنگاندنی سەختی بابەتیانەی هاوریکانی خۆیانیان نیە. ئەلبەتە تاوەکو هونەرمەندان و رەخنەگران هەبن، ئەم مەسەلەیەش تاووتویٔ دەکریٔ. ئەکادیمیاو زانکۆکان بۆ سەردەمانیکی زۆر تەنها تیورەکارانیان بۆ وتنەوەی هونەر دادەمەزراند، بەلام خۆشبەختانە لەمرۆدا تیۆریزەکاران و پیشەوەرانیش بەکاردینن، واتە ئەو کەسانەی کە توانای هەردوو جۆرە پرۆڤەکەیان هەیە.

ئەو رەخنەگرانەی کە تەنها لە روی تیۆرییەوە خۆیان ئامادەکردووە، لە رووی خەملاندنی جۆرو بەهای کارە هونەرییەکانەوە دەست کورتن. هەندیکیان حەز بە شیواندنی شۆرەت و لیهاتویی تەکنیکی دەکەن؛ هەندیکیان بە شتیکی ساختەو دروستکراو لە قەلەمی دەدەن و زۆر کەمیش پەی بە هەلەی پیشەیی کارە هونەریەکان دەبەن. بۆیە جیهانی هونەر تووشی پەشیویەکی زۆر دەبیٔ کاتیك گرنگییەکی جدی دەدریٔ بە کاری شارەزایان و گالتەجاران و (هەندیٔ جاریش بە کاری ئاژەلان وەك مەیمون بۆ نمونە)، لە هەندیٔ پیشانگاشدا خەلاتیان پیدەبەخشریٔ.



ئەو گرگنانەی دەیانەویٔ هونەری هاوچەرخ بیقیمەت بکەن بەرامبەر کاری هونەرمەندە جدیەکان هیچیان پیٔ نیە. سەرەرای ئەوەی لە کاری رەخنەییدا بیحورمەتی دەنوینن و گومان دەرهەق لیهاتویی هەندیٔ رەخنەگر دەوروژینن. هەروەها کۆششی هەندیٔ لە رەخنەگرە میانرەو و کراوەکان بەرامبەر هەموو فۆرمیکی تەعبیرکردن وایان لیدەکات تەنازول بکەن لە رۆلی خۆیان لە رەخنەی هونەریدا. بەلام بۆ ئەوەی رەخنەگران رۆلیك ببینن لە رۆلی بریکار و هاندەرانی هونەر زۆرتر بیت، پیویستە هەلسەنگینەریکی باش بن لە تەکنیکی هونەریدا؛ چونکە تەکنیك رۆلیکی سەرەکی دەبینیٔ لە دیاریکردنی ئەو فۆرمەی کە لە ناوەرۆك ناترازیٔ. بەبیٔ بوونی

شـــارەزاییەکی تـــەکنیکی حوکمـــەکانمان سەرپێیی دەبن و کەمجار دەتوانین پاساوی بۆ بینینەوەو پشتیوانییان لیبکەین.

مەرجیکی تر بۆ ئامادەکردنی رەخنەگری سەرکەوتو "فراوانیی هوشیارییە" لە پیناو بەدەستهینانی ئاستیکی بەرفراوانی کارلیك لەگەڵ دەربرینە هونەرییەکاندا. چونکە وەك ئاشکرایە تاکەکان لە جۆرو ئاستی هەست و سۆزیان و پەیوەندیی هەستیارییان بە رووداوەکانی ژیانی واقیعییەوە جیاوازن و لەیەکتر ناچن. بە هەمان شیوە هەست و سۆزیان بەرامبەر کارە هونەرییەکان لەیەك ئاستدا نیە. لیرەوە پیویستە رەخنەگران خاوەنی ئامرازیك بن بۆ نزیکبوونەوە لە مەودای بەرفراوانی هەستیاریی ئیستاتیکی و لە بواری دەربرینی هەست و سۆزو بۆچوونەکانیاندا روون و ئاشکرا بن، ئەگەرنا ئەوا سودیکی وەهایان نابیت. رەنگە هۆکاری جیاوازیمان لە راوبۆچوونەکانماندا دەربارەی هونەر بگەریتەوە بۆ ئەو هەستیارییە قەدەغەکراوە یان ئەو توانا ریژەییەمان لە پەیبردنی هەستیاری ئیستاتیکیدا. بۆیە بەرفراوانکردن و قوولکردنەوەی هەستیاریمان بەرامبەر هونەر -واتە بەرفراوانکردنی مەودای ئیستاتیکمان- بە ئەرکیکی مرۆیی بە سوود لە قەڵەم دەدریّ. هەر ئەمەشە هانمان دەدا گەشەدان بە توانای رەخنەیی بکەینە یەکیك لە ئامانجە سەرەکیەکانی پەروەردەی لیبراڵ.

ئەلبەتە کەسی رەخنەگر تەنها تۆماریکی بەتاڵ نیە، بەلکو هەلگری ریژەیەکی زۆری بۆچوون و وردەکاریی ناهوشیارانەیە، بۆیە ئامادەکاریی رەخنەیی پیویستی بە رەگەزیکی ترە، کە بریتیە لە مەزاجی جیاکاریی، واتە توانای دواخستنی حوکم تا دەرکەوتنی هەموو

> **مەرجیکی تر بۆ ئامادەکردنی رەخنەگری سەرکەوتو "فراوانیی هوشیارییە"**

ئەو بەلگە ئیستاتیکیانەی کە پشتیوانی لیدەکەن. چونکە زۆر کەس لە ئیمە بەخیرایی حوکم دەردەکەین، واتە بۆچوونەکان دەسەلمینین پاشان بە دوای هۆکار و پاساودا دەگەریین. بەلام مەزاجی دانایانە دەرفەتیکی باش دەدا بە هەست و سۆزو کاردانەوەو هەلسەنگاندنە نیوەناچلەکانمان بۆ ئەوەی بچینە دۆخی کارلیکەوە، پاشان بە شیوەیەکی زیرەکانە لیکۆڵینەوەو پۆلینکاری و ریکخستن ئەنجام بدەین. کاتێ دەربارەی کاریکی هونەری لیکۆڵینەوە ئەنجام دەدەین، سەرەتا هەست و سۆزمان توشی راچەنینیکی سەیر دەبن، بۆیە پیویستمان بە ماوەیەکی زەمەنییە بۆ پراکتیزەکردنی لۆژیك و ئەقلانیەت. کەواتە، نابێ بوار بە حوکمی خیرا لەسەر هونەر بدەین، هەروەکو چۆن نابیت لە دادگاکانی جیبەجیکردنی یاسادا حوکمی لەو جۆرە بدەین.

## جۆرەكانى رەخنەى هونەرى

رەخنەگران چۆن پاساو بۆ هەلسەنگاندنەكانى خۆيان دينندەوە؟ ئايا لە ريگاى پەيپيبردنى ژيرانەوە حوكم لەسەر هونەر دەدەن؟ ئايا كارە هونەريەكان بە كارى ئەو هونەرمەندە داهينەرانە دەپيون كە لە ئاستياندا سەرسامن؟ يان ئايا خاوەنى چەند پيوەريكى گشتين كە پيشوەخت پيكهينراون بۆ حوكمدان لەسەر هەر كاريكى هونەريى نوێ؟

لە گۆشەنيگاى ئيمەوە، دواخستنى حوكم بەسەر كارى هونەريدا بۆ پاش ئەنجامدانى ئەركە سەرەكيەكانى وەك گوزارشت، شيكردنەوەو راڤەكردنى كارەكە هەوليكى باشە كە لە لايەن رەخنەگرانەوە دەخريتە گەر. لە كاتيكى واشدا پرۆسەى حوكمدان زياتر لە ئاستى كەسايەتى بابەتە هونەريەكەدا دەبيت، بەلام پەرۆشيى ئەوان بۆ حوكمدانى رەخنەيى ئەو چەمكانە دەكاتە بناغە كە بۆ نيشاندانى لايەنە باشەكان بكاردين، بۆيە ئەم بەشە ئەو چەمكە سەرەكيانە لەخۆدەگرێ:

## شيوەگەرى *Formalism*:

كاتيك دەسبەردارى ئەو بيرۆكەيە دەبين كە دەلێ كارى هونەريى مەزن لاسايى كردنەوەيەكى جوانى دياردەكانە، ئەوا دەگەريينەوە بۆ ئەوەى پيى دەوترێ رەخنەى شيوەگەر *Formalist Criticism* كە تيايدا شكۆى ريكخستنى شتە بينراوەكان جيگير دەبێ، واتە پەيوەنديى نيوان توخمەكانى كارى هونەريى بينراو بە چاوپۆشين لە ناونان و هاوبەند و مانا رەمزيەكان.



پەيوەندييە سەركەوتوەكانى رەخنەگرى شيوەگەر (فۆرماليست) پەيوەنديگەليكى دامەزراون، واتە زادەى ئەژماركردن و پلاندانانى هونەرمەندن نەك خواست و ئارەزوە نابابەتيەكانى بينەر. هەر بۆيە رەخنەگرە فۆرماليستەكان سەرسامن بەرامبەر هونەرمەندانى وەك: پۆشين *Pousin*، سيزان *Cezanne* و مۆندريان *Mondrian* چونكە ئەوان كاريگەرييە لاوەكيەكان بەهەند ناگرن و

مەبەستیانە پەنا بۆ پیکەوەگونجانی فۆرمەکان ببەن. ئیدی هیچ گومانیك نامینیتەوە سەبارەت بە ئامانج و شیوازی هونەرمەند، چونکە ئەو کاریك بەرهەم ناهینێ تیایدا پەنا بۆ شتی سەیرو ناهونەری بەری تاوەکو ببیتە شتیکی کاریگەر.

شکۆی فۆرمەکان پیویستی بە شیوازیکی ئەندازەیی نیە، پیویستی بە ستایلیك نیە کە بەتال بیت لە پاشخان و پیشخان و چەند توخم و رەنگیکی کەم لەخۆ بگرێ، هەروەها پیویستی بە شیوازی پەتیگەری (ئەبستراکت) نیە. بۆ نمونە هونەرمەندیکی وەك پۆشین چەند فۆرمیکی بازنەیی بە هیواشی دەکیشێ کە لە بۆشاییەکی سروشتیدا جوولە دەکەن. بەلام پیکهاتەکانی بە گشتی لە فۆرم و بارستایی و ئاراستە سەرەکیەکاندا بە شیوەیەکی ریکوپیك و پیکەوە گریدراو و بە وردییەکی نایابەوە دەردەکەون: هەموو درەخت و گرد و جەستەکان پیوانەو کیش و هاوسەنگ کراون. بۆیە ئیمە لە کارەکانیدا پیکەوە گونجانیکی تەواوی هیزی شتە بینراوەکان دەبینین و هەست بە خۆشییەك دەکەین وەك ئەو ژمیریارەی وردەکارییەکی تەواو لە کارەکەی خۆیدا دەکا.

دەکرێ رەخنەگرە فۆرمالیستەکان بایەخ بە بابەتی کاری هونەریی بدەن و زانیاری دەربارەی ئاین، میژو و سیاسەت لە خەلکی و بابەتە بەرجەستەکانی کارە هونەریەکان هەلینجنن. بەلام ئەوان کاری هونەری بە کاریکی شکۆدار لە قەلەم دەدەن و تەنها شت بە فۆرم و ریکخستنی بنەرەتیی ئەو کارە دەبەستن کە چیژیان پیدەبەخشێ. بۆ نمونە پیویستە ریز لە تویکلی ئەو کانزا برۆنزییە وەربگرن کە تەلارسازیکی وەك *Mies Van Der Rohe* بەخشیویەتی بە تەلاری *Seagram*، نەك لەبەرئەوەی مادەی برۆنزەکە جوانە، بەلکو لەبەرئەوەی پیکهاتە برۆنزیەکان خاوەنی ئەو رەهەندە راستەقینانەن کە لە دەروازە راستەقینەکاندا دانراون، بە جۆریك دەگونجێ لەگەڵ قەبارەی پەنجەرە، رەنگی شوشە تاریکەکە، روالەتی گشتی تەلارەکەو قەبارەی بۆشایی دەوروبەری.

هەروەها رەخنەی فۆرمالیست گرنگی بە پیشەوەریی دەدا، چونکە دانانی شتەکان پیکەوەو بە وردی، فۆرمەلەکردنیان بە ئەندازەیەکی راست و دروست، هانمان دەدەن بە شوین پەیوەندییە نەشئە بەخشەکاندا بگەریین. بەلام پیشەوەریی پشت ئەستوورە بە وەگەرخستنی لۆجیکی و ئابوریی کەرەستە خاوەکان، واتە بە شیوەیەکی سەرەکی پشت ئەستوورە بە بایەخە پراگماتیەکان. رەخنەگری فۆرمالیست وەلامی ئەم جۆرە لە لۆجیك دەداتەوە، کە ئامانج گەلیك دەخەنەروو بە مەبەستی پیکەوەگونجانی هیزە مەزنەکانی گەردوون، بە مانایەکی دیکە رەخنەگری فۆرمالیست ئەو کارە هونەریانەی مەبەستە کە هەریەکیکیان لای خۆیانەوە بە تەنیا پشت ئەستوورن بە پرەنسیپی یەکبوون لە ریگای

هەمەجۆرییەوە *Unity in Variety*. واتە پیویستە یەکیتی کاری هونەری، پیکەوە گونجان و جوانیی ئەو کارە، جۆریك لە پیکەوەگونجانی گشتی پیکبهینێ، ئەمەش لە تیۆری (بواری یەکگرتو) دەچێ کە ئەنیشتاین *Einstein* پەی پینەبردوە.

فۆرمالیزم کاریگەرییەکی تەندروستی لەسەر هونەر و فیرکردنی نەریخواز (سلبی) هەیە، چونکە ئەو بایەخ بە بابەتە پەیوەندیدارە ئەدەبی و میژوییەکان ناداو نایانکاتە نیوەندی گواستنەوەی مانای ئیستاتیکی. بەلام لە رووی ئەریخواز (ایجابی)ەوە، فۆرمالیزم گرفتی دامەزراندنی ئەو بیرۆکەی شکۆمەندییەی هەیە کە دەیخوازی. واتە چۆن بزانرێ کام پەیوەندیی فۆرمالیستی جوانترو نەشئە بەخشترە؟ لە کاتیکدا هەردوو رەخنەگری فۆرمالیستی ناسراو: رۆجەر فرای *Roger Fry* و کلایڤ بیل *Clive Bell*، بە شیوەیەکی کردەیی پیوەرەکانی شکۆی فۆرمالیستییان دەستنیشان نەکردوە. هەرچی ئەو شتانەی پییان راگەیاندووین پیناسەی ئەو پیوەرانەیە کە مانای شکۆی فۆرمالیستی ناگەیەنن. هەر بۆیە ئەو گوزارشتەی رایانگەیاندوە و ناسراوە بە فۆرمی گرنگ *Significant Form* گوزارشتیکی باشە، بەلام هاریکارییەکی ئەوتۆ لە کردەی رەخنەییدا نابەخشێ.

ئەگەر پیویست بکا ئەوا فۆرمالیستەکان دەلین: ریکخستنی شیاو کاتێ دیت کە توانا بونیادگەرییە نمونەییەکانی فۆرمەکان بەرجەستە دەبن، (بونیادگەریش زاراوەیەکی پەسەندە لە لایەن فۆرمالیستەکانەوە بەکاردیت، چونکە بەرِوای بە بابەتە پەیوەندیدارە ئەدەبی و میژووییەکان نیە). بەلام وادەی بەرجەستەبوونی توانای نمونەیی پیکهاتەکانی ریکخستنی شتە بینراوەکان چۆن بزانین؟ بۆیە دەبێ فۆرمالیستەکان لیرەدا بگەرینەوە بۆ جۆری پەیپیبردن، واتە دەبێ هەست بکەن کە پەیبردن بە ئامادەیی کاری هونەری لە بنەرەتدا قەناعەت ئاوەرە، بۆیە دەبینین بیرنارد بیرنسون *Bernard Berenson* پشت ئەستوورە بە چەند بیرۆکەیەکی فۆرمالیستی بۆ بەهای ئیستاتیکی کاتێ زاراوەی "جوانکاری ژیان"ی بەکارهینا بۆ گوزارشتکردن لە پربایەخترین خەسلەتەکانی هونەر. لە راستیشدا ئەم زاراوەیە (کە شیوازیکی دیکەی بەکارهینانی وشەی "باشە"یە) بیرورای ئەو بینەرە دەخاتەروو کە دەلێ: هونەری مەزن وامان لیدەکا هەست بکەین ئیمە بەهیزترو زیندوترو

> **هونەری مەزن وامان لیدەکا هەست بکەین ئیمە بەهیزترو زیندوترو خاوەن متمانەیەکی زیاترین بە خۆمان**



خـــاوەن متمانەیـــــەکی زیاترین بە خۆمان، هونەر وەهـــا کاریگەرییـــــەك جیدیلێ ئیدی بابەتەکەی هەرچییەك بێت.

ئەو بەهایانەی ئیمە بە بەهای جوان یان بەهای جوانکـەری ژیـان ناویـان دەبەین، رەنگە هەمان ئەو بەهایانـە بـن کـە هـەر تاکیکی زیرەك و هەستیار بە بەهای نەشئەبەخش لە قەلـەمیانی دەدا. بـە مانایـەکی دیکـە، چـەند یاساو پیوەریکی نمونەیی بۆ هونەر لە ئارادان کـە وابەسـتەی شـتیکن لـە نـاخی ئیمـەداو بـە شوین وەهـا یاسـاو پیوەریکـدا ویلـن. لـیرەوە دەگەینـە تیۆری پەیوەندی کە بەردی بناغـەی بیرۆکـــەی فۆرمالیســـتەکانە ســـەبارەت بـــە شـــکۆمەندی. فۆرمالیســـت بـــروای بـــە بەرجەســـــتەبوونی نمونـــــەیی یـــــان بەرجەســـتەبوونی هـــەموو شـــتەکان هەیـــە، هونـەری شکۆمەندیش پـەردە لەسـەر ئـەو شـتە نمونەییـە هـەلدەمالێ و دەیگەیەنیتـە هـەندێ کەس. بەلام داخۆ ئەو کەسانە کین؟

کەســانیکن کـــە بـــە هـــۆی بونیـــادی سـایکۆلۆجی و ژینگـەیی و شارسـتانییانەوە دەتوانـن فۆرمـی ئیسـتاتیکی بناسـن و چیـژی لیوەرگرن. تیبینی دەکرێ ئەم وتویژە بازنەییە لـە شـیوەی (ئەلقەیـەکی بـەتال)دایـە، لـە راستیشـدا وایـە، چونکـە فۆرمـالیزم دواجـار فەلسـەفەیەکە لـە هونـەردا کـە خـەلکی لـە ریگایـەوە دەتوانـن شـتی هاوبـەش و بەهاگـەلی هاوبەشیان خۆش بوێ.

زۆربـەی هونەرمـەندان و رەخنـەگران بـی ئەوەی بەخۆیان بزانن فۆرمالیستن، چونکە لە بیروبۆچووندا پشت ئەستوورن بە شکۆدارییی ئـەو هەسـت و سـۆزانەی کـە هـــاوجۆری ریکخسـتنی بابـەتی هونەرییـە. رەنگـە ئـەم هەسـت و سـۆزە هـەلقولاوی ئـەو ئامـاژە پۆزەتیڤانە بن کە بە هۆی دەزگاکانی ماسولکە، دەمار، رژین (غدة) پـەی پیدەبـرێ. بـەلام وەك پیشـتر وتمـان: فۆرمـالیزم بەلگـەی ریبـەر (دلیل)ی ئەو بەهایانەمان دەداتێ، کە بە هۆی نـاجۆریی ئیسـتاتیکییەوە رەتیـان دەکاتـەوە: وەك زانیارییـە کۆمەلایـەتی و میژوییـەکان، بابەتە پـەیوەندیدارە ئـەدەبی و سۆزداریەکان،

نـەریتی میكـانیكی بابـەت و روكەشـەكان. هەروەها هۆكاری پەسەندكردنی فـۆرم دیـاری دەكا لە لایەن كەسی ئاساییەوە، یان لە لایەن كەسـی هەسـتیار و چالاكـەوە، هـەر بۆیـە هونەرمـەندان و رەخنـەگران دەخـوازن لـە چوارچیـوەی ئـەم تویـژەی خـەڵكیدا پۆلیـن بكرین.



## گوزارشتخوازی *Expressinism*

رەخنەگرە گوزارشتخوازەكان پییـان وایـە شكۆداری بریتیە لە توانای هونەر لە گەیاندنی بیرۆكـەو هەسـت و سـۆزەكان بـە شـیوەیەكی چالاكانـەو راسـتگۆیانە. رەخنـەی گوزارشتخوازی بە شیوەیەكی تایبەت گرنگی نادا بە ریكخستنی رووكەش تەنها لە پیناو ریكخسـتندا. هونـەری منـداڵان بـۆ نمونـە باشـترین ئـەو نموونانـەن كـە رەخنـەگرە گوزارشـتخوازەكان سەرسـام دەكـا. بـەلای ئەوانەوە هاندەری گەیاندن بۆ گوزارشتكردن لە رووداویك یان هەست و سـۆزیك بـەهیزترە لـە هـەمواركردنی روالـەتی فۆرمـەكان بـۆ ئـەوەی "ورد" یان "جوان" دەربكەون، بەو جۆرەی كە كەسـە كاملـەكان باسـی لیوەدەكـەن. هونـەری منداڵان بە هۆی رەنگ، نەخشەو ئەو وینانەوە كـە توشـی چـەپاندن نـەهاتوون (بـەهۆی ساویلكەییانەوە) سەرسـاممان دەكـا، چونكـە كاتیك منـداڵان گوزارشـت لـە جیـهانی خۆیـان دەكەن بەو جۆرە گوزارشتی لیدەكەن كە هەیە.

كەواتـە، هـەموو هونـەرەكان، ئیتر هـەلگری هـەر شـیوازیك بـن، بیرۆكـەو هەسـت و سـۆز دەگەیـەنن، بۆیـە پیویسـتە لەسـەر رەخنـەگرە گوزارشتخوازەكان ریگەیەكمان نیشان بدەن بۆ دەستنیشانكردنی ئەوەی داخۆ كارەكە ئەركی گەیاندن تیدەپەرینێ یان نا؟ بۆ مامەلەكردنیش لەگـەڵ ئـەم بابەتـەدا دەبـێ بیرۆكـەی هـیزی ئەزموون رەچاو بكەین. پوختەی بیرۆكەكەش ئەمەیە: هونـەر لـە دۆخیكـی شـیاودایە كاتـێ هەسـت و سـۆزە بـەهیزەكان دەوروژینـێ، ئـەو هەست و سۆزانەی كە بەهیزترن لەوانەی ئیمە لـە ژیـانی رۆژانـەماندا دەیـانگوزەرینین. واتـە پیویسـتە پـەی بـە ژیـانی راسـتەقینەو سەرچاوەی هونەریی سۆزەكانمان بـەرین. بـۆ روونكردنـەوەی ئـەم خاڵـە، بروانـە ئـەو وینـە

فۆتۆگرافییەی لەژێر ناونیشانی هەلمەتی ئاسمانی-دایە *Air Attack*، کاتێ تەماشای دەکەین دەزانین دەیەوێ گوزارشت لەچی بکا، بەڵام وێنەکە بە شێوەیەکی میکانیکی و ئاسایی دەردەکەوێ: چونکە هەرچەندە روون و ئاشکرایە بەڵام زەبروزەنگی رووداوەکەمان پێناگەیەنێ. بەڵام کاتێ هونەرمەندانی وەك: گرۆز *Grosz* یان دیکس *Dix* مامەلە لەگەڵ هەمان بابەتدا دەکەن، دەبینی پەرۆشییە سۆزداریەکانی ئیمە بە هۆی هونەرمەندەکەوە بەهیزتر دەبێ بی ئەوەی حەقیقەتی روونی رووداوەکە لەناوبچێ.

بێ هیچ پیچ و پەنایەك، رەخنەگرە گوزارشتخوازەکان پێیان وایە هونەر پێویستە "شتیك بلێ"، واتە پێویستە هونەرمەندەکانیش شتیك بلین. وەك زۆربەی خەلکانی ئاسایی گوزارشتخوازەکان (التعبیریون) دەیانەوێ هونەر سەرچاوەی بینینی ژیان بیت: واتە پێویستە هونەرمەندی مەزن بە جۆریك دانا بیت کە لە خەلکانی دیکە جیاوازبیت. هونەرمەند چەند راستیەکی دیاریکراو دەربارەی ژیان ئاشکرا دەکات و شێوازیك بۆ گوزارشتکردنی زۆر بەهیز لەو حەقیقەتانە لە ریگای زیرەکی و خەیالەوە دەدۆزیتەوە. بۆیە هەریەك لە خەسلەتەکانی وەك: رەسەنایەتی *Originality*، گونجاندن *Relevance* و توانای فیکری *Cognitive Validity* دەبنە پیوەرە ئیستاتیکییە شکۆدارەکان لای گوزارشتخوازەکان، هەروەها تەکنیك و ریکخستنی فۆرمالیستی-یش گرنگن چونکە ئەوانیش هاریکاریی هونەرمەند دەکەن بۆ گەیاندنی بیرۆکە گرنگەکان.




پیوەری گونجاندن لای کەسی گوزارشتخواز هاوتای داواکردنی ئەوەیە کە هونەر بەشداری لە مانای هەنووکەیی بوون بکا، جەختکردنیش لەسەر وشەی "هەنووکە" ئەو پیشنیارە دەخاتەروو کە سەرکەوتنی هەر کاریکی هونەری بەندە بە ئاستی ئاشکراکردنی سۆزو بیرۆکەکان کە خاوەنی مانایەکی راستەوخۆن لە ژیانماندا. بەڵام "مانای راستەوخۆ" لای کەسی گوزارشتخواز بەندە بە رەسەنایەتی و راستگۆییەوە، هەمان ئەو بیرۆکانەی کە بە جۆریك لە جۆرەکان خاوەنی هیزیکی کردەیین. چونکە ئەو کەسەی خاوەنی سەرنجی وردبیت دەزانێ ئەو پیوەرانە کەی بەدی دین؟ شایانی باسە گوزارشتخوازیی هەلگری چەمکی کەسی ئاسایییە، بەڵام کەسی

ئەفسانەیی خۆی بەخشیوە لە پێناو ئەنجامدانی ئەرکێکی نوێدا، کە دامەزراندنی پێوەری ئەو گونجاندنەیە کە هەموومان لەخۆدەگرێ.

## پاساوگەری *Instrumentalism*

پاساوگەری (الذرائعیة) پێی وایە هونەر ئامرازێکە بۆ پاکژکردنەوەی هەندێ لە ئامانجە ئەخلاقی، یان ئاینی، یان سیاسی، یان ئابوریەکان. بۆیە گەورەیی هونەر پشت نابەستێ بە توانای هونەرمەند لە چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی کە لە بنەرەتدا پەیوەندییان بە کەرەستەی خاوو پێوەرە ڕواڵەتیەکانەوە هەیە (واتە کێشە ناوەکیەکانی کاری هونەرمەند). هەروەها گەورەیی پشت ئەستوور نیە بە پێوەرەکانی ڕەخنەگری گوزارشتخواز وەك زیندوویی، ڕاستگۆیی پێکەوە گونجان. بەڵام پاساوگەرەکان بایەخ بە ئەنجامی ئەو هەست و سۆزو بیرۆکانە دەدەن کە بە هونەر گوزارشتیان لێدەکرێ، واتە ئەوان هونەریان بۆ خزمەتکردنی ئەو ئامانجانە دەوێ کە بایەخیان لە خودی هونەر زۆرترە.

دەکرێ چەمکی پاساوگەری لە هونەردا ڕوون بکەینەوە بەوەی بە باکگراوندی موسیقیی فیلمێکی بەراورد بکەین، بەو پێیەی پێویستە مۆسیقا پاڵپشتی کردە دراماییەکە بکاو ماناکەی بەهێز بکاو سەرنجمان بۆ چرکەکانی بە لوتکە گەیشتن و وەرچەرخان ڕابکێشێ بێئەوەی سەرنجمان بۆ لای خودی هونەرەکە ڕاکێشی، واتە پەیوەندیی هونەر بە ئامانجە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەخلاقیەکانەوە پێویستە هاوشێوەی مۆسیقا بێت. نموونەیەکی دیکە هەیە سەبارەت بە بیرۆکەی هونەر کە دەکرێ لە وێنەی ڕونکردنەوەی ڕیکلامێکدا بەدی بکرێ، بەو پێیەی پێویستە ڕیکلام وشەکان و پەیامەکە پێکەوە وێنا بکا، ڕەنگە پەیامەکە جوان بێت یان پێکەنین ئاوەر بێت، بەڵام نابێت هێندە جوان بێت یان هێندە پێکەنین ئاوەر بێت کە ناوی بەرهەمە ڕیکلام بۆکراوەکەمان لەیاد بچێتەوە. مێژووی هونەر، بە جۆرێك، بریتیە لە مێژووی خزمەتکردنی کۆمەڵگای پەیمانگاکانی هونەرو دەستەبژێری دەسەڵاتداری ئەو کۆمەڵگایە. هونەر بۆ ئەوە نەخراوەتە گەر چالاکیەکی ئازادی ئەوتۆ بێت کە هیچ پەیوەندیەکی بە کلیسایەکی دیاریکراو یان حکومەتێکی دیاریکراو یان بنەماڵەیەکی دیاریکراوەوە نەبێت. مەگەر لە چاخی

مێژووی هونەر، بە جۆرێك، بریتیە لە مێژووی خزمەتکردنی کۆمەڵگای پەیمانگاکانی هونەرو دەستەبژێری دەسەڵاتداری ئەو کۆمەڵگایە.

مۆدیرندا، کە مۆزەخانەکان و زانکۆکان و دەزگاکان وەك بریکاری سەرەکی هونەر و هونەرمەندان دەرکەوتوون، بەڵام ئەو بریکارانەش هەولنادەن خەسلەتی سەربەخۆی هونەر بگۆرن. پشتیوانیی هونەریی پیویستی بە پەرۆشی ئیستاتیکی نیە، بەڵام کاتیك ئەو هونەرانەی بە پیچەوانەی هونەری مۆزەخانەو پیشانگاو دەزگاکانەوە ئاراستە دەکرین، وەك هونەری بازرگانی، هونەری گەیاندنی گرافیکی و هونەری نمایشی بەرهەم.. لە کاتیکی وادا پاساوگەری بە شیوەیەکی زۆر زیندو دەردەکەویَ. ئەو خەلکانەی پشتیوانی لە هونەریکی لەمجۆرە دەکەن خاوەنی بیرۆکەی زۆر ئاشکران سەبارەت بە هۆکاری بوونی هونەرەکە، ئیدی ئەو هونەرمەندو نەخشەسازانە دەخەنەگەر کە دەتوانن ئەوەی لییان داوادەکریَ بە ئەنجامی بگەیەنن، هەربۆیە ئەنجامەکان توانایەکی زۆری گوزارشتیان دەبیَ هەروەك پیشتریش وتمان هونەری مەبەستگەری توانایەکی لەو جۆرەی هەیە.

ڕەنگە ڕەخنەی پاساوگەری لە تەنگژەدا بیت کاتیك ئەو هونەرە ڕەچاودەکەین کە ریزی لیدەگیریَ لەبەر چەند هۆیەك بەدەر لەو هۆکارانەی کە لە پیناویاندا بەرهەم هاتوە. کاتی خۆی مەبەست لە هونەری چاخەکانی ناوەراست بریتی بوو لە گەیاندنی رینماییەکانی کلیسا بۆ ئەو کەسانەی کە توانای خویندنەوەیان نەبوو. بەڵام ئیمە لەسەردەمی ئیستاماندا زۆربەمان توانای خویندنەوەمان هەیە، رینماییە ئاینیەکانیش بیجگە لە هونەر لە چەند سەرچاوەیەکی دیکەوە دین. هەرچەندە ئیمە تا ئیستا ریز لە پەیکەری رۆمانتیکی دەگرین چونکە زیندویتی، راستگۆیی سۆزداری و یەکیتی فۆرم و گوزارشت لەخۆدەگریَ. کەواتە ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە مەبەستگەری بە تیپەربوونی سەردەمەکان زیندویتی خۆی لەدەستدەداو دەبیتە تەنها راڤەکەری مەزنیی هونەر لە سەردەمە جیاوازەکاندا؟!

وەڵام: زۆر نا! چونکە لە راستیدا تیۆری مەبەستگەری (النظریة الذرائعیة) پشت ئەستوورە بە شیکردنەوەی زیرەکانەی چالاکیی هونەری. پاساوگەرەکانیش ئەوە دەزانن کە ئەو هونەرەی رۆژیَ لە رۆژان مەبەستگەلیکی دووری خزمەت کردوە، دواجار خزمەتی بەهەا فۆرمالیستی و گوزارشتخوازەکان دەکا. لە کاتیکدا ئەو بەهایانە لەناو خۆیاندا بنیات نراون بۆ ئەوەی بە شیوەیەکی چالاك بخریتەگەر، هەروەها خزمەتکردنی پادشا، یان کلیسا، یان حکومەت خوازیاری شکۆمەندییە لە هەموو ئاستەکاندا، هەر بۆیە کەسی پاساوگەر جەخت لەوە دەکا کە پیویستە چەند هاندەریکی زۆر بەهیز لە ئارادابن لە پیناو بەرهەمهینانی هونەریکی مەزندا.

کەواتە ئایا بە راستی ڕەخنەگری پاساوگەر ڕەخنەگریکی فۆرمالیستە یان



گوزارشتخوازیکە خوازیارە هونەر خاوەنی وروژاندنیکی هونەریی زیاتر بیت. وەڵام: نەخیر، چونکە کەسی پاساوگەر هاندەرەکە لە ئامانجەکە جیاناکاتەوە. لای مەبەستگەرەکان بەهای ئیستاتیکی سەربەخۆ لە ئارادا نیە. ماناو خۆشیەکانی هونەر هەمووی پیکەوە ئەزموون دەکرین، کاتێ بەشداری لە ئامانجە گەورەکانی ژیاندا دەکەن، لیرەوە کارەکەی مایکل ئەنجیلۆ کە ناونراوە پییتا *Pieta*بە شاکاریکی هونەریی لە قەلەم دەدرێ نەك لەبەرئەوەی روداویکی ئاینی ئاشکرا دەکا، بەلکو لەبەرئەوەی پالپشتی چەند بیرۆکەیەکی پیویست دەکا دەربارەی خۆشەویستی و خەم و خەفەتی دایك. هەر بۆیە فۆرم، مەبەست، بیرۆکە.. هەمووی پیکەوە تەواوکەری یەکترن. پاساوگەرەکان ریکخستنی فۆرمە بینراوەکان و ئەرکی گوزارشتی ئەو فۆرمانە پیکەوە ئەزموون دەکەن. ئەوان پیویستیان بە خەملاندن نیە ئەگەر بیتو پەی بە ریکخستنی توانا نمونەییەکان ببرێ یان نا، ئەوان کاتێ فۆرمەکانی کاری هونەری دەبینن ئامانجەکانیشی دەبینن. گەر نەشتوانن، یان هەست نەکەن، یان لە ئامانجی کارەکە نەگەن، ئەوا پییان وایە ئەو کارە شکستی خواردوە، هەربۆیە رەخنەیەکی لەم جۆرە ئاسانترە.

جۆریکی دیکەی باو لە پاساوگەری هەیە کە چاوەریی ئەوە لە هونەر دەکا مامەلە لەگەڵ بیرۆکە سیاسییە باوەکاندا بکا، بۆ نموونە رەخنەگرە مارکسیەکان داوا لە هونەرمەندان دەکەن گوزارشت بکەن لە ململانیی چینایەتی، چەوساندنەوەی گەل لە لایەن سەرمایەدارییەوە، پاوانکاریی کۆلۆنیالی و

قارەمـانیتی کریکـاران و چـەند بیرۆکەیـەکی لـەمجۆرە. ڕەخنـەی مارکسـی لـە باشـترین حالەتدا لیکدانەوەیەکی بەچیژ بەرهەمدینێ بۆ پەیوەندییە ئابوریەکان لە نیوان ئەوانەی هونەر بەرهـەمدینن و ئەوانـەی بـەکاری دینـن، بـەڵام ناتوانێ پیوەرەکانی شکۆمەندیی لـە هونـەردا فۆرمەلـە بکـا. لـە کـارە دیوارییـەکانی دیگـۆ ریڤـیرا *Rivera* *Diego* چـەندین دیمـەن خراونەتـەروو کـە چەوساندنەوەی جـەماوەری مەکسـیك وینادەکـا. ئامـانجی ئـەو تـابلۆ دیواریانـە دۆزینـەوەی هاندەریکـە بـۆ ئـەم مامناوەندیبوونـە بگەریتـەوە بـۆ مەبەستگەری، بەڵام راستتر وایە تۆمەت بخریتە پـاڵ دزیـوی و دلرەقیـی بیرۆکراسـیەتی حکومـەت. هاوڵاتیـان و سیاسـەتمەدارانی سیستمە دیموکراتیە خۆرئاواییـەکان زۆرجـار پـەنا بۆ تیۆرە باوەکانی مەبەستگەریی دەبـەن کە پییان وایە هونـەری باش ئەو هونەرەیە بە شـیوەیەکی ڕەسمـی خزمـەتی ئامانجـە راگەیـەنراوەکانی حکومـەت دەکـا، هونـەری خراپیـش ئـەو هونەرەیـە کـە دلنیاییمـان لیوەردەگریتـەوە، بە تایبـەتی کاتێ کە دزیـوە.

**یەکیتی سۆڤیتی (پیشو) بەوە دەناسریتەوە پالپشتی لەو جۆرە هونەرە کردووە کە گوزارشت لە دیدی ڕەسمی حکومەت دەکا**

گۆرانکـاریی شۆرشگیرانە، بـەڵام زمـانی فـۆرم تیـایدا جیـاوازی نیـە لەگـەڵ ئـەو کـارە ناشۆرشـگیرانە کـە لـە لایـەن ریڤـیرا و سـیجاگەرەکانەوە لـە سـەرەتای سـەدەی بیسـتەمدا ڕەنگکـراوە. بـە مانایـەکی دیکـە، ناوبـانگی بـەهیزی ریڤـیرا پشتئەسـتوورە بـە چەند بنەمایـەکی فۆرمالیستیی ئاشـکرا، واتـە کرۆکی کۆمۆنیستی لەگەڵ فۆرمی بۆرژوازیـدا تیکەڵاو کراوە.

یـەکیتی سـۆڤیتی (پیشـو) بـەوە دەناسـریتەوە پالپشـتی لـەو جـۆرە هونـەرە کـردووە کـە گوزارشـت لـە دیـدی ڕەسمـی حکومـەت دەکـا، زۆربـەی ئـەو کارانـە لـە رووی باشییەوە مامناوەندی بـوون، ڕەنگـە هۆکـاری واتـە ڕەنگـە کرۆکـی کیشـەکە ئـەوە بیـت مەبەستگەرەکان لە واقعدا فۆرمالیستی تیۆرین (نەك پراکتیکی).

سەرەرای پیشیلکاری مەبەستگەرەکان، بە تایبـەتی لـە سانسـۆری ڕەسمیـدا، بـەڵام یاساگەلیکی بەسوودمان دەداتێ بۆ ڕەخنـەی هونەری. چونکە یەکەم: هانی ڕەخنەگران دەدا بە دوای ئەو ئامانجە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و ئابووریانـەدا بگـەرین کـە هونـەر دەچیتـە خزمـەتیان. دووەم: پیگـەی هونـەر دووپـات دەکاتـەوە لـە بایەخـە باوەکـانی کۆمـەلگادا. سیهەم: مـەیل و خواسـتی ئەو هونەرمەندانـە راسـتدەکاتەوە کـە تەنـها سـەرقالی کیشـە تەکنیکییـە پەتیـەکانن. مەبەسـتگەری، بـە

مانایەکی تر، فەلسەفەیەکی رەخنەیی خراپ نیە، بەلکو بە پیچەوانەوە فەلسەفەیەکی بەهیزە. بەڵام رەنگە ببیتە چەکیکی کول کاتێ بیرۆکراتەکان پەنای بۆ دەبەن.

## ئەنجام

لەبەرئەوەی چەندین جۆر هونەر هەیە، ناکرێ تەنها تیۆریك بۆ هەلسەنگاندنی هەموویان شیاو بیت، بۆ نموونە کاتێ دیینە سەر رەخنەی هونەریی لە بواری تەلارسازی و پیشەو هونەرە پیشەسازیەکاندا، پیویستە ئەو شیوازانە بدۆزینەوە کە بایەخ بە بەهای ئیستاتیکی سودمەندیی یان پیشەوەری یان هیزی گوزارشت دەدا لە پرۆسەکانی فۆرمەلەکردن و دروستکردندا.

تاقە شتیك کە نابێ پەنای بۆ بەرین ئەوەیە بریاربدەین هەندێ بابەت لە رووی ئیستاتیکییەوە شیاو نیە، واتە پیویستە وریابین و تەنها ئەو کارە هونەریانەمان پێ باش نەبێ کە لەگەڵ سەرەتا رەخنەییەکانی خۆماندا دەگونجێ. کاتێ دەلیین فلانە شت هونەر نیە ئەوا دەمانەوێ خۆمان لە ئەرکی رەخنەیی ئەو شتانە بدزینەوە کە خۆشمان ناوین. گەر بمانەوێ لە هونەر بگەین دەبێ ئەو تیۆرانەمان پێ باش نەبێ کە بەر لە لیکۆڵینەوە بابەت گەلیکی دیاریکراو بە هەند دەگرێ و جیایان دەکاتەوە. کەواتە پیویستە پیناسەیەك بۆ هونەر بەکاربینین هەموو ئەو شتانە بگریتەوە کە مرۆڤ دروستی دەکا، دواتریش پیویستە خۆمان بەو هەلسوکەوتە رەخنەییانە تەیاربکەین کە توانامان پیدەبەخشێ بۆ لیکۆڵینەوە لە خەسلەتەکانی هەرکاریك کە داوامان لیدەکرێ حوکمی لەسەر بدەین.

## سەرچاوە

ادموند فیلدمان، مشاكل النقد الفنی، النقد الفني ت: د. زیاد سالم حداد. (بیروت: دار المناهل، ١٩٩٣)، ص ٤١-٦٩.

# میراتی دانپێدانەنراوی سێرڤانتس

• میلان کوندێرا

▪ لە ئەڵمانییەوە: کەریم پەڕەنگ

ڕەنگ بێ نووسین دەربارەی داهێنان لە لایەن داهێنەر خۆیەوەو بەرجەستەکردنی ئەو پرۆسیسەی فانتازیای پێدەوترێ گەورەترین ئاستەنگیک بێ کە رووبەرووی دەبنەوە. دەشی ئەو شتانەی بەسەر داهێنەر دین ببنە هەوین و کەرەستەی داهێنان و سنورە تەسکەکان ببەزینن و ریگای بوونە دەق بگرنە بەر. ئەوەی دژوارو ئەستەمە هەولدانە بۆ بە ئەقلانی کردن و تیۆریزەکردنی پرۆسەی داهێنان. میلان کوندیرا وەکو رۆماننووسیکی خاوەن ئەزموونیکی کۆن و قوول، هەولدەدا میژووی رۆمان لە سیرڤانتسەوە هەتا کافکاو برۆخ، نەك هەروەکو ژانریکی ئەدەبی، بەلکو وەکو دەروازەیەکی سەربەخۆ بۆچوونە نیو جیهانەوە، بەرجەستە بکا.



سیرڤانتس

میلان کوندیرا سالی ١٩٢٩ لە شاری (برنەو)ی چیکۆسلۆڤاکیا لەدایکبوە. سالی ١٩٧٥ ولاتەکەی بەجیهیشتوەو لەوساوە لە پاریس دەژی.

-١-

ئیدموند هوسەرل لە سالی ١٩٣٥دا، واتە سێ سال پیش مردنی، لە ڤینا و پراگ موحازەرە بەناوبانگەکانی دەربارەی قەیرانی مرۆڤی ئەوروپی دەوتەوە. بە ئاوەلناوی "ئەوروپی" ئەو شوناسنامە رۆحیەی ناوزەد دەکرد، کە لە دەرەوەی جوگرافیای ئەوروپا (بۆ نمونە لە ئەمەریکا) بلاوبوویەوەو سەرەتای بە فەلسەفەی یۆنانیە کۆنەکان دەستی پیکرد. بە رای وی ئەم فەلسەفەیە بۆ یەکەمجار لە میژوودا جیهان (بە سەرجەم) وەکو پرسیاریك

خۆی بەرجەستە دەکا. ناپرسێ بۆ ئەوەی پێویستییەکی پراکتیکی (عەمەلی) دیاریکراو بەجێبهێنێ، بەڵکو لەبەرئەوەی "جۆش و خرۆشێکی کۆششی بە مەعریفەکردن سەرتاپای مرۆڤی" داگرتوە.

هوسەرڵ ئەم تەنگژییەی هێندە بە قووڵ دەزانی کە لە خۆی بپرسێ، ئایا ئەوروپا لە توانایدایە بەسەر ئەم تەنگژییەدا زاڵبێ؟ بە ڕای وی ئەم تەنگژییە لە سەردەمی نوێوە لەگەڵ گالیلۆو دیکارتداو لە ئەنجامی یەکلایەنی زانستە سروشتییەکانەوە دەستی پێکردوە. ئەو زانستەی دنیا تەنیا بۆ توێژنەوەی بابەتێکی ماتماتیکی-تەکنیکی سنوردار دەکاو جیهانی بەرجەستەیی ژیان، /جیهانی/ ژیان، وەکو هوسەرڵ گوارشتی لێدەکا، لە بازنەی سیمای خۆی دوور خستۆتەوە.

تەوژمی زانستە سروشتیەکان مرۆڤی بەرەو دەربەندی ڕشتە تایبەتیەکان پاڵنا. هەتا پتر زانستی وەدەست دەهێنا، پتر سەرجەمی دنیاو خۆی لەبەرچاو ون دەبوو و بەم جۆرەیش بەرەو ئەو شوێنە ڕۆچوو، کە هایدگەری قوتابی هوسەرل بە فۆرمولە جوان و تەلیسماویی "لە بیرچوونی بوون"ی ناوزەد کرد.

ئەو مرۆڤەی ڕۆژێك لە ڕۆژان لە لایەن دیکارتەوە بۆ "سەروەری و خاوەنی سروشت" بەرزکرابویەوە دەبێتە بابەتی هێزەکان (تەکنیك، سیاسەت، مێژوو)، ئەو بابەتانەی تێیدەپەڕێنن، شتی باشتر وەدەست دەهێنن و داگیری دەکەن. بۆ ئەم هێزانە، بوونی کۆنکرێتی "جیهانی ژیان"ی هیچ بەهاو مانایەکی نیە، ئەو جیهانەی هەر لە دەستپێکەوە ئافەرۆز دەکرێ و لەبیر دەکرێ.

-٢-

بەلاَم ساولیکانەیە ئەو توندوتیژییەی سەردەمی نوێ تێیی دەنوانرێ وەکو مەحکومکردن بنرخێنین. ئەوەی زیاتر مەبەستە ئەوەیە کە ئەم دوو فەیلەسووفە مەزنە پەردەیان لەسەر فرە مانایی ئەو قۆناغە هەڵدایەوە کە هاوکات ڕۆچوون و گەشەکردنەو وەکو هەموو شتێکی مرۆڤانە تۆوی کۆتایی لە ماکی خۆیدا هەڵگرتوە. لە گۆشەنیگای منەوە ئەم فرە ماناییە لە نرخی ئەم چوار سەد ساڵەی ئەوروپا کەم ناکاتەوە، من زیاتر هەست بە پێبەندبوونی خۆمیان پێوە دەکەم، کە من فەیلەسوف نیم، بەڵکو ڕۆماننوسم. لەبەرئەوە بۆ من نەك هەر دێکارت، بەڵکو (سێرڤانتس)یش دامەزرێنەری سەردەمی نوێیە.

لەوانەیە ئەو دوو دیاردەگەرە لە حوکمیاندا دەربارەی سەردەمی نوێ کەم دیکارتیان ڕەچاو کردبێ. دەمەوێ بڵێم گەر ڕاست بێ، کە فەیلەسوف و زانایانی سروشت بوونی مرۆڤیان لەبیر کردوە، ئەوا ڕوون و ئاشکراتر دەبێ کە لەگەڵ سێرڤانتسدا هونەرێکی ئەوروپی مەزن شێوازی خۆی

وەردەگرێ، هونەرێك كە ئەم بوونە لەبیر كراوە تەیدەکا.

لە ڕاستیدا هەمو تێما مەزنەکانی بوون، ئەو تێمایانەی هایدگەر لە بوون و کاتدا ڕاڤەیان دەکاو لەو بڕوایەدایە ئەم تێمایانە لە لایەن سەرجەمی فەیلەسوفانی پێشوی ئەوروپاوە پشتگوێ خراون، ڕۆمان لە گەشەکردنی پتر چوار سەدەی خۆیدا (لە چوار سەد ساڵی دۆنادۆنی بەردەوامی ڕۆمانی ئەوروپیدا) ئەو تێمایانەی پیشانداوە، خستونیەتە ڕوو و ڕووناکی خستونەتە سەر، ڕۆمان بە کاوەخۆ، بە گوێرەی شێوازو لۆژیکی خۆی، گۆشەنیگا جیاوازەکانی بوونی دۆزیوەتەوە. لەگەڵ هاوچەرخەکانی سێرڤانتسدا پرسیاری سەرەڕۆیی قوتدەکاتەوە، لەگەڵ سامۆیل ریچاردسندا دەست بە تۆژینەوەی "چی لە ناخدا ڕوودەدا" دەکاو پەنجە نومای نهێنییەکانی ژیانی هەست دەکا، لەگەڵ بەلزاکدا ڕەگداکوتانی مرۆڤ لە مێژوودا دەدۆزێتەوەو، لەگەڵ فلۆبێردا پشکنینی دەڤەرێکی تا ئەو کاتە نەدۆزراوە دەست پێدەکا، لەگەڵ تۆلستۆیدا خۆی بە بڕیارە نائەقلانی و شێوازی بڕیارو ڕەفتارەکانی مرۆڤەوە خەریك دەکا، ئەمجا بە دوای قولاییەکانی کاتدا دەگەڕێ. لەگەڵ مارسیل پرۆستدا گەڕان بە دوای ئەو شتانەی کە گوزەراون و توانای ئەقڵ توانای تێگەیشتنیانی نیەو لەگەڵ جەیمس جۆیسدا گەڕان بە دوای قولایی چرکەکانی ئێستاو لە توانادا نەبونی ئەقڵ بۆ تێگەیشتنیان، دەست پێدەکا لەگەڵ تۆماس ماندا لە لێکۆڵینەوە لە ڕۆڵی ئەو ئەفسانە هەرە کۆنانەی لە دوورەوە هەنگاوەکانمان ئاراستە دەکەن. هەتا دوایی، هەتا دوایی.

**لە دەستپێکی سەردەمی نوێوە ڕۆمان هاوڕێیەکی هەمیشەیی و دڵسۆزی مرۆڤ بوە.**

لە دەستپێکی سەردەمی نوێوە ڕۆمان هاوڕێیەکی هەمیشەیی و دڵسۆزی مرۆڤ بوە. "کۆششی بە جۆش و خرۆش بۆ مەعریفە" (کە بە ڕای هوسەرڵ جەوهەری ڕاستەقینەی ئەقڵی ئەوروپی پێکدەهێنی) بەسەر ڕۆماندا زاڵە، بۆ ئەوەی لە ژیانی کۆنکرێتی مرۆڤ بکۆڵێتەوەو لە "بیرچوونەوەی بوون"ی بپارێزێ، بۆ ئەوەی "دنیای ژیان" هەمیشە ڕوناکی بخرێتە سەر. بەم مانایە لە هێرمان بڕۆخ تێدەگەم و لەگەڵیدا هاوڕام کاتێ لێبڕاوانە دووبارەی دەکردەوە: تاقە پاساوی بوونی ڕۆمانێك لەوەدایە کە تێڕوانینێکی نەناسراوی ژیان بدۆزێتەوە نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو تێڕوانینێك کە تەنیا ڕۆمان دەتوانێ بیدۆزێتەوە. ڕۆمانێك تا ئێستا بوارێکی نەناسراوی بوون نەدۆزێتەوە بێ مۆراڵە. مەعریفە تاقە مۆراڵی ڕۆمانە.

حەزدەکەم ئەمەشی بخەمە سەر: ڕۆمان کاری ئەوروپایە، دۆزینەوەکانی، هەرچی کە بە

زمانی جیاواز ڕویانداوە، هی هەموو ئەوروپان، مێـــژووی ڕۆمـــانی ئـــەوروپی لـــە دۆزینـــەوە یەکلەدوای یەکەکانی پێکهاتوە (نەك لە کـۆی ئـــەو شـــتانەی نوســـراون)، تـــەنیا بـــەم هاوپەیوەندییەی سەرووی نەتەوەوە دەتوانین بە ڕاستی لە بەهای کارێك (واتە مەودای دۆزینەوەی) بڕوانین و تێی بگەین.

-٣-

کاتێ خودا بە کاوەخۆ ئەو جێیەی چۆڵکردو کە گەردون و نەزمی جیهانی لێوە دەئاژوێ، باشی لە خراپ جودا کردەوەو هەر شتەو مانای خۆی پێبەخشی، دۆن کیخۆت لە ماڵەکەی هاتە دەرێ و نەیتوانی دنیا بناسێتەوە. چونکە لە نائامادەیی بەرزترین حاکمدا، لەپڕ دنیا لە فرەمانایییەکی دەژواردا دەرکەوت، تاقە حەقیقەتی خوایی بۆ سەدان حەقیقەتی ڕێژەیی پارچە پارچە بوو مرۆڤیش لەم حەقیقەتە ڕێژەییانەدا بەشداربوو. دنیای سەردەمی نوێ و لەگەڵیدا ڕۆمان وەکو وێنەو نموونەی سەردەمی نوێ سەیانهەڵدا.

ئەگەر دیکارت ملی بیرکەرەوەی بە بنەمای هەموو شتێك و هەموو کەسێك دەزانی، واتە بە تەنیا ڕووبەڕووی گەردون دەبووەوە، ئەمە هەڵوێستێکە، هیگڵ بە حەق بە هەڵوێستێکی پاڵەوانانە ناوزەدی کردبوو.

کە سێرڤانتس جیهان بە فرەمانا تێگەیشت و لە جیاتی بەرامبەر تەنیا حەقیقەتێکی ڕەها، لە بەرامبەر کۆمەڵێ حەقیقەتی ڕێژەیی و ناکۆك ڕاوەستا (حەقیقەتگەلێك کە لە لایەن منی خەیاڵییەوە بەرجەستە دەبن و فیگوریان ناودەنرێ)، ئەگەر بەمەش تاقە یەقینی حیکمەتی دڵنیا نەبوون هەبو، ئەوا پێویستی بە لای کەمەوە بە هێزێکی وەکو ئەوی پێشوتر هەیە.

ڕۆمانە مەزنەکەی سێرڤانتس دەیەوێ چی بڵێ؟ دەربارەی ئەم بابەتە نوسینێکی زۆر هەیە. هەندێك لەم ڕۆمانەدا ڕەخنەیەکی ئەقڵانی لە ئیدیالیزمی تەمومژاویدا، دۆن کیخۆتە دەبینن. هەندێکی دی بە خرۆشانی ئیدیالیزمێکی لەو بابەتەی تێدەگەن. ئەم ڕاڤانە هەردوکیان هەڵەن، چونکە لەو بڕوایەدا نین کە بنەمای ڕۆمان پرسیار کردنە، بەڵکو لەو بڕوایەدان کە بنەمای ڕۆمان حوکمێکی مۆراڵیی پێشوەختە.

مرۆڤ جیهانێك دەخوازێ تیایدا باش و خراپ بە ڕونی لە یەکدی جودا کرابنەوە، بەڵام مرۆڤ بەو داواکارییە زگماکە ڕامنەکراوە فرچکی گرتوە، حوکم بدا پێش ئەوەی تێبگا. چۆمە ئاینی و ئایدۆلۆژیەکانیش هەر بۆ لەم خواستەوە سەرچاوە دەگرن. خواستەکان کاتێك دەتوانن بە ڕۆمان ڕازیبن، کاتێك زمانە بە ڕێژەیی و فرەمانایی خەملاوەکەی بۆ ئیدیۆمە حاشاهەڵنەگرو دۆگماتیکیەکانی خۆیان وەردەگێڕن. داوا دەکەن یەکێك لەسەر حەق بێ، یان ئانا کارینینا قوربانیی ملهوڕێکی کەللە ڕەقە، یان قوربانی ئافرەتێکی بێ نەریتە، یان (ك)ی بێتاوان لە لایەن

دادگایەکی ناعادیلـەوە غـەدری لیدەکـرێ یـان عەدالەتیکی خودایە لە پشتی دادگاوەیـەو (ك) تاوانبارە.

ئـەم "یـان ئەمـە، یـان ئـەویان"ە نیشـانـەی بیتوانایی رووبەروبوونەوەی ریژەیی جەوهەری شـتە مرۆڤانەکانــە، نیشــانەی قبولنــەکردنی نائامادەیی بەرزترین دادوەرە. سـەختە لەسـەر بنــەمای ئــەم بیتواناییــە حیکمــەتی رۆمــان (حیکمــەتی نادلنیــایی) قبولبکــەین و لیــی تیبگەین.

-٤-

دۆن کیخۆتـە رووی کـردە جیــهانیك بــە فراوانــی لــە بەردەمیدا ئاوالە بوو، دەیتوانی بچیتە ناویەوەو گەر بیویستایە دەیتوانی جاریکی تر بۆ مالەوە بگەریتــــەوە. یەکــــەمین رۆمانەکانی ئـەوروپی سـەفەرن بەرەو دنیایەك کە بە رووکـەش بێ سنوورن. لە سـەرەتای ژاك لـو فاتالیسـت بـە ریگـادا هـەردوو پالەوانەکـە تووشی سەرسورمان دەکەین، مرۆڤ نازانێ لە کویوە دین و بۆ کوێ دەرۆن. لە کـاتیکی بـێ سەرەتاو بی کۆتاییدا دەژین، لە جیگایەکی بێ ســنووری نــاوەندی ئــەوروپادا، داهــاتووی هەرگیز کۆتایی نایەت.

لای بـەلزاك، نیـو ســەدە پـاش دیــدرۆ، ئاسۆی فراوان وەکو دەشت و دەریك لە پشتی ساختمانی مۆدیرنی دەزگا کۆمەلایەتیەکانەوە پۆلیس، دادوەریی، جیهانی پارەو تاوانکاریی، لەشـکر، دەولـەت– ونبـوە. سـەردەمی بـەلزاك سەردەمی تەوەزەلی خۆشنوودی سیرڤانتس و دیدرۆ ناناسیتەوە. ئەو سـەردەمە سـواری ئەو شـەمەندەفەرە بـوە کـە بـە میــژوو نـاودەبرێ. سواربوون ئاسانە، دابەزینەوە سەختترە. بەلام ئەم شەمەندەفەرە هیشتا هیچی سامناکی نیە، تەنانـەت شتی سەرنجراکیشـی دیاریکراویشـی هەیـە، پـەیمانی سـەرەرۆیی بەمـەیش پـەیمانی


بەلزاك

حـەیزەرانی مارشـال بە هـەموو موسافیرەکان دەدا.

دواییتر لای ئیما بۆڤاری ئاسۆ بـە جۆریـك دەبـێ کـە وەکـو پــــەرژینیك دەردەکــــەوێ. ســەرەرۆییەکان لــە پشــتەوە روودەدەن و نۆســــــــتالژیا بووردەبــاریی نــاکرێ. لــە وەرسی لە ژیانی رۆژانە خـەون گرنگی پـەیدا دەکا. بیکۆتـایی ونبــووی جیــــهانی دەرەوە لادەبـرێو بیکۆتـایی جیـهانی رۆح دەخریتــە جیگای. ئەو خەیالە مەزنەی کە تاك (فرد) تاقە دیاردەیــەو هیــچ شــتیك جیگــای ناگریتــەوە، یــەکیك لــە جوانــترین خەیالــە ئەوروپییــەکان چەکەرە دەکا.

بەلام خەونی بیکۆتابوونی روح تەلیسمی خۆی لەو چرکەساتەدا ون دەکا کە میژوو یان ئەوەی لە میژوو ماوەتـەوە هیزیکی سـەرووی

مرۆڤی کۆمەڵگایەکی بەسەر مرۆڤدا سەروەر زاڵ دەبێ، ئەم هێزە پەیمانی حەیزەرانی مارشاڵی ناداتێ، زۆر، زۆر پەیمانی پلەوپایەی مەساحێکی بداتێ. (ك) دەتوانێ چی بەرامبەر دادگا، چی بەرامبەر کۆشك بکا؟ ناتوانێ شتی زۆر بکا، ئایا دەتوانێ بە لای کەمەوە وەکو کاتی خۆی ئێما بۆڤاری خەون ببینێ؟ نەخێر تەڵەی بارودۆخەکە دژوارەو تێکڕای بیروهەستەکانی وەکو گسکی کارەبایی هەڵدەمژێ: تەنیا دەتوانێ بیر لە دادگاییکردنەکەی، بیر لە پلەوپایەکەی وەکو مەساح بکاتەوە. بێکۆتابوونی ڕۆح ئەگەر بوونی هەبێ، تا ڕادەیەك بۆتە پاشەڵێکی زیادەی مرۆڤ.

-٥-

ریگەی ڕۆمان شێوەیەکی هاوتەریبی ریچکەی میژوە. گەر ئاوریك بدەمەوە بۆ ئەوەی تەماشایەکی بکەم، بە شێوەیەکی غەریب کورت و داخراو دیتە بەرچاوم. ئەی ئەوە دۆن کیخۆتە خۆی نیە، پاش سەفەریکی سیسەدەیی وەکو مەساح خۆی پۆشیوەو بۆ گوندەکەی دەگەڕیتەوە؟ ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو ریی گرتە بەر، بۆئەوەی خۆی بداتە دەستی سەرکیشییەوە بەلام، وا لە گوندیکی بناری کۆشکدا توانای هەلبژاردنی نیە، سەرکیشی - شەریکی بێ مانا لەگەڵ کارگیریدا لەبەر هەلەیەك لە دۆسییەکەدا- بە سەریدا دەسەپینرێ، پاش سیسەد سال، ئەو سەرکیشیەی تیمای یەکەمی مەزنی ڕۆمان بوو چی بەسەردا هاتوە؟ ئەمە لاساییکردنەوەیەکی تەوسبازییانەی خۆی نیە؟ ئەی ئەمە چی دەگەیەنێ؟ گەر ریگەی ڕۆمان لە ناکۆکیەك (تناقض)دا کۆتایی بێ.

بەلێ مرۆڤ دەتوانێ وا هەست بکا، یەك ناکۆکی نیە، بە ناکۆکی تژییە، لەوانەیە سەرکیشییەکانی شڤایەکی سەرباز دوا ڕۆمانی مەزنی گەلی بێ. سەیر نیە ڕۆمانیکی کۆمیدی لە هەمان کاتدا ڕۆمانیکی جەنگی و لەشکرو بەرەی جەنگ شوینی روداوەکانی بێ؟ چی بەسەر جەنگ و دژوارییەکانیدا هاتوە، کە بووبیتنە مایەی پیکەنین؟

لای هۆمەرو تۆلستۆی جەنگ مانایەکی روون و ئاشکرای هەبوو: مرۆڤ خۆی بۆ هیلینای شۆخ و شەنگ یان بۆ روسیا بە کوشت دەدا. شڤایك و هاوەلەکانی دەچنە بەرەی جەنگ، بەبێ ئەوەی بزانن لەبەرچی و لە هەمووی سەرسورهینەرتر، بەبێ ئەوەی خەمی ئەوە بخۆن بۆچی.

بەلام گەر هیلیناو ولات نەبن ئەی چی دەبیتە غەریزەی جەنگ؟ هیزیك کە بە ئاسانی دەیەوێ وەکو هیز بلسەمینرێ، ئەو "خواستی خواستە"ی کە لە پاشاندا هایدگەر باسی دەکا؟ ئەی ئەو هیزە لە پشتی هەموو جەنگیکەوە نەبوە؟ بەلی بیگومان. بەلام ئیستا لای هاشەك هەموو بەلگەیەکی ئەقلانی لە دەستداوە. کەس بڕوای بە هاش و هوشی پروپاگەندە نیە، تەنانەت ئەوانەیش کە خۆیان

پروپاگەندە دەکەن. هیز رووتە، رووت وەکو لە رۆمانەکانی کافکادا. لە راستیدا دادگا قازانج لە هەلواسینی (ك) ناکا، کۆشك هیچی پینابرێ کاتێ مەساحەکە ئەزیەت دەدا. بۆچی ئەلمانیای دوینێ و روسیای ئەمرۆ دەیانەوێ دەست بەسەر جیهاندا بگرن؟ بۆئەوەی دەولەمەندتر بن؟ بەختەوەرتر بن؟ نەخیر. توندوتیژی و هیز خۆویست نیە، پالنەری نیە، تەنیا ویستی خۆی دەوێ، نائەقلانییەتیکی رووتە.

کافکاو هاشەك رووبەرووی ئەم ناکۆییە گەروەیەیان کردینەوە: لە سەردەمی نویدا لۆژیکی کارتیانی بەرە بەرە هەموو ئەو بەهایانەی لە چاخەکانی ناوەراستەوە بە میرات مابوونەوە شیتەلکردەوە، بەلام لە چرکەساتی سەرکەوتنی رەهای لۆژیکدا نائەقلانیەت (ئەو هیزەی تەنیا خواستی خۆی دەوێ)ی میژووی جیهان زالبوو، چونکە سیستەمیکی گشتگری دانپیانراوی بەها نەماوە دژی کار بکا.

ئەو ناکۆکیەی هیرمان برۆخ وەستایانە لە خەورۆکاندا بەرجەستەی کردوە لەو ناکۆکیانەن کە من حەزدەکەم ناوی "ئاخر زەمان"ی لی بنیم. هی تری لە بابەتەش هەن. بۆ نمونە سەردەمی نوێ ئاودیری خەونی مرۆڤایەتیەکی دەکرد کە پاش جودابوونەوەی بۆ ژیاری جوداواز و لە یەکدابراو رۆژێ لە رۆژان یەکیتییەك و ئاشتیەکی هەمیشەیی بەخۆوە دەبینی. ئەمرۆ میژووی هەسارەکەمان گشتیکی دابەشنەکراو پیکدەهینێ، بەلام جەنگ، ئەو جەنگەی دزە دەکاو هەمیشە دەگەریتەوەو بە کەوەخۆ خەونی یەکبوونی مرۆڤایەتی بە واقیع و بەرکەمال دەکا: یەکبوونی مرۆڤایەتی واتە: کەس ناتوانێ بۆ هیچ شوینیك قوتاری بێ.

-٦-

موحازەرەکانی هوسەرل دەربارەی تەنگژیی ئەوروپاو ئەگەری رۆچوونی مرۆڤایەتی ئەوروپی وەسیەتنامەی فەلسەفی وی بوون. ئەم موحازەرانەی لە دوو پایتەختی ئەوروپای ناویندا وتەوە. ئەم هاوکاتیە هەتا بلیی پر مانایە.

لە راستیدا بۆ یەکەمجار بوو خۆرئاوا لە میژووی مۆدیرنی خۆیدا لە ئەوروپای نویندا مەرگی خۆی، یان باشتر بلیین برینەوەی پارچەیەك لە جەستەی خۆی بە چاوی خۆی ببینی، کاتێ ئیمپراتۆریەتی روسیا وارشۆو بۆدابیست و پراگی هەللوشی. ئەم بەدبەختییە دەرئەنجامی شەری یەکەمی جیهان بوو، کە لە لایەن پاشایەتی هابسبورگەکانەوە هەلگیرسینرا، ئەمەش بوە هۆی کۆتایی خۆیان و ئەوروپای لاوازی بۆ هەمیشە لە هاوسەنگی خۆی ترازان. دوا کاتەکانی ئاشتی، ئەو کاتانەی مرۆڤ دەبوو تەنیا لە دیوەکانی رۆحی خۆی رزگاری ببێ، کاتەکانی جۆیس و پرۆست بەسەر چوون. لە رۆمانەکانی کافکا، هاشەك، موزیل و برۆخدا ئەم دیوە لە دەرەوە دێو ناوی میژوە. ئەم

میـژوە لەگـەڵ شـــەمەندەفەری سەرکیشـــەکاندا هاوشیوە نیە، چونکە ئەم میژوە شەخسی نیە، دەئاژۆترێ، حسابی بۆ ناکرێ، لیتیگەیشتنی بـۆ نیـە- و کەسـیش لیـی دەربـاز نابـێ. لـەم کاتـەدا (ماوەیـەکی کـەم پیـش جـەنگی ١٩١٤) کۆمــەلی ئەسـتیرەی رۆماننوسـە گـەورەکانی ئـەوروپای نیویـن لـە نـاچیزەیی ئاخرزەمـانی سەردەمی نوێ ئاگادار بوون و لیی تیگەیشتن و بەرجەستەیان کرد.

مــــرۆڤ نـــابی رۆمانــــەکانیان وەکــــو پیشـــــبینییەکی کۆمەلأیــــەتی و سیاســــی بخوینیتـەوە، وەکـو لەگـەڵ ئۆرویلـدا کـراوە، ئـەوەی ئۆرویـل وتویـەتی دەیتوانـی هـەر بـەو شـیوەیە (یـان باشـتریش) لـە وتـاریکدا یـان بەیاننامەیــــەکدا گوزارشــــتی لی بکـــا. بــــە پیچەوانــەوە ئــەم رۆماننوســانە شــتگەلیك دەدۆزنــەوە کــە "تــەنیا رۆمـــان دەتوانـــێ بیاندۆزیتـەوە": ئـەم رۆماننووسـانە پیشـانی دەدەن چـۆن لـەژیر مەرجـەکانی نـاچیزەیی ئاخرزەمـان هـەموو خانەبەندییـەکانی بـوون (وجـود) لـە پرمانایـەکی دی لـەخۆ دەگـرن. سەرکیشیی چیە، گەر ئـازادیی هەلسوکەوتی (ك) خـەیالپلأوی بـێ.؟ داهـاتوو چیـە، گــەر روناکبیرەکان "لـە پیـاوە بـی خەسـلەتەکان"دا هیـچ پیشـبینیەکان نـەبێ کـە رۆژی داهـاتوو جـەنگیك رایاندەمالـێ؟ تـاوان چیـە گــەر هۆگوەنۆی برۆخ ئەو کوشتنەی پیی هەستاوە نەك هەر لیی پەشیمان نیە، بەلکو سوك و سانا لە بیریشی چۆتەوە؟ گەر تاقە رۆمانی گەورەی کۆمیدیایی ئەو کاتە هی هاشەك بێ، کە جەنگ شـوینگەیەتی، "کۆمیدیـا" چـی بەسـەرهاتوە؟ جیاوازی لـە نیـوان شەخسـی و گشـتیدا چیـە، گـــەر (ك) نـــەتوانێ لـــە نوینـــی جیماعیشـــدا پییـەکانی بەبێ دەست و پیوەندەکانی کۆشـك رابکیشـێ؟ لـەم حالەتـەدا بە تـەنیا بـوون یـانی چی؟ تەنیا بوون نەنگیە، ترسە یان نەفرەتە کە دەیانویســـت وامـــان لیبگەیـــەنن؟ یـــان بـــە پیچەوانـەوە بە تـەنیا بوون بەنرخترین بەهایـە، لـە کـاتیکدا مـرۆڤ بـەر لافـاویکی لـە هــەموو شوینێ ئامادەی دەستەجەمع کەوتبێ.

ســــەردەمەکانی میـــژووی رۆمــــان زۆر دریژخایــــەنن. (ئــــەم ســــەردەمانە هیـــچ پەیوەندیـەکیان بـە گۆرانـی شـپرزەی مـۆدەوە نیە) و نایەلن ئەم یان ئەو روانگەیـەی وجـود خەسلەتدار بکەن، کە بە تایبەتی رۆمان جەغد لە دەرکەوتنیان دەکا ئەگەری دۆزینەوەی شتە رۆژانەکان لە لایـەن فلاوبیرتـەوە پـاش حـەفتا سـاڵ ئــەمجا جـــەیمس جۆیــس لـــە کـــارە مەزنـەکانیدا سـودیان لیوەردەگـرێ. وام بـۆ دەردەکــــەوێ ئــــەو قۆناغــــەی (قۆنـــاغی ناکۆکییەکانی ئاخرزەمـان) پیـش پـەنجا سـال ئەسـتیرە گەشـە رۆماننوسـەکانی ئـەوروپای نیویــن دەســتیان پیکــرد هیشــتا کۆتــایی نەهاتوە.

-٧-

زۆر جارو لـە میـژەوە باسـی ئـەوە دەکـرێ کــە رۆمــان کۆتــایی هــاتوە، بــە تایبــەتی

فوتوریست و سوریالیستەکان، بەلی زۆربەی پیشرەوەکان بانگداشەی ئەوەیان دەکرد. بە رای ئەوان دەبوو رۆمان لە میانەی پیشکەوتندا بە قازانجی داهاتوویەکی رادیکال، بە قازانجی هونەریك ون ببیّ کە هیچی هاوبەشی لەگەڵ رابردوودا نەبیّ. بەو پیودانگە بیّ دەبیّ رۆمان وەکو بینەوایی، چینە سەروەرەکان، ماشینە کۆنەکان و شەپقە بەرزەکان بە ناوی عەدالەتی میژووییەوە بنیژری.

بەلام گەر سیرڤانتەس بە یەکیك لە بنەمادانەرانی سەردەمی نویّ دابنریّ، دەبوو رۆچوون میراتەکەی لە نیشانەی گۆرانیك لە میژووی شیوازە ئەدەبیەکان زیاتر بیّ! دەبوو کۆتایی چاخی نویّ رابگەیەنیّ. لەبەر ئەم هۆیە ئەو زەردەخەنە پر لەزەتەی بیشەرمانە دیتە بەرچاو کە لاوانەوەی رۆمان بەرجەستە دەکا. لەبەرئەوەی مەرگی رۆمانم بە چاوی خۆم بینی، لەبەرئەوەی بینیم (لە ریگای قەدەغەکردن، سانسۆر، چەوساندنەوەی ئایدۆلۆژی) بە تۆپزی رۆمان لە جیهانیکا دەکوژرا کە بەشیکی زۆری ژیانی خۆم لەو جیهانەدا بەسەر بردو بە تۆتالیتیر ناودەبریّ. لە ئاشکرا ئاشکراتر بوو کە رۆمان کاتی بەسەر دەچیّ، هەروەکو چۆن خۆرئاوای چاخی نویّ بەسەر دەچیّ، رۆمان وەکو مۆدیلیکی لەسەر ریژەگەرایی و فرەمانایی رەگداکوتاو لەگەڵ گەردوونی تۆتالیتیردا ناگونجیّ، ئەم نەگونجانە هۆیەکەی لەوە قولترە لادەریك لە بیری گشتی لە کارمەندیکی دەولەت یان خەباتگیریك بۆ مافی مرۆڤ لە ئەشکەنجەدەریك جیادەکاتەوە، چونکە ئەم جوداوازییە تەنیا سیاسی و ئەخلاقی نیە، بەلکو زانستی بوونە. واتە: ئەو جیهانەی تەنیا لەسەر یەك حەقیقەت بیناکراوە لە جەوهەردا زۆر جیاوازە لەو دنیایەی لەسەر فرەمانایی ریژەگەرایی بیناکراوە. حەقیقەتی تۆتالیتاری ریگە لە ریژەگەرایی و گومان و خستنە ژیر پرسیاری شت دەگریّ و لەبەرئەوە هەرگیز هاوئاهەنگ نابیّ لەگەڵ ئەوەی کە من حەز دەکەم رۆحی رۆمانی نیو لیّ بنیم.

لە روسیای کۆمۆنیستدا سەدان، هەزاران رۆمان بە سەرکەوتووییەوەو بە تیراژی زۆرەوە بلاوناکرینەوە؟ بەلیّ، بەلام ئەم رۆمانانە دریژە بە داگیرکردنی بوونی نادەن. زەویی نویی بوون نادۆزینەوە، تەنیا وتراوەکان دەسەلمینن؛ لەوەش زیاتر: پاساوی ئەو بوونە، شوهرەت، قازانجیان بۆ کۆمەلگا، کە قازانجی خۆیانە دەسەلمینن و هەر لەوەدان ئەو شتە پیرۆز کەن کە مرۆڤ دەیلیّ (دەبیّ بیلیّ). لەبەرئەوەی هیچ نادۆزنەوە، بەشداریش نین لە "بە دوادا یەکهاتنی دۆزینەوەکان"، ئەو دۆزینەوانەی کە من بە میژووی رۆمانیان ناودەبەم، ئەم رۆمانانە لە دەرەوەی ئەم میژوەن، مرۆڤ دەتوانیّ بلیّ: ئەمانە /رۆمانی پاش میژووی رۆمانن/.

نزیکەی نیو سەدەیە میژووی رۆمان لەژیر کاریگەری کۆمۆنیزمی روسیادا راوەستاوە. بە پیوانەی گەورەیی رۆمانی روسی ئەمە

روداویکی مەزنە، لە گۆگۆڵەوە هەتا بیلەی. مەرگی رۆمان بیرۆکەیەکی بە واقیع نامۆ نیە. مەرگی رۆمان رویداوە. ئیستا دەزانین رۆمان چۆن دەمریَ: رۆمان ون نابیَ، رۆمان دەکەویتە دەرەوەی میژووی خۆیەوە، مەرگی رۆمان بە بیدەنگی روودەدا، بیَ ئەوەی هەستی پیبکریَ کەس بە مەرگی رۆمان دلتەنگ نابیَ.

-٨-

بەلاّم رۆمان بە پیودانگی لۆژیکی ناوەوەی ریگای خۆی نەبریوە؟ هەموو ئەگەرو مەعریفەو شیوازەکانی خۆی شەن و کەو نەکردوە؟ مرۆڤ میژووی رۆمانی لەگەڵ کانەرەژووی لە میژەوە خالی، بەراورد کردوە، بەلاّم ئەم میژوە پتر بە گۆرستانی هەلە لە دەستدراوەکان ناچیَ، بەو بانگانە ناچیَ کە نابیسترین. بۆ چوار بانگ بە تایبەتی گویَ قولاّخم.

١-بانگی یاری- "تریستترام شاند"ی لاورینس ستیرنەس و "ژاك لو فەتلیست"ی دەنیس دیدەرۆ، ئەمرۆ بۆ من وەکو باشترین دوو رۆمانی سەدەی هەژدە دەردەکەون، دوو رۆمانی وەکو یاری مەزن بەرنامە بۆ داریژراو، دوو لوتکەی پیشترو پاشتر پەی پینەبراوی ئاسانی، رۆمانی دواتر خۆی بە زۆرداریی ئەگەرەکان، دیکۆری واقیعی و نەزمی کرۆنۆلۆژییەوە کۆت و بەند کرد. ئەو بانگەی لەم دوو شاکارەدا بریاری ئەگەریان دراوە، دەیانتوانی زەنگی پەرەسەندنیکی دیکەی رۆمانمان بۆ لیدەن (بەلیَ مرۆڤ دەتوانیَ وینایەکی دیکەی رۆمانی ئەوروپی بکا..).

٢-بانگی خەون- ئەو خەیالەی لە سەدەی نۆزدەدا خەوی لیکەوت لەپر فرانتس کافکا بیداریکردەوە، ئەوەی بۆ کافکا لوا، ئەوەی پاشان سوریالیستەکان داوایان دەکرد؛ بەلاّم لە راستیدا بەدییان نەهینا: تواندنەوەی خەون و راستی بوو. لە راستیدا ئەمە کۆششیکی ئیستاتیکی کۆنی رۆمانەو نۆڤالیس خەملی بۆ لیدابوو، بەلاّم هونەری کیمیای پیویست بوو، کە سەد سال دواتر کافکا ئەم هونەرەی دۆزیەوە. ئەم دۆزینەوە مەزنە هیندە کۆتایی گەشەسەندنیك بەردەستە ناکات، هیندەی هامئامیزبوونیکی چاوەروان نەکراو دەردەبریَ، کە رۆمان لە زۆرداریە مەرجدارە شیمانەییەکان رزگار دەکاو ئەو شوینەی بۆ دیاری دەکا کە خەیال دەتوانیَ وەکو خەون خۆی تیدا خالی بکاتەوە.

٣-بانگی هزر- لەگەڵ موزیل و برۆخدا هۆشیکی سەروەرو بە جیلوە لە مەیدانی رۆماندا دەرکەوت. نەك بەوەی رۆمان بگۆرنە فەلسەفە، بەلکو لەسەر بنەمای گیرانەوە بە هەموو هۆیەك؛ ئەقلاّنی و نائەقلاّنی، گیرانەوەو رامان جەوهەری مرۆڤ روناك بکەنەوەو رۆمان بگەیەننە بەرزترین سینتیزەی روناکبیری، ئایا دەستکەوتەکانیان کۆتایی میژووی رۆمانە یان داوەتە بۆ سەفەریکی دریژ.

٤-بانگی کات- قۆناغی ئاخر زەمان داوا لە رۆماننووس دەکات پرسی کات وەکو

تەگـــەرەی یـــادەوەری شەخســـی پرۆســـت سـنووردار نـەکرێ، بـەلکو بـۆ ئـەوەی مەتـەلی دەسـتەجەمعی کـات، کـاتی ئـەوروپا فـراوان بکرێ، ئەوروپایەك سـەیری رابـردووی دەکـاو ئەنجامگیریی دەکا، بۆ ئەوەی لە میژووی خۆی تیبگات، وەکو مرۆڤیکی پیر چاویك بە ژیانی رابـردووی خۆیـدا دەگـیرێ. لەبەرئـەوە ئـەو تەوژمەی، بۆ ئەوەی سنوورەکانی کاتی مرۆڤی تاك، کە تا ئەوکاتە رۆمان خۆی پاپەندکردبوو ببـەزینرێ و چـەند قۆنـاغیکی میژوویـی شوینیان بدریتێ. (ئاراگۆن و فوینتەس هەولی ئەوەیان داوە).

بـەڵام مـن نامـەوێ دەربـارەی ریگاکـانی داهاتووی رۆمان، کە نایانناسم پیشـبینی بە دەسـتەوە بـدەم؛ تـەنیا دەمـەوێ بلیـم: ئەگـەر رۆمان بە راستی ونبێ، ئەوا نەك لەبەرئەوەی لە کۆتایی هیزیدایە، بەلکو لەبەرئەوەی خۆی لە دنیایەکدا دەبینیتەوە کە دنیای وی نیە.

-۹-

بـە واقیعکردنـی میـژووی جیـهان، ئـەو خەونە مرۆیانەیەی خودا بۆ خراپەکاریی ریی بـە واقیعکردنـی داوە، هـاوریی پرۆسیسـیکی سنووردارکردنی سەرسورهینەرە. ئەوە راستە کە قالۆنچەکانی سنووردار کردن لـە کەوناراوە ژیـانی مرۆڤیان خواردوە: تەنانـەت ئـەوین بـۆ ئیسکبەندییەکی هەژاری یادەوەریی سنووردار دەکرێ. بـەڵام خەسـلەتی کۆمـەلگای مۆدیـرن ترسناکانە ری بـۆ ئـەم نەفرەتـە خـۆش دەکا:

ژیانی مرۆڤ بۆ ئەرکی کۆمەڵایەتی سنووردار دەکـرێ، میـژووی گـەلیك بـۆ چـەند رووداویـك سـنووردار دەکـرێ، ئەمانـەیش بـۆ راڤەیـەکی رەوتگەرا تەسك دەکرینەوە، ژیانی کۆمەڵایەتی بـۆ خـەباتی سیاسـی و خـەباتی سیاسـی بـۆ رووبەرووبوونـەوەی دوو هـیزی جیـهانی تـەنگ دەکریتـــەوە. مـــرۆڤ تووشـــی گـــەردەلوولی تەسـکردنەوە بـوە، ئـەو "جیـهانی ژیـان"ەی هوسـەرل باسـی دەکـا، خـۆی کارەساتسـازانە تـــاریك دەکـــاو وجـــود دەبیتـــە قوربـــانی بیرچوونەوە، بەڵام دەبێ پاساوی بوونی رۆمان لـەوەدا بەرجەسـتە بـێ هەمیشـەو دووبـارە "دنیای ژیان" رووناکی بخریتە سەرو ئیمە لە "لەبیرچوونـەوەی بوون" قوتار بکا، ئەوسا لـە هەموو کاتیك پیویستتر نیە کە رۆمان هەبێ؟

بەهـەرحاڵ من وام بـۆ دەردەکـەوێ، بـەڵام مخـابن قالۆنچـەکانی تەسـککردنەوە دەکەونـە گیانی رۆمانیش، کە نەك تـەنیا مانـای جیـهان بـەلکو مانـای کـارە هونەرییـەکانیش بەرتەسـك دەکەنەوە. رۆمان (وەکو کەلتور بە شیوەیەکی گشی) هەمیشە پتر دەبیتە داماوی دەستی ئەو میدیایانـەی وەکـو پاشـەدزی بـە یـەککردنی میـژووی جیـهان پرۆسیسـی سـنووردارکردن فـراوان دەکـەن و ریـی بـۆ خـۆش دەکـەن، لـە هـەموو جیـهاندا هـەمان ئـەو ئاسـانکردنەوەو کلیشـانە بلاودەکەنـەوە، کـە ئەگـەر بکـرێ لـە لایەن ژمارەیەکی زۆرەوە، یان گـەر بتوانرێ لە لایـەن سـەرجەمی مرۆڤایەتیـەوە قبـول بکریـن، ئیـــدی ئـــەوەش گرنـــگ نیـــە کـــە ئۆرگانـــە

جیاوازەکانیان بەرژەوەندی جیاوازی سیاسی گوزارشت لێ دەکەن. لە پشتی ئەم جیاوازییە رووکەشەوە ئەقلیکی هاوبەش سەروەرە، هەر ئەوە بەسە لاپەرەی گۆڤارە هەفتانە سیاسییەکانی ئەمەریکاو ئەورووپاو لە راسترەوەوە بۆ چەپرەو، لە شپیگلەوە بۆ تایم هەلبدیەنەوە: هەموویان روانگەی هاوبەشیان بۆ ژیان هەیە کە لە بە دوای یەکداهاتنی هاوشێوەی پیرستەکان، هاوشێوەیی مانشیتەکان، شێوازە رۆژنامەوانییەکان، گەنجینەی وشەی هاوشێوە، ئاراستەی چەژی هونەری لە یەکچوو و هەرەمی هاوشێوە خۆی دەنوێنێ، چی بە گرنگ دەزانن و چی بەبێ بایەخ دەزانن. ئەو هەلویستە گشگرەی ماس میدیای لە پشتی فرە رەنگیی سیاسیەوە خۆی مەلاس داوە، ئەقلی ئەم سەردەمەمانە. من وایدەزانم کە ئەم ئەقلە لەگەڵ ئەقلی رۆماندا ناکۆکە.

ئەقلی رۆمان ئەقلی ئالۆزیە: هەموو رۆمانیك بە خوینەرانی دەلێ: "شتەکان لەوە ئالۆزترن کە بیریان لیدەکەیتەوە." ئەمە حەقیقەتی ئەزەلی رۆمانە، کە لە هەراو هوریای وەلامە سادەو خیراکان، ئەو وەلامانەی پیشی پرسیارەکان دەکەون و ئافەرۆزیان دەکەن و هەمیشە کەمتر گویگر بۆ خۆیان دەدۆزنەوە. بۆ ئەقلی ئەم سەردەمەمان، یان ئانا، یان کارینین، یەکیکیان لەسەر حەقە، زانایی کۆنی سێرڤانتەس، کە زەحمەتی ناسینەوەو تینەگەیشتنمان لە حەقیقەت بۆ روون و ئاشکرا دەکا، وەکو وەرسکەرو بیسوود تەماشا دەکرێ.

> ئەقلی رۆمان ئەقلی ئالۆزیە: هەموو رۆمانیك بە خوینەرانی دەلێ: "شتەکان لەوە ئالۆزترن کە بیریان لیدەکەیتەوە." ئەمە حەقیقەتی ئەزەلی رۆمانە

ئەقلی رۆمان ئەقلی بەردەوامیە: هەموو کاریکی هونەری وەلامی کاریکی هونەری پیشووترە، هەموو کاریکی هونەری سەرجەمی ئەزموونی پیشووتری رۆمانی وەخۆ گرتوە. بەلام ئەقلی سەردەممان لە هەنوکەیی چەقی گرتوە، کە هیندە جیگرو بەرفراوانە رابردووی لە بازنەی سیمامان دورخستۆتەوە، کاتی لە چرکەساتی ئیستادا تەسك کردۆتەوە. رۆمانی لەم سیستەمەدا قەتیسکراو کاری هونەری نیە (شتیك کە بەردەوامەو دەبی رابردوو بە داهاتوەوە ببەستریتەوە)، بەلکو پیشهاتیکی ئیستاییە وەکو هەموو پیشهاتیکی دی، ئاماژەیەکە بۆ سبەی.

-١٠-

ئایا رۆمان لە جیهانیکدا کە "هی خۆی نیە" ون دەبێ؟ بۆ ئەورووپای "لە بیرچوونەوەی بوون"ی بەجی دەهیلێ؟ جگە لە چەنەبازیی بیکۆتایی گرامافۆنەکان هیچی تر دەمینیتەوە،

هیچی تر جگە لە "میـژووی رۆمـان لـە پـاش میـژووی رۆمـان بـەجی دەمینـیٚ؟" مـن نـازانم، بـەلاّم لـەو بروایـەدام، کە رۆمان نایـەلی رۆحـی سـەردەممان هـەروا بحەسـیتەوە، گـەر لـە مەودواش بیـەویٚ نەزانراو بدۆزیتـەوە، گەر لـە خەسـلەتیدا بیـەویٚ وەکـو رۆمـان "گەشـە بکات"، تـەنیا دەتوانـیٚ دژی پیکـەوتنی جیـهان بیکا.

پیشرەوایەتی شتەکان بە جۆریکی دیکە دەبینی؟ ئەو تەماحەی هەبوو لەگەلّ داهاتوودا هاوئاهـەنگ بـیٚ. هونەرمـەندە پیشـرەوەکان کارگەلیکیان ئەنجامداوە، کە ئازایانـەو سـەخت و شەرەنگیز بوون و تەوسیان پیکرا، بەلاّم ئـەم پیشـرەوانە لـەو یەقینـەدا بـوون کـە "رۆحـی سـەردەم" لـە گەلیانـدایـەو بـەم زوانـە حـەقیان پیدەدا.

منیـش لـە رابـردوودا وامدەزانـی کـە داهـاتوو تاقـە دادوەری کـارو هـەلس و کەوتەکانمانەوە. دواییتر تیگەیشتم کە لەگەلّ ئـایندە چاوبرکـیٚ، خراپـترین خۆگونجاندنـە، خزمەتکارییـەکی ترسـنۆکانەیە بەرامبـەر بـە بـەهیزتر، چونکـە ئـایندە هەمیشـە لـە ئیسـتا بـەهیزترە. بیگومـان ئـایندە حوکممـان بەسـەردا دەداو بـە دلنیاییـەوە بـەبیٚ هیـچ پسپۆرییەك.

بەلاّم گـەر ئـایندە لـە گۆشـەنیگای منـەوە بەهایـەك بەرجەسـتە نـەکا، مـن پابـەندی چـی شـتیك بم؟ خـوا؟ ولاّت؟ گـەل؟ تـاك؟ وەلاّمەکـەم جیگـای تەوسـەو بـە هـەمان شـیوەیش راشـکاوانەیە: مـن تـەنیا پابـەندی مـیراتی دانپیدانـەنراوی (سیرڤانتس)م.

# ئەو ڕۆژەی کە ئیدی پانورژ کەس ناخاتە پێکەنین

• میلان کۆندێرا
▪ لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد


میلان کۆندیرا

## تەنز ئەفراندن

خــاتوو گرانــد گوزیـــەی دووگیـــــان، ورگیکـــــی زۆری خواردبـــوو، ناچـــاربوون لەبـــەر سکەکەی دەرمانی رەوانی بدەنێ، دەرمانەکـە زۆر بــەهیز بــوو، بۆیــە هــەڤاڵ زارۆکەکـــەی دەرکیشا، گارکانتیای کۆرپەلە چوە ناو یەکیك لە دەمارەکانەوە، لەگەڵ تەوژمی خویندا بەرەو ژوور سـەرکەوت، هـەتا لـە گویــی دایکیـــەوە هاتەدەرێ.

هـەر لـەم سـەرەتایەوە، کتیبەکـەی رابلیــە دەسـتی خـۆی دەخاتــە روو، ئـەوەی لــیرەدا دەیگیریتەوە شتیکی جیدی نیە، بەو مانایـەی جـەخت لەسـەر حەقیقەتـەکان (زانستی بن یـان ئەفسـانەیی) ناکـات. ئـەو باســی رووداوەکــان ناکات وەك لە واقیعدا هەن.

سەردەمی **پـیرۆزی رابلیـە**: رۆمـان وەك پەپوولەیـــەك هیشـــتا تـــالی قۆزاخەکــەی بــە لەشــیەوەیەتی و دەفریـت، **پانتـاگرویل** بـە هەیکەلـە زەبەلاحەکەیەوە، سەر بە حیکایەتە خەیالیە کۆنەکانە، لە کاتیکدا کە **پانورژ** هیشتا لـە سنوری ئاینده نادیارەکەی رۆماندایە، ئـەم چرکەسـاتە ئاوارتەیـە (استثناء) کـە هونــەری نویی تیا لەدایك دەبیت، ئاوازیکی هەرە خۆش بە کتیبەکەی رابلیە دەبەخشیت، هەموو شتیك لەو هونەرەدا هەیە، ئەوەی دەشیت رووبدات و ئەوەیش کە ناشیت، مەجاز، داشۆرین، زەبەلاح و مرۆڤــی ئاســایی، قســەی خــۆش، رامــان، سـەفەری راستەقینەو خـەیالی، چـەندوچوونی زانســـتی، جــوان دەربریـــن. رۆماننوســـی ئەمرۆمان، کە میراتگری رۆماننوسانی سەدەی نۆزدەیە، هەست بە نوستالۆژیایەك دەکات کە

تێکەڵـــە بـــە ئـــێرەیی پێـــبردنی دنیـــا سەرسوڕهێنەرەکەی ڕۆماننوسـە بەراییـەکان و ئەو ئازادیە شادی بەخشەی کە تیا ژیاون.

وەك چـــۆن ڕابلیـــە هـــەر لـــە لاپـــەڕە سەرەتاییەکانی کتێبەکەیدا گارگانتیا بە هۆی گوێی دایکیەوە دەخاتە سەرشانۆی دنیا، هەر بەو جۆرەیش **سەلمان ڕوشدی**، لە ڕۆمانی ئایەتە شـەیتانیەکاندا، دوای ئـەوەی لـە ئاسمـانـدا فڕۆکەکە دەتەقێتەوە، هەردوو کاراکتەرەکـەی، بـــە دەم زۆر وتـــن و گۆرانـــی و ڕەفتـــاری گاڵتەجاڕانەیانەوە کە لێیان چاوەڕێ نـاکرێت دەکەونـە خـوارێ، لـە کـاتێکدا کـە "لەسـەرو خـوارو پشـتیانەوە لـە ئاسمـان" کورسـیە سەیارەکان، پەرداخی کارتۆنی، دەم هـەڵبێنی ئۆکسجین، گەشتیارەکان وەدەردەکەون، یەکێك لەو کاراکتەرانە کە ناوی جبریل فریشایە/ "لە هـەوادا مەلـە دەکـات، بازرەقـە دەبەسـتێت و دەفرێـت، بـە دەسـت و پێـی والأکراویـەوە لـە شێوەیەکی بێ کۆتایی و لەو کازیوەدا" ئەوی تریان، سالادین شامشا، وەك سێبەرێکی تـەنك [..] بـــەرەو خـــوار دەبێتـــەوە، بـــەرگێکی خۆڵەمێشی قۆپچەڕێزی لەبەردایە، باسکی بە لەشـــیەوە نوســـاوە [..] کڵاوێکـــی بازنـــەیی لەسەردایە.

ڕۆمانەکـە بـەو دیمەنـە دەسـتپێدەکات، چونکە **ڕوشـدی** وەك ڕابلیـە ئـەوە دەزانێـت کـە لێکگەیشتن لە نێوان ڕۆماننووس و خوێنـەردا دەبێـت لـە سـەرەتاوە داڕێـژراو و پتـەوبێت، دەبێت لێکگەیشـتنێکی ڕوون و ئاشـکرا بێـت: ئەوەی لێرەدا دەگێڕرێتەوە کارێکی جیدی نیە، تەنانـەت ئەگـەر باسەکە پەیوەندی بە شـتێکی زۆر مەترسیداریشەوە هەبێت.

**تێکەڵبوونی نێـوان نـاجیدی و تـرس:** ئـەم دیمەنـــە لـــە بەشـــی چوارەمـــی کتێبەکـــەی ڕابلیەدایـــە: بەلـــەمێکی پانتـــاگرویل، لـــە ناوەڕاسـتی دەریـادا تووشـی کەشـتیەك دێـت مـەڕی هـەڵگرتوە، کـە یـەکێك لـە بازرگانـەکان پـــانورژ بـــە پـــانتۆڵێکی بـــێ فەتحـــە و چاویلکەیەکـەوە دەبینێت کە بە کڵاوەکەیـەوە هەڵواسـراوە، خـۆی بـەوە دەزانێـت کـە بـۆ سەرنجڕاکێشانی خەڵکی بـە مـێردی خەڵـەتاو ناوزەدی بکـات. پـانورژ زوو دێتـە دەسـت و تۆڵەی خۆی لێدەکاتەوە، مەڕێك لە بازرگانەکە دەکڕێت و فڕێی دەداتە نێو دەریاکەوە، هەموو مـەڕەکانی دی بە دوای ئەودا خۆیان لە دەریا دەهاون، چونکە ئاسایی دوای سەرقافڵەکەیان دەکەون. بازرگانەکان دەهەری دەبن و هۆشیان لەسـەردا نـامێنێت، دەکەونـە گرتنـی خـوری و شـاخیان، مـەڕەکان ئـەوانیش لەگـەڵ خۆیـاندا بەکێش دەکەنە ناو دەریاکەوە، پانورژ سەوڵێك لە دەست دەگرێت، نەك بـۆ ئـەوەی ڕزگاریـان بکـات، بـەڵکو بـۆ ئـەوەی نـەهێڵێت بـە کەشتیەکەدا هـەڵزنێن و بگەڕێنـەوە نـاوی، بـە قسەی چاکیش دەکەوێتە ئامۆژگاریان کە ئەم دنیایـــە نـــاخۆش و نەگبەتـــەو، شـــادی و بەختـەوەری لـە دنیاکـەی تردایـە، جـەختیش لەسەر ئەوە دەکات کە مردوەکان لە زیندوەکان بـەختیارترن، هـەروەها هانیـان دەدات، ئەگـەر

حەزیان لە ژیانی ناو مرۆڤە، پەیڕەوی لە یونس پێغەمبەر بکەن و دەست و پەنجەیەك لەگەڵ نەهەنگێکدا نەرم بکەن. دوای خنکانی هەموویان، جانی هاوڕێی پیرۆزبایی لە پانورژ دەکات و، لۆمەی ئەوەیشی دەکات کە بۆچی پارەی داوەتە بازرگانەکە، چونکە پارەکەی بە فیڕۆ ڕۆشتوە، پانورژ پێی دەڵێت "بەناوی خوا، بایی پەنجا هەزار فەرەنگ ڕامبواردوە".

**ئۆکتاڤیۆپاز دەڵێت: "نە هۆمیرۆس و نە ڤیرجیل تەنز (فکاهە)یان نیە**

ئەم دیمەنە ڕاست نیەو هەرگیزیش ڕوونادات، ئەی چ مانایەکی هەیە؟ ئایا ڕابلیە ئەم دیمەنەی بۆیە نوسیوە کە بڵێ بازرگان سوکەو سزادانیان شادمانمان دەکات؟ یان دەیەوێت دژ بە دڵڕەقیەکەی پانورژ بمانهەژێنێت؟ یان گاڵتەی بە قەشەکان دێت؟ بە گەمژایەتی ئەو کڵێشە دینیانەی کە پانورژ دەیانڵێت؟

دەی هەڵی بێنن! هەموو وەڵامێك تەڵەیەکە بۆ گەمژەکان.

ئۆکتاڤیۆپاز دەڵێت: "نە هۆمیرۆس و نە ڤیرجیل تەنز (فکاهە)یان نیە، دەشێت ئاریوست هەستی پێکردبێت، بەڵام **تەنز** لە سیرفانتسەوە داکەوت /../ پاز لەسەری دەڕوات: "تەنز لە داهێنانە مەزنەکانی گیانی مۆدێرنەیە"

***بیری سەرەکی:*** تەنز هاودەمیەکی کۆنی لەگەڵ مرۆڤدا نیە، بەڵکو لەگەڵ لەدایکبونی ڕۆماندا داهێنراوە، کەواتە تەنز نە پێکەنینەو نە گاڵتە پێکردنەو نە داشۆرینە، بەڵکو جۆرێکی تایبەتیە لە کۆمیدیا. ئۆکتافیوپاز لەو بارەیەوە دەڵێت: (ئەمەیش یەکەم هەنگاوە بۆ تێگەیشتنی جەوهەری تەنز) تەنز "دەست لە هەر شتێکەوە بدات تەم و مژاوی دەکات" ئەوانەی ناتوانن چێژ لەو دیمەنە وەربگرن کە چۆن پانورژ بازرگانی مەڕەکان بە نوقمکردن دەدات و هەر لەو کاتەیشدا ستایشی خۆشی ژیانی ئەو دنیایان بۆ دەکات، ئەوە هیچ لە هونەری ڕۆمان تێنەگەیشتوە.

**ئەو ناوچەیەی داوەریە ئاکاریەکانی تیاهەڵدەواسرێت.**

ئەگەر یەکێك لێم بپرسێت هۆی سەرەکی لێکنەگەشتنی نێوان من و خوێنەرەکانم چیە، بێ دوودڵی دەڵێم: تەنز. زۆر نەبوو هاتبوومە فەرەنساو هێشتا بە تەواوی نەکەوتبوومە خۆشیەوە، کە پرۆفیسۆرێکی بەناوبانگی بواری پزیشکی ویستی بمبینێت، چونکە خۆشی لە ڕۆمانی **ڤالسیماڵئاواییەکەم**(١) هاتبوو، من هەستم بە فیزوشانازی کرد، چونکە بە ڕای ئەو پرۆفیسۆرە، ڕۆمانەکەم پێشبینی کێشەیەکی گرنگی ئایندەی تیاکراوە، کەسایەتیەك بەناوی دکتۆر سکریتاوە، لە شارۆچکەیەکدا کە گەڕاوی

تیایە، چاری ئەو ژنانە دەکات کە وا پێدەچێت نەزۆك بن و منداڵیان نەبێت، بە هۆی سرنجێکی تایبەتەوەو بە نهێنی تۆوی خۆیان تێدەکات. ئەم پرۆفیسۆرە داوای هەڤپەیڤینێکی لەگەڵدا کردم لە بارەی پیتاندنی دەستکردەوە. پارچە کاغەزێکی لە گیرفانی دەرهێناو سەرە قەڵەمی قسەکانی خۆی بۆ خوێندمەوە: دەبێت نەزانرێت ئەو تۆوە هی کێیەو بە خۆڕایی ببەخشرێت (لەوکاتەدا سەیری چاوی کردم) دەبێت سێ هۆی خۆشەویستی لە دوای خەڵات کردنەکەیەوە هەبێت: خۆشەویستی منداڵدانێکی نادیار کە حەزی بەوەیە ئەرکێکیخۆی بەجێبێنێت، خۆشەویستی خەڵات کەرەکە بۆ تاکگەراییە تایبەتیەکەی کە ئەو خەڵاتەی لێکەوتۆتەوە، سێیەمیش خۆشەویستی بۆ ئەو ژن و مێردەی کە خەمبارن و تینوی منداڵن، دیسان لە چاوی ڕوانیمەوە: لەگەڵ ئەوەیشدا کە زۆری ڕێزلێگرتم، ڕێی ڕەخنە لێگرتنیشمی بە خۆیدا: نەیتوانی بە شێوازێکی تەواو قایلکەر تەعبیر لەوە بکات کە جوانی ئەخلاق لە تۆو خەڵات کردندا چیە. من بەرگریم لەخۆم کردو وتم: ڕۆمانەکە کۆمیدیە: پزیشکەکەیش فانتازیە، نابێت شتەکان وا بە جیدی وەربگیرێن! بە دوودڵیەوە وتی: کەواتە نابێت ڕۆمانەکانت بە جیدی وەربگیرێت، من پەشۆکام، لە پڕا هاتمەوە سەرخۆم، ئەوسا لەوە گەیشتم کە هیچ شتێك لە تێگەیشتنی تەنز سەخت تر نیە؟

**لە کتێبی چوارەمدا:** زریانێك لە دەریادا هەڵدەکات، هەموو سەرنشینەکان دەچنە سەرەوەو هەوڵی ڕزگاربوونی کەشتیەکە دەدەن، تەنیا پانورژ، کە لە ترسا شەپلە لێی داوەو بەردەوام دەناڵێنێ، بە درێژایی چەند لاپەڕەیەك ناڵە درۆزنانەکەی بەردەوامە، کە زریانەکە کڕدەبێت، ئازا دەبێتەوە، لەسەر تەمەڵی سەرکۆنەی ئەوانی تر دەکات، لە هەموو خۆشتر ئەوەیە: ئەم پیاوە ترسنۆك و تەمەڵ و درۆزن و تەفرەدەرە، نەك وامان لێناکات کە ڕقمان لێی بێت، بەڵکو هەر لەو کاتی چەنەبازیەیدا زیاتر خۆشمان دەوێت. هەر لەو پەرەگرافانەدایە کە کتێبەکەی ڕابلیە ڕاست و دروست دەبێتە ڕۆمان، واتا ئەو ناوچەیەی داوەریە ئاکاریەکانی تیا هەڵدەواسرێت.

هەڵواسینی داوەریەکی ئاکاریانە بە مانای بەدئاکاری ڕۆمان نیە، بەڵکو ئەوە خودی ئاکارەکەیەتی. ئەو ئاکاریەتیەی (الاخلاقیە) بە پێچەوانەی ئەزمونی ڕەسەنی مرۆڤەوە، بە پەلە، بەردەوام، پێشوەخت و بێ تێگەیشتن، داوەریی بەسەر خەڵکەوە دەکات، ئەم جۆرە داوەریە کە بە پەلەپرۆزێ دەکرێت، لە گۆشەنیگای حیکمەتی ڕۆمانەوە، بێ عەقڵیەکی گەورەی قێزەون و کوشندەترین نەخۆشیە. ئەمە بەو مانایە نیە کە ڕۆمان نوسی بە شێوەیەکی ڕەها ڕەوایەتی داوەریەکی ئاکاریانە ڕەت دەکاتەوەو نایسەلمێنێت، بەڵکو ئەوە دوا دەخات بۆ دوای

ڕۆمانەکە، لەوێدا، ئەگەر حەزی لێدەکەن، لەسەر ترسنۆکی سەرکۆنەی پانورژ بکەن، سەرکۆنەی ئیما بوڤاری و راستینیاك بکەن، کەیفی خۆتانە، بەڵام ڕۆماننوسی کاری بەم شتانە نیە.

دروست کردنی زەمینەیەکی خەیاڵی کە داوەریی ئاکاری تیایدا هەڵواسرابێت، کارێکی یەکجار گەورەو پڕبایەخە: تەنیا لەوێدایە کە کەسایەتیەکانی ڕۆمان پێدەگەن، کەسانێك نەك بووبێتنە وابەستەی حەقیقەتێکی پێشان دەستنیشان کراو، نەك وەك ڕەمزی خێرو شەڕ، نەك وەك وێناکردنی چەند یاسایەکی بەرچاوی بە بێنەو بەردە، بەڵکو وەك بونەوەرێکی سەربەخۆ کە لەسەر ئاکاری تایبەتی خۆیان و، یاسای تایبەتی خۆیان دامەزراون. کۆمەڵگای خۆرئاوا ئاسایی خۆی وەك کۆمەلگای مافی مرۆڤ شوناس دەکات، بەڵام پیش ئەوەی مرۆڤ بە مافی خۆی بگات، دەبیت خۆی وەك تاکیك بسەلمینیت، خۆی بە فلان کەس بزانیت و خەلکیش هەر بە فلان کەسی بزانن، ئەمەیش بێ ئەزمون کردنی زۆری هونەرە ئەوروپاییەکان، بە تایبەتی هونەری رۆمان نەدەهاتە دی، ئەم هونەرە خوینەر فیری ئەوە دەکات کە لە سۆراغی کەسانی تردا بیت، هەولی ئەوە بدات لەو راستیانە بگات کە پیچەوانەی راستیەکانی خۆیەتی، بەم مانایە، **سیوران** تەواو راست دەکات کە کۆمەلگای ئەوروپایی ناونـاوە "کۆمەلگای رۆمان" کە باسی ئەوروپاییەکانیش دەکات پییان دەلیت "نەوەی رۆمان".

## پیشیلکردنی پیرۆزیەکان:

نەهیشتنی سیمای خوایەتی بەسەر دنیاوە (*Entgotterung*) یەکیکە لە دیاردە هەرە تایبەتمەندیەکانی سەردەمی مۆدیرنە، نەهیشتنی سیمای خوایەتی بە مانای گومرایی (الحاد) نایەت، بەلکو ئاماژەیە بەو حالەتەی کە تاك، وەك خودیکی بیرکەرەوە، جیگای خوا دەگریتەوە کە بنەمای هەموو شتیکە، مرۆڤ هەر دەتوانیت باوەرەکەی بپاریزیت، لە کلیسەدا بکەویتە سەر ئەژنۆ، لە جیگاکەیدا نویژ بکات، بەلام دوای ئەوە. ئەو بروابوونەی تەنیا پەیوەندی بە خودی دنیای ئەوەوە هەیە. هایدگەر لەم باسەدا دەگاتە ئەم ئەنجامە: "بەم جۆرە خواکان کۆچیان کرد، ئەم بۆشاییە بە دۆزینەوەی میژوویی و دەروونناسی ئەفسانەکان پردەبیتەوە".

ئیمە کە دۆزینەوەی میژوویی و دەرونیمان بۆ ئەفسانەو دەقە پیرۆزەکان کرد واتا: بە دنیایی کردن و، پیشیلکردنی پیرۆزیەکان، وشەی بە دنیایی کردن (*Profane*) لە وشەی لاتینی (*Profaum*)ەوە هاتوە، واتا شوینیکی بەردەم پەرستگا، دەرەوەی پەرستگا، کەواتە پیشیلکردن گویزانەوەی پیرۆزیەکانە بۆ دەرەوەی پەرستگا، بۆ بواریك لە دەرەوەی ئایندا، ئەو کاتە رۆمان بە تەواوی پیشیل دەکریت کە پیکەنین لە فەزای رۆماندا

بە نهینی بڵاوبیتەوە. چونکە ئاین و تەنز دوو شتی دژ بە یەکن.

**چوارینەکەی تۆماس مان** بە ناوی "جوزیف و براکانی" کە لە نیوان ساڵانی ١٩٢٦-١٩٤٢ نوسیویەتی "دۆزینەوەیەکی میژوویی و دەرونی" بەرزی ئەو دەقە پیرۆزانەیە کە **مان** بە ئاوازیکی پیکەنیناوی و بیزارکەرەوە گیراویەتەوە، بۆیە پیرۆزیەکەی خۆی دۆراندوە، خودایەك کە لە کتیبی پیرۆزدا لە ئەزەلەوە وجودی هەیە، لای **مان** دەبیتە دروستکراوی دەستی ئینسان و داهینراوی ئیبراهیم، کە لەنیو هەراوزەنای چەندان خوای تردا وەك خوایەکی ئەفسانەیی پایە بلندو، پاشان تەنیا دەریهیناوە، کە خوا دەزانیت لە وجودیدا قەرزاری کییە، هاواردەکات: "شتیکی سەیرە، ئەم مرۆڤە هەژارە چۆن وا من دەناسیت، ئایا ناوی خۆمم لەو نەکردۆتەوە؟ لە راستیدا، لە رۆنی پیرۆزی دەگرم" وەلی توماس مان بە تایبەتی جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە رۆمانەکەی کاریکی تەنزئامیزە. کتیبە پیرۆزەکان دەمانهیننە پیکەنین! وەك ئەم چیرۆکەی لە بارەی بوتیفار و جوزیفەوەیە، بوتیفاری ژنی فیرعەونی کە شیتی جوزیف بوە لە تاوا گاز لە زمانی خۆی دەگریت و، وەك مندال گنەگنی رستە تەفرە دەرەکانیەتی "لە گەلما بنوو، لەگەلما بنوو" لە



تۆماس مان

کاتیکدا کە جوزیفی جوامیر، بە دریژایی سێ ساڵ، رۆژ بە رۆژ باسی ئەوەی لەگەلدا دەکات کە پیکەوە خەوتنیان حەرامە. کەچی لە رۆژیکی شومدا، بە ریکەوت هەردووکیان تەنیا لە ماڵ دەبن، دیسان ژنە زۆری بۆ دینێ "لەگەلما بنوو، لەگەلما بنوو" جاریکی دی جوزیف بە شیوازیکی پەروەدەریی هۆی ئەوەی بۆ باسدەکات کە بۆ نابیت جووت بن. بەڵام لە کاتی ئەم راڤەکردنەدا هەوەسی هەلدەستیت، زیاتر هەوەسی هەلدەستیت، خودایا، هیند ئارەزووی دەکات کە ژنی فیرعەون لە بینینی شیت دەبیت، کراسەکەی لەبەر دائەکەنیت، کە جوزیف هەر بەو هەوەسەوە رادەکات، ژنە عەقلی لەسەردا نامینیت بێ ئومیدو تورە، دەست ئەکات بە هاوارو داوای کۆمەك دەکات، تۆمەتی دەستدریژی کردنە سەریش ئەداتە پاڵ جوزیف.

رۆمانەکەی **مان** لە دنیادا ریزی لیگیرا، ئەمە بەلگەیەکە بۆ ئەوەی کە پیشیلکردنی پیرۆزیەکان بە مانای سوکایەتی پیکردنی نیە، بەلکو بۆ لەمەو دوایش بوەتە بەشیك لە ئاکار، بە پیچەوانەی سەردەمی نوییشەوە، بیباوەری، ئەوە نیە کە بە گومان و گومرابیت، باوەریش لەلای خۆیەوە یەقینە کۆنە پەیام و

توندڕەویەکەی لەدەست داوە، ستالینیەت ڕۆڵی سەرەکی لەم گۆڕانەدا هەبوو، چونکە زۆر بە توندی لە هەوڵدانیا بۆ نەهێشتنی تەواوی یادەوەری مەسیحیەت ئەوەی ڕونکردەوە کە ئێمە هەمووومان، خاوەن باوەڕو بێباوەڕ، کفرکەرو خواپەرست، بە کلتورێکەوە بەستراوین کە ڕەگەکەی لە ڕابوردوی مەسیحیدایەو، ئەگەر ئەو نەبوایە ئێمە ئێستا بێجگە لە تارماییەکی بێ جەوهەر، قسەکەرێکی بێ واژە، بێ شوناسنامەیەکی ڕۆحی، هیچی تر نەدەبووین.

من وەك گومڕایەك جێگای خۆم گرتبوو، پێیشی دڵخۆش بووم، تا لە ڕەشترین ساڵانی کۆمۆنیستیا بینیم کە مەسیحیەکان چۆن دەچەوسانەوە، لەبەرئەوە، ئەو گومڕاییە توند و سەیرەی سەرەتای ئارەزوی هەرزەکاریم ڕەویەوە، هاوڕێی خاوەن باوەڕم پەیداکرد، لەژێر هەست و کاریگەریی ئەواندا هەندێ جار دەچوومە کڵێسە، ئەوسایش نەمتوانی قەناعەتی ئەوە بە خۆم بێنم کە خوایەك وەك بونەوەرێك وجودی هەیەو چارەنوسی ئێمەی لە دەستایە. بەهەرحاڵ، من دەمتوانی چی لەبارەی ئەوەوە بزانم؟ ئەوانیش، دەیانتوانی چی لە بارەوە بزانن؟ ئایا لە دڵنیاکردنی خۆیان دڵنیابوون؟

من لە کڵێسەدا دانیشتبووم و هەستێکی غەریب و خۆشم تێگەڕابوو، هەستم کرد بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر باوەڕداریی ئەوان و بێبڕوایی من لە یەکترەوە نزیکن.

**چاڵاوی ڕابوردوو**

تاك چیە؟ شوناسی تاك لە کویدایە؟ هەموو ڕۆمانەکان هەوڵی وەڵامدانەوەی ئەم دوو پرسیارەیانە، بە ڕاستییش، من چۆن پیناسە دەکریم؟ کەسایەتی بە کردەوەکانی پیناسە دەکریت؟ وەلی تا ڕادەیەکی زۆر کردەوە لە دەست دانەرەکەی هەلدیت و دژی دەبیتەوە.

ئەی پیناسە لەسەر ژیانی ناوەوەی دەکریت، لەسەر بیروباوەڕو هەستە شاراوەکانی؟ ئەی مرۆڤ دەتوانیت خۆی خۆی بناسیت؟ ئەی دەشیت بۆچوونە شاراوەکانی بکرینە سەرەتایەك بۆ دۆزینەوەی کەسایەتیەکەی؟ یان مرۆڤ، بە ڕوانینی بۆ دنیا، بیروباوەڕەکانی، جیهان بینیەکەی[٢] پیناسە دەکریت؟ ئەمە ئیستاتیکای دوستویفسکیە: کەسایەتیەکانی دوستویفسکی ڕەگازوی ئایدۆلۆژیەتی کەسایەتیەکی دەگمەنن کە بە لۆژیکیکی سەخت ڕەفتار دەکەن. لە لایەکی ترەوە لای تولستوی ئایدۆلۆژیای کەسایەتی ئەوەندە ڕەگازو نیە کە شوناسی کەسایەتی لەسەر بنیات بنریت. "ستیفان ئەرکادیڤیچ" خۆی هەلویست و بیروراکانی هەلنەدەبژارد، بەلکو هەلویست و بیروراکان لە خۆیانەوە دەهاتن، تەنانەت ئەو شیوەی کلاوو پالتۆکەیشی هەلنەدەبژارد، بەلکو هەر ئەوەی دەکری کە خەلکی دی دەیانکری (ئاناکارنینا) ئەی ئەگەر بیری شەخسی بنەمایەك نەبیت بۆ

شوناسی تاك (ئەگەر گرنگیەکەیشی لە گرنگی کڵاویك زیاتر نەبیت) ئەو بنەمایە لە کویوە بینین؟

توماس مان بەشداریەکی پر لە بایەخی لەم باسەدا کردوە؛ ئیمە وای بۆ دەچین کە کاریگەرن و بیردەکەینەوە، بەڵام ئەوی ترو ئەوانی ترن کە بیردەکەنەوەو کاریگەریان لەسەر ئیمە هەیە، نەریتە زۆر کۆنەکان و ئەو نمونە سەرەتاییانەی بوونەتە ئەفسانەو لە نەوەیەکەوە گویزراونەتەوە بۆ نەوەیەکی تر، توانای تەفرەدانیان زۆرە. وەك (مان دەلیت) ئیمە بەرەو "چاڵاوی رابوردو" کیش دەکەین.**مان**: ئایا "من"ی مرۆڤ لەنیو سنوری جەستەیەکی کاتیدا، کەوتومەتە گەمارۆیەکەوەو بە سەختی زیندانی کراوم؟ ئایا ئەو رەگەزە جۆراوجۆرانەی کە ئەو جەستەیە پیکدینن، هەر لە دنیای ناوەوەو دەرەوەی ئەو مرۆڤەوە نەهاتوە؟ /../ جیاوازی کردن لە نیوان رۆح بە گشتی و رۆحی تاکەکەسیدا، لە کۆندا، بە زۆر نەدەسەپینرا بەسەر خەلکیدا وەك ئیستا کە دەکریت.. هەروا: "دەشیت ئیمە خۆمان لەبەردەم دیاردەیەکدا ببینینەوە کە ناوی لاسایی کردنەوە یان بەردەوامبوونی لیبنیین، بەوپییە، ویناکردنی ئەو ژیانە، لەسەر دەوری هەر کەسیك و، لە نویکردنەوەی هەندیك لەو شیوە ژیانەو، لەسەر هەندیك لەو نەخشە ئەفسانەیەیش دەوەستیت کە باووباپیران بناغەیان داناوە، هەروەها لەسەر ئەوەیش دەوەستیت کە بشێ سەرلەنوێ ئەو دەورە ببینینەوە".

شەری نیوان یاقوب و یوشەعی برای هەر هەمان ئەو شەرە کۆنەیە کە لە نیوان هابیل و قابلیدا رویدا، لە نیوان یەکیکدا کە لە لایەن خواوە بەختەوەر کراوەو ئەوی تری پشتگوێ خراوو حەسودا، ئەم کیشمەکیشە، ئەم "نەخشە ئەفسانەییەی کە باووباپیران دایانناوە" جاریکی تر لە چارەنووسی یوسفی کوری یاقوبدا خۆی دەبینیتەوە کە ئەویش دەچیتە خانەی بەختەوەرەکانەوە، لەبەرئەوەیش کە یاقوب هەست بەو کۆنە قینە دەکات کە بەرانبەر بە بەختەوەرەکان هەیە، یوسفی کوری دەنیریت تا لەگەڵ برا حەسودەکانیدا پەیمانی برایەتی دووبارە بکاتەوە.

(دەست پیشکەریەکی شووم: ئەوان یوسف فری ئەدەنە چاڵەکەوە)

تەنانەت ئازاریش کە کاردانەوەیەکە پیدەچیت جلەو نەکریت، بیجگە لە "لاساییکردنەوەو بەردەوامی" چی تر نیە: کاتیك رۆمانەکە باس لە قسەو رەفتارو شیوەنی یاقوب دەکات بۆ مەرگی یوسف، **مان** دەلیت: "یاقوب لە کاتی ئاساییدا هەرگیز وای قسە نەکردوە، /../ نوحیش لە کاتی تۆفانەکەدا هەر وتاریکی لەو شیوەیەی داوەو یاقوب لاسایی ئەوی کردۆتەوە /../ تا رادەیەك هەر بە هەمان رستەو دەستەواژە تەعبیری لە نائومیدی خۆی کردوە /../ لەگەڵ ئەوەیشدا

نـابيت ئـەو عەفەويەتـەی بـۆ بكريتـە جيـی گومان"

سـەرنجيكی گرنـگ: لاسـاييكردنەوە بـە مانای ناراست گۆيی نيە، چونكە تاك ناچارە چاو لەو شتە بكات كە پيشتر رويداوە، چەندە دلسـۆزيش بيـت، بيجگـە لـە بينينـی دەوری ئـەوەی پيشـوو چـی تـر نيـە، چـەندە لەسـەر هەقيش بيت، هـەر ئـەو ئامـاژەو هيمايانەيە كـە لـە **چالی رابوردووەوە** دينـە دەرێ.

**پيكـەوە گونجـانی سـەردەمە ميژوويـيـە جياوازەكان لە رۆماندا:**

ئـەو رۆژانـەم لـە بـيرە كـە دەمويسـت رۆمـانی گالتـە (المزحـة) بنووسـم: هـەر لـە سـەرەتاوەو بەوپـەری عەفەويەتـەوە زانيـم رۆمانەكـە لـە ريگـای كەسـايەتی **ياروسلافەوە** ديـدو روانينـی بـەرەو قولايـی رابـوردوە (رابـوردوی هونـەری ميللی) كەسايەتی "من"يش هـەر بە هـۆی ئـەو ديـدو روانينـەوە ئاشـكرا دەبيـت، لـە لايـەكی ترەوە، دروستكردنی چوار كاراكتـەری رۆمـان بـەم شـيوەيە: چـوار دنيـای كۆمۆنيسـتی لـە ريگـای چـوار كەسـايەتيەوە، كـە بـە چـوار سـەردەمی ديرينـی ئـەوروپاوە بەسـراونەتەوە: لودوفيـك: كۆمۆنيسـتيكە گيـانيكی تونـدی ڤولتيری تيايـە، ياروسـلاف: كۆمۆنيسـتی وەك ئارەزوويەك بۆ گيرانەوەی سەردەمی رابوردوی بـاوك سـالاری كـە لـە فولكلـۆردا پـاريزراوە، كوسـتا: كۆمۆنيسـتيكی يۆتۆپـی كـە سـەرچاوەكەی لـە ئينجيلەوەيـە. هيلينـا: كۆمۆنيستی وەك سەرچاوەيەكی حەماسەت لە سۆزيكی چردا. ئـەم چوار دنيـا شەخسـيە لـە كـاتی شـيكردنەوەياندا سـەيردەنوينن! چـوار شيوە لە چركەساتی هەرەسی كۆمۆنيزم، ئەمـە بـە مانـای هەرەسـهينانی چـوار لـە سەركيشيەكانی ئەوروپای كۆنيشە.

> من وەك نوسەريكی گەنج لە پراگ، لە وشەی "نەوە" بە تەنگ دەهاتم و وەك بۆنی ميگەل ڤيزم ليی دەكردەوە

لـە رۆمـانی **گالتـەدا** رابـوردو دەبيتـە روی ئاوينەيـەكی بـە بزاوتـی كەسـايەتيەكان يـان لـە دريژەپيدانـی باسـەكاندا دەردەكـەويت، پاشـان ويسـتومە راسـتەوخۆ رابوردو دەربخەم، لە رۆمانی **"ژيان لە شوينيكی ترە"**دا ژيانی شاعيريكی لاوی ئـەم سـەردەمەی خۆمـانم لەبـەردەم تـابلۆی هـەموو ميـژووی شـيعری ئـەوروپادا دانـاوە، بـۆ ئـەوەی بەرهەمەكەی تيكـەڵ بـە بەرهەمـەكانی رامبـۆو كيتسی و ليرمەنتۆف ببيت، لەمـەيش زياتر بۆ تيكەلكردنی سـەردەمە ميژوويـيـە جياوازەكـان لە رۆمانی **نەمريدا** ئەمەم كردوە.

مـن وەك نوسـەريكی گـەنج لـە پـراگ، لـە وشـەی "نـەوە" بـە تـەنگ دەهـاتم و وەك بۆنـی ميگەل ڤيزم ليی دەكردەوە، بۆ يەكەمين جار كە هەست بـەوە بكـەم پـەيوەنديم لەگـەڵ خـەلكی تردا هەيە، دواتر لە فەرەنسەدا بوو، كاتيك كە رۆمـانی زەويمـان (*Terra nostra*)ی "كـارلاوس

فوینتس"م خویندەوە، چۆن دەبیت یەکیك لە کیشوەریکی تر، کەسیکی دوور لە ریرەوی کلتووری من، ئەو ئارەزوە ئیستاتیکیە تایبەتیەی هەبیت کە لە رۆمانیکدا هەموو سەردەمە میژووییە جیاوازەکان پیکەوە بگونجینیت. ئەو ئارەزوەی من بە سادەیی خۆم ئەوکاتە وام دادەنا کە تەنیا تایبەتە بە منەوە؟

هەرگیز ناتوانین لەوە بگەین کە مەبەست لە **زەویمان** چیە، دیارە زەوی مەکسیك، ئەگەر ئاور لە چالەکانی رابوردو نەدەینەوە، بەلام نەك لەسەر شیوازی میژونووس کە روداوەکانی لە سیاقی میژوییدا بخوینینەوە. بەلکو بۆ ئەوەی بپرسین: ئایا گەوهەری پوختی زەوی مەکسیك بۆ مرۆڤ چیە؟ فوینتس ئەم گەوهەرەی لە شیوەی رۆمانیکی خەونیدا دارشتوە کە قۆناغە میژوییە جۆراوجۆرەکانی وەك شیوەیەك لە میتامیژوویی شیعریو خەونی لیدیت. فوینتس بەم رۆمانە شتیکی داهیناوە کە بە گران باسدەکریت و، بەهەرحال لە ئەدەبدا شتی وا هەرگیز نەبینراوە.

دواجاریش هەمان ئەو هەستی جوانی ناسیە شاراوەیەم لە کاتی خویندنەوەی رۆمانی "جەژن لە فینیس"ی سولارسادا کرد. رۆمانیکی سەیر کە خۆمان لە چیرۆکەکەیدا دەژین بەلام شانۆکە بۆ فاتو، سیزان، مونی، تیتان، بیکاسۆو ستاندال و بۆ نمایشکردنی بیرو هونەرەکەیانە.

هەر لەو دەمەدا، **ئایەتە شەیتانیەکان** بوو بە شوناسنامەیەکی ئالۆزی هیندیەکی بە ئەوروپایی بوو، زەویەك زەویی ئیمە نیە (*Terra non nostrae*) زەوی ئیمە نیە (*Terra non nostrae*) زەوی ئیمە نیە (*Terra non nostrae*) زەویەکی ون بوە، (*Terrae Perditae*) کە بەم شوناسە ویرانەیەوە رۆمانەکە لەدەست دەگریت، لە گەلیك شوینی جیاوازی دنیادا دەیبینیتەوە: لە لەندەن و بومبای، لە گوندیکی پاکستان و، پاشانیش لە ئاسیای سەدەی حەوتەمدا.

پیکەوە گونجاندنی سەردەمە جیاوازەکان کیشەیەکی تەکنیکی بۆ رۆمان نووسی دروست دەکات: چۆن ئەم سەردەمانە بە یەکەوە دەبەستیت بیئەوەی رۆمانەکە یەکیەتی خۆی لە دەست نەدات؟

فوینتس و **روشدی** چارەسەریکی خەیالیان کردوە: لای فوینتس کەسایەتیەکان وەك بەرجەستەکردنی زاتی خۆیان لە سەردەمیکەوە دەچنە سەردەمیکی تر. بەلام لای **روشدی** کەسایەتی جبریل فاریشا جەخت لەسەر ئەو پەیوەندیە دەکات کە لەسەرو زەمەنەوەیە، ئەویش بەوەی کە دەبیتە جبریلی سەرۆکی فریشتەکان، جبریل بە دەوری خۆی دەبیتە هاوکاری ماهوند (خویندنەوەیەکی رۆماننووسانەی محەمەد) لای سولیرس و لای من، پەیوەندیەکە چ شتیکی فانتازی تیا نیە، لای سولیرس: تابلۆو کتیب بەکاردیت، ئەمانە لای کەسایەتیەکانەوە دەبینرین و دەخویندرینەوە، وەك پەنجەرەیەك بەسەر

رابــــوردوودا، وەلی مــــن خــــودی بابــــەت و ئــــەنگیزەکانی ئیســــتاو رابــــوردو پیکــــەوە دەبەستم.

ئیستا ئەوە رادەگەیەنم کە من سەروکارم لەگەڵ میژووی رۆماندایە، لە کاتیکدا هەموو رۆمانەکانم ترسی میژویان لی دەرژیت

دەشــیت ئــەم لیکچوونــە ئیســتاتیکیە شــاراوەیە (کــە نــە دەرکــی پیدەکــەیت و نــە هەستی پیدەکەیت) بەکارتیکردنی یەکیك بیت لــە یــەکیکی دی؟ نــەخیر، کەواتــە بلیــی کاریگەریەك بیت ئاسایی هەمووتیا بەشداربین؟ نــەخیر هیچیــان نیــە، ئــەی دەشــیت ئیمــە هــەموومان هەوایــەکی میــژوی رۆمانمــان هــەلمژیبیت؟ ئــەی دەبیــت ئیمــە میــژوی رۆمانمــان، بــە لۆژیکــە تایبەتیەکەیــەوەو، هــەر بەو دەورەوە کەدەیبینیت وەرگرتبیت؟

**میژووی رۆمان وەك تۆلەیەك لە خودی میژوو:**

میژوو: ئایا دەتوانین پشت بەو سەرچاوە پشتگوێ خراوە ببەستین؟ ئەمەی مـن دەیلیـم تـەنیا قسـەیەکی رووتـی تایبـەتی خۆمـە. وەك رۆمان نووسیك، بەردەوام هەستی ئەوەم هەبوە کە من لەناو میژودا دەژیم، مەبەستم ئەوەیە لە ناوەراسـتی ریگـادا، گفتوگـۆ لەگـەڵ ئەوانـەدا دەکـەم کـە لـە پیـش منـدا بـوون و رەنگـە (بـە رادەیەکی کــەمتر) لەگــەڵ ئەوانەیشــدا کــە لەمەودوا دین، بیگومان من قسە لەسەر میژوی رۆمـان دەکـەم، هیچـی تـر نـا، وەك خـۆم چۆنـی دەبینـم؛ ئەمـە پـەیوەندی بـە لۆژیکـی مرۆڤـە بالاکەی هیگلـەوە نیـە، نـە پیشـەکی بریـاری بـۆ دراوە، نـە لەگـەڵ بـیری پیشـکەوتندا دیتـەوە، تـەواو ئینسـانیە، لـە خـەلك دروسـتبوە، لـە هـەندیك کـەس، وەك ئـەنجام دەشیت بـەراوردی بکەیت بە کەسیکی هونەرمەندەوە، کە هـەندیك جــار کارەکــەی بــە جۆریکــی نادروســت دەردەبریــت و جــاریکی دی سەرســوورهینەر، جــاریك وەك بلیمــەت و، جــاریکی تــر نــا، زۆرجاریش دەرفەت لە دەست دەدات.

ئیستا ئەوە رادەگەیەنم کە من سـەروکارم لەگەڵ میـژووی رۆماندایە، لـە کـاتیکدا هـەموو رۆمانـەکانم ترسـی میژویـان لی دەرژیـت، تـرس لەو هیزە شەرئەنگیزو نامرۆڤایەتیە دەرەکیـەی بـێ مـەیل و ئـارەزووی ئیمـە دیـت و هەرەشـە دەکــات و ژیانمــان کــاول دەکــات. لەگــەڵ ئەوەیشــدا، چ دژایەتیــەك لــەم هەلویســتە دوولایەنیـەدا نیـە، چونکـە میـژووی مرۆڤایـەتی و میـژووی رۆمـان دوو شـتی تـەواو لـە یـەکتر جیاوازن. لە کاتیکدا کە میـژووی مرۆڤایـەتی پـەیوەندی بــە مرۆڤــەوە نیــەو، وەك هــیزیکی غــەریب بەســەریدا ســەپینراوەو ئــەویش ناتوانیت کاری تیبکـات، ئـەوا میـژووی رۆمـان (وینـەو موسـیقایش) لـەدایکبووی ئـازادیی

مرۆڤە، لەدایکبووی ئەفراندنی تەواوی کەسایەتیەکەیەتی، ئەوەی خۆی هەلیبژاردوە، مانای میژووی هونەر تەواو پیچەوانەی مانای خودی میژوە، میژووی هونەر بە هۆی ئەو مۆرکی کەسایەتیەوە کە هەیەتی، بریتیە لە تۆلەی مرۆڤ دژی ناکەسایەتیی میژووی مرۆڤایەتی.

پیکهاتەی مۆرکی کەسایەتی میژووی رۆمان چیە؟ بۆ ئەوەی بتوانین پیکهاتەی میژوو بە دریژایی سەدەکان لە یەکیەتیەکدا کۆبکەینەوە، ئایا پیویستە لە مانایەکی هاوبەش و هەمیشەییدا بیت و، هەر بەو پییەش، وەك ئەنجام بکەویتە سەروو کەسایەتیەوە؟ نا، من لەو بروایەدام تەنانەت ئەو مانا هاوبەشەیش هەر بە شەخسی و ئینسانی دەمینیتەوە. چونکە بە دریژایی میژووی هونەر، بەردەوام مانای ئەم هونەرە یان ئەو هونەرە (رۆمان چیە؟) لەگەلْ مانای گۆران و بەرەوپیشچوونیدا (لە کویوە دیت و بۆ کویْ دەچیت؟)دا پیناسە دەکریت. ئەم مانایە لەلایەن هەر هونەرمەندیك و بە هۆی هەر کاریکی نویوە دووبارە دەبیتەوە. مانای میژووی رۆمان گەرانە بە دوای ئەم مانایەدا، داهینانی بەردەوامی و دیسان داهینانی تر، کە هەمیشە سەرچاوە لە رابوردو وەردەگریت، هەموو رابوردووی رۆمان: بیگومان رابلیە هەرگیز ناوی رۆمانی لە رۆمانەکەی خۆی گارگانتاو پانتاگرویل نەناوە، رۆمانیش نەبوو، بەلکو وردە وردە بوو بە رۆمان پاش ئەوەی رۆمان نووسەکانی دوایی (ستێرن، دیدرو، بلزاك، فلوبیر، فانکیرا، گومبروفیتش، روشدی، کیس، شاموازو) ئیلهامیان لیوەرگرت و بە ئاشکرا سوودیان لی بینی، هەر بەم جۆرە خستیانە خانەی میژووی رۆمانەوەو، لە سەرووی ئەوەیشەوە، وەك یەکەمین بەردی بناغەی میژووی رۆمان دانیان پیا نا.

ئەوەی شایانی وتنە من هەرگیز دەستەواژەی "کۆتایی میژوو" دوودل و بیزاری نەکردووم "ئای کە خۆشە لەبیر خۆمانی بەرینەوە، ئەوەی شیلەی ژیانە کورتەکەمانی هەلمژی تا بیکات بە قورگی کارە بیهودەکانی خۆیدا، ئای کە خۆشە میژوو لەبیرخۆمان بەرینەوە (**ژیان لە شوینیکی ترە**) ئەگەر هەر پیویست بکات کۆتایی بە میژوو بیت (هەرچەندە من ناتوانم بە راشکاوی بروا بەو کۆتاییە بهینم کە فەیلەسوفەکان قسەی لە بارەوە دەکەن) تازوو بیت چاکتر، بەلام خودی ئەم دەستەواژەی "کۆتایی میژوو"ە ئەگەر بۆ هونەر بوتریت بیزاردەبم و تیکدەچم.

ئەو جۆرە کۆتاییە، دەتوانم بە روونی بەرجەستەی بکەم لەو بەشە هەرە زۆرەی رۆمانی ئەمرۆدا کە بەرهەم دیت و دوورە لە میژووی رۆمانەوە.

دانپیانان، لیکۆلینەوەی رۆژنامەوانی، تەسویەی حساب، ژیاننامە، رازو نهینی، بوختان، باسی سیاسی، مەرگی میردو باوك و دایك، بێ بنی کچ، لەدایکبوون، رۆمان گەلیکی بی کۆتایی، تا هەتا هەتایە، رۆمان گەلیکن

هیــچ شــتیکی تــازە نــالین، چ خــەمیکی جوانناسـیان نیـە، هیـچ گۆرانیـك نـە بەسـەر تیگەیشتنمان بۆ مرۆڤ و نـە بەسـەر شـیوەی رۆمـاندا نـاهینن، هـەموو لەیـەکتر دەچـن، سبەینان هەموو بەکاردەبرین و ئیواران هـەموو فریّ دەدرین.

بـە رای مـن، شـاکار تـەنیا لـە میـژووی هونەرەکـەیداو لـە ریـی بەشداریکردنی لەو میـژوەدا لـەدایك دەبیـت، هـەر لـەناو میژویشـدا دەرکـی ئـەوە دەکـەین کامـە نوییـەو کامـە دووبارەیـــە، کامـــە دۆزینەوەیەو کامە تـەقلیدە، بە وتەیەکی دی، تـەنیا لـەناو میژوودا دەشیت کاریك بیتـە دی وەك بەهایـەك بتوانین لـە کـاری تری جیابکەینەوەو هەلیبسەنگینین، کەواتە من پیم وایە، چ شتیك لـەوە خراپتر نیە کە هونـەر بکەویتـە دەرەوەی میـژووی خۆیـەوە، چونکـە ئـەوە کەوتنـە نـاو ئاژاوەیەکـە کـە نـاتوانیت دەرکی بەها جوانیەکانی تیا بکەیت.

لەناکاو بیژی و نووسین (الارتجال و التألیف)

کە سیرفانتس رۆمـانی "دون کیخوتـە"ی دەنووسـی پیـی قـەلس نـەبوو سروشـتی پالەوانەکەی بگۆریـت، ئـەو سەربەسـتیەی کـە رابلیەو سیرفانتس و دیدرو سیرن ئیمـەیان پیّ سەرسام کـرد پـەیوەندی بـە لـەناکاو بیژیـەوە هەیـە، هونـەری رۆماننووسـین، کـە ئـالۆزو سـەختە تـا نیـوەی یەکـەمی سـەدەی نـۆزدە نـەبوبوە پیویسـتیەکی ناچـاری، دوای ئـەوە شیوەی رۆمان وەك لەو سەردەمەدا لەدایکبوو، بریتـی بـوو لـە رووداویکـی خەسـتکراوە لـە ماوەیەکی کورت و لە چوار ریگایـەکدا کـە زۆر لـە کەسـایەتیەکان لـەویدا پیکدەگـەن، ئەمـە پیویستی بـە نەخشەسـازیەکی وردی رووداوو دیمەنـــەکان هـــەبوو؛ رۆمـاننووس پیـش ئـەوەی دەست بـە نووسـین بکـات نەخشـــەیەکی وردی بـــۆ رۆمانەکـــەی دەکیشـــا، جـاریکی تـر پیادەهاتـەوە، وردی دەکـردەوەو دیسـان دەیکـردەوە، وینـەی دەکیشـاو دیسـان وای دەکیشایەوە وەك ئەوەی پیشتر هـەرگیز ئـەوە نەکرابیت، هیند بەسە تەماشای ئەو یاداشتانە بکـەیت کـە دوستویفسـکی بـۆ رۆمـانی شـەیتانەکانی نووسـیوە: لـە حـەوت دەفتـەری یاداشـت کـە ٤٠٠ لاپـەرەی چـاپی پلیـاری گرتۆتـەوە (هـەموو رۆمانەکـە ٧٥٠ لاپەرەیـە) بـیرە سـەرەکیەکان بـەدوای کەسـایەتیەکاندا دەگـەرین و، کەسـایەتیەکانیش بـە دوای بـیرە سـەرەکیەکاندا. کەسـایەتیەکان بـۆ ماوەیـەکی دورو دریـژ لەسـەر پالەوانیـەتی لـە کیـبرکیدان، دەبــوو ســتراڤۆگوین ژنــی بهینایــە، دوستویفسـکی دەپرسـیت "کـیّ بینیـت؟" دەیـەویت بـەرودوا سیّ ژنی بۆ بینیت. هتـد.. (دژایەتیـەکی روالـەتی، چـەندە ئـامرازی

> کە سیرفانتس رۆمانی "دون کیخوتە"ی دەنووسی پیی قەلس نەبوو سروشتی پالەوانەکەی بگۆریت

ساختمانی رۆمان کۆکتر بیت، کەسایەتیەکان راستەقینەتر و سروشتی تر دەردەکەون، ئەم پیشداوەری کردنە دژی عەقلی بونیاد نەر، کە رەگەزیکی "ناهونەریە" و لایەنی "زیندووی" کەسایەتیەکان لەناودەبات، بیجگە لە کال فامی ئەوانەی کە هەرگیز لە هونەر تینەگەیشتوون هیچی تر نیە.

رۆماننووسی ئەم سەردەمە کە تاسەی هونەری مامۆستایانی کۆنی رۆمان دەکات، ناتوانیت پەتەکە لە کویدا پساوە گریی بداتەوە، ناتوانیت بەسەر ئەزموونی گەورەی سەدەی نۆزدەدا بازبدات، ئەگەر بیەویت لە ئازادیە ئارامەکەی رابلیەو ستیرن بەرخوردار بیت دەبیت ئەوە لەگەڵ پیویستیەکانی نووسیندا بگونجینیت.

لەبیرمە کە بۆ یەکەمین جار رۆمانی **جاکی قەدەریم** خویندەوە، تەواو شەیدای ئەو سامانی بویریەی بووم کە چۆن بیروباوەرو حیکایەت وا بە تەریبی دەرۆن، ئەوەی کە چیرۆکیك لە چیرۆکیکی تر جیادەکاتەوە، هەروەك شەیدای ئەو ئازادیی نوسینە بووم کە گاڵتەی بە یەکیتی رووداو دیت، لە خۆم پرسی: بلیی ئەم ئاژاوە جوانە ئەنجامی ئەو بنەما سەرسورهینەرە بیت کە بە وردی حسابی بۆ کراوە، یان تەنیا مەبەستی لە ناکاوبیژیەکی رووتە؟ بیگومان، لیرەدا لە ناکاوبیژیەکە سەردەکەویت، بەڵام ئەو پرسیارەی کە لە خۆیەوە هات و لە خۆمم کرد ئەوەی فیرکردم کە ئەم لە ناکاوبیژیە سەرمەستانەیە بیناسازیەکی موجیزە ئاسای تیایە، بیناسازیەکی سەخت و دەوڵەمەند کە هەر لە هەمان کاتدا حسابی زۆر وردی بۆ کراوە، ئەندازەگیری کراوە، نەخشەسازی بۆ کراوە وەك چۆن نەخشەسازیەکی هەرە پیویست بە خەیالیکی میعماریانە بۆ دروستکردنی کاتدرائیەك کرابیت. ئایا ئەم ئامانجە ساختمانسازیە سیحری ئازادیەکەی لە رۆماندا لەدەست دەدات؟ ئایا تایبەتمەندیی گەمە کردنەکەی دەدۆرینیت؟ بە راست گەمە چیە؟ هەموو گەمەیەك ریسای خۆی هەیە، چەندە ریساکە کۆك بیت، گەمەکە دەبیتە گەمە، بە پیچەوانەی شەترنج بازەوە، هونەرمەند خۆی ریساکە دادەنیت و بۆ خۆی دادەنیت، کە دەست بە لەناکاوبیژی دەکات، لەوکاتە ئازادترە کە خەریکی داهینانی کۆمەلیك یاساو ریسای تایبەتیە.

لەگەڵ ئەمانەیشدا، گونجاندنی نیوان ئازادیەکەی رابلیەو دیدرو لەگەڵ پیویستیە سەختەکانی نوسیندا، کۆمەلیك گیروگرفت بۆ رۆماننووسی سەدەی بیستەم دروستدەکات، جیاوازی لەو کیشانەی کە بلزاك و دوستویفسکیان سەرقاڵ کردبوو، بۆ نمونە: کتیبی سییەم کە رۆمانی هرمان بروك **خەوگەرەکان**ە، بریتیە لە روباریکی "بولیفونی" کە لە پینج "دەنگ" و پینج هیلی سەربەخۆی تەواو پیکهاتوە: هیلەکان، نە رووداوی هاوبەش و نە خودی کەسایەتیەکان بە یەکەوە نابەستیت و هەریەکەیان شیوەو ماهیەتی زۆر

جیاوازیان هەیە (A–ڕۆمان، B–ڕیپۆرتاژ، C–چیرۆك، D–شیعر، E–وتار) بە دریژایی هەشتاو هەشت فەسلی کتیبەکە ئەم هیلانە بەم ڕیزبەندیە سەیرە بەدوای یەکدا دین:

*A-A-A-B-A-B-A-C-A-A-D-E-C-A-B-D-C-D-*
*A-E-A-A-B-E-C-A-D-B-B-A-E-A-A-E-A-B-D-C-*
*B-B-D-A-B-E-A-A-B-A-D-A-C-B-D-A-E-B-A-D-*
*A-B-D-E-A-C-A-D-D-B-A-A-C-D-E-B-A-B-B-D-*
*B-A-B-A-B-A-A-D-A-A-D-D-E*

چی وای لە بروك کردوە ئەم ڕیزبەندیە هەلبژیریت نەك هی تر؟ بۆ لە فەسلی چوارەمدا بە تایبەتی هیلی B هەلبژاردوە نەك هیلی C یان D؟ نە لۆژیکی کەسایەتیەکان و نە ڕووداوەکان، چونکە ڕووداوی هاوبەش لەم پینج هیلەدا نیە، بەلکو پیوانەی تر وای لیکردوە: سیحریك کە لەو هاومالیەتیە سەرسامکەرەوە هاتوە کە لە شیوە جیاوازەکانی نووسیندایە. هاتوە (شیعر، چیرۆك، پەند، ڕامانی فەلسەفی) لە جیاوازی هەستە هەلچوەکان کە دەستی بەسەر فەسلە جیاوازەکاندا گرتوە، جیاوازی لە دریژیی فەسلەکاندا، دواییش، لە بلاوبوونەوەی پرسیارە وجودیەکاندا کە لە پینج هیلەکەدا ڕەنگ ئەداتەوە، وەك ڕەنگدانەوە لە پینج ئاوینەدا، ئەگەر شتی چاکترمان وەگیر نەکەویت. با ئەو ساختمانسازیە بە مۆسیقایی ناوزەد بکەین و بگەینە ئەم ئەنجامە: سەدەی نۆزدەیەم نوسینی ڕۆمانی هونەریی داهینا، بەلام ئەم سەدەیەی ئیمە مۆسیقای خستە ناو ئەم هونەرەوە.

**ئایاتە شەیتانیەکان** تا ڕادەیەك لەسەر سێ هیلی سەربەخۆ دامەزراون:

A–ژیانی سالادین شامشاو جبریل فاریشا، دوو هیندی هەنووکە لە نیوان بومبای و لەندەندا دەژین.

B–چیرۆکێکی قورئانی باس لە ڕەگی ئیسلام دەکات.

C–ڕۆیشتنی گوندنشینەکان بەناو دەریادا بۆ مەکەو بەو باوەڕەوە کە بێ ئەوەی قاچیان تەڕبێت لە دەریاکە دەپەڕنەوەو کەچی هەموو دەخنکێن.

ئەو سێ هێڵە لە نۆ بەشدا بەدوای یەکدا دێن: *A-C-A-B-A-C-A-B-A*

(بەم بۆنەیەوە: لە مۆسیقادا بەم تەرتیبە دەوتریت ڕوندو "*Rondo*" مۆتیفە سەرەکیەکە بە ڕیکوپیکی دووبارە دەبیتەوە لەگەل هەندیك مۆتیفی تردا).

ئەم بەرزبوونەوەیە (لە نیوان دوو کەوانەدا ئاماژە بۆ ژمارەی لاپەڕەکان وەك لە چاپە فەرەنسیەکەدا هاتوە) A (١٠٠)، B– (٤٠)، A– (٨٠)، C– (٤٠)، A– (١٢٠)، B– (٤٠)، A– (٧٠)، C– (٤٠)، A– (٤٠).

لێرەدا هەردوو بەشی B و C هەمان مەودایان تیایە کە لە کۆی بەشەکانی تردا گونجاندنێکی هارمۆنیان هەیە. هێڵی (A) ٧/٥، هێڵی (B) ٧/١ لە گۆشەکە پێکدێنێت. لەم ڕیزبەندی کردنەدا باری هەنووکەیی هێڵی A

دەردەکەوێت: چەقی قورسایی ڕۆمانەکە لە بەشی فاریشاو شامشادایە، بەلام تەنانەت ئەگەر $B$ و $C$ دوو هێڵی پاشکۆیش بن، لایەنی ئیستاتیکی ڕۆمانەکە لەوێدا چەقی بەستوە، چونکە بە هۆی ئەو دوو بەشەوە **ڕوشدی** توانیویەتی کێشەی سەرەکی هەموو ڕیوایەتەکان بزانێت (کێشەی شوناسی تاك و شوناسی کەسایەتی) ئەمەیش بە هۆی شێوازێکی تازەو بەزاندنی نەریتەکانی ڕۆمانی دەرونیەوە: کەسایەتی شامشاو فاریشا لە ڕێگای بە درێژی وەسفکردنی حاڵەتە نەفسیەکەیانەوە ناناسرێن، نهێنیەکە لەوەدایە کە هەردوو شارستانیەتی هیندی و ئەوروپایی لە ناخیاندایە، لەو ڕەگانەدایە کە لێیان بڕاوەتەوەو کەچی هێشتا زیندووە تیایاندا، لە هەر شوێنێکداو لەسەر هەر ئاستێك ئەو ڕەگانە بڕابێتن بۆ دەست خستنە سەر برینەکە دەبێت بێتە خوارێ، تەماشاکردنی "چاڵی ڕابوردوو" نەك لە دەرەوەی خود، ئەم ڕوانگەیە بەرەو دڵی واقیعمان دەبات: بۆ لەتوپەت کردنی وجودیانەی هەردوو پاڵەوانی ڕۆمانەکە.

وەك چۆن ناتوانین بەبێ ئیبراهیم لە یاقوب تێبگەین (کە بە پێی ڕای تۆماس **مان** چەند سەدەیەك پێش ئەو ژیاوە) چونکە یاقوب بێجگە لە تەقلیدو بەردەوامیدان بە ئیبراهیم چی تر نیە، هەروەهایش ناتوانین لە جبریل فاریشا بگەین بێ تێگەیشتن لە سەرۆکی فریشتەکان جبریل و دون ماهوند (محەمەد) هەروەها بێ ئیسلامی سیوکراتی (حوکمی ئاینی) خومەینی و ئەو کچە دەمارگیرە کە گوندیەکانی بەرەو مەکە برد، چاکترە بڵێین بەرەو مەرگ برد، ناتوانیت تێی بگەیت، هەموو ئەمانە ئەو شیمانە تایبەتیەن کە لە جبریلدا هەن و دەبێت تاکگەراییە تایبەتیەکەی خۆی لێبکاتەوە. لەم ڕۆمانەدا ناتوانیت لە هیچ پرسیارێکی گرنگ قووڵ بیتەوە ئەگەر لە چاڵی ڕابردوو ڕانەمێنێت. کێ چاکەو کێ خراپە؟ کامە شەیتانە بە نیسبەت ئەوی ترەوە؟ ئایا شامشایە بە نیسبەت فاریشاوە، یان فاریشایە بە نیسبەت شامشاوە؟ ئایا شەیتان وەحی چوون بۆ حەجی دایە گوندیەکان یان فریشتە بوو؟ ئایا نقوم بوونەکەیان نقوم بوونێکە شایانی چەمەرگێڕانە یان گەشتێکە بەرەو بەهەشت؟ کێ ئەمە دەڵێت و کێ ئەیزانێت؟ ئەی کێ ناڵێت ئەم بێتواناییە لە دەرك کردنی جیاوازیە وردەکانی نێوان چاکەو خراپەدا، هەر ئەوە نەبێت کە خەم و ئازاری بە دامەزرێنەرانی ئاینەکان داوە؟ وتە ترسناکە نائومێدکەرەکە، لەم کفرە گەورەیەی مەسیحدا "خوداکەم، خوداکەم، بۆ دەست بەردارم بوویت؟" ئایا کار لە ڕۆحی هەموو مەسیحیەك ناکات؟ لەو گومانەی ماهوندا کاتێك کە دەپرسێت کێ ئایەتەکانی بۆ ناردوە، ئایا نایەقین نەشاردراوەتەوە، ئەو نایەقینەی تەنانەت بوونی مرۆڤی لەسەر بنیات دەنرێت؟

لە سێبەری پرانسیپە گەورەکاندا:

هەر لە ڕۆمانی **منداڵەکانی نیوە شەوەوە** کە لە کاتی دەرچونیدا (ساڵی ١٩٨٠) سەرنجی

گشتی ڕاکێشا، کەس لە دنیای ئەدەبیی ئەنگلوساکسونیدا لاری لەوە نەبوو کە **ڕوشدی** یەکێکە لە ڕۆماننوسە هەرە بەهرەدارەکانی ئەم سەردەمە، کە لە ئەیلولی (١٩٨٨)دا ئایەتە **شەیتانیەکانی** بڵاوکردەوە پێشوازیەکی وای لێکرا کە شایەنی گەورە نوسەرێك بێت. ڕۆمانەکە زۆری ڕێز لێگیرا، بێ ئەوەی کەس بیر لەو ڕەشەبایە بکاتەوە کە دوای چەند مانگێك هەڵیکرد، کاتێك پێشەوای ئێرانی ئیمام خومەینی بە تۆمەتی کوفر فەرمانی مەرگی بەسەر ڕوشدیدا دا، کۆمەڵێك پیاوکوژی خستە کێبڕکێی کوشتنیەوەو تا ئێستایش کەس نازانێت ئەنجامەکەی بەچی دەگات.

ئەمە کاتێك ڕویدا هێشتا ڕۆمانەکە وەرنەگێڕرابوو، واتە لە دەرەوەی جیهانی ئەنگلوساکسونیدا ناوی کتێبەکەیان زڕاند، لە فەرەنسادا ڕۆژنامەکان زوو گوڵ بژێری چەند برگەیەکی ڕۆمانەکەیان کرد کە هێشتا بڵاونەبوبوەوە، بۆ ئەوەی هۆی فەرمانەکە دەربخەن، کارێك ڕەنگە وا دەربکەوێت ئاساییە بەڵام بە نیسبەت ڕۆمانەوە مەرگەساتە، چونکە تەنیا بڵاوکردنەوەی ئەو پەرەگرافانەی ناونراون بە **تاوان**، هەر لە سەرەتاوە کارەکەی لە بەرهەمێکی هونەریەوە گۆڕیە سەر "**لاشەی تاوان**"ێکی ڕووت.

من هەرگیز بە خراپە باس لە ڕەخنەی ئەدەبی ناکەم، چونکە بە نیسبەت نوسەرەوە لەوە دژوارتر نیە کە بەرخورد لەگەڵ نەبوونی ڕەخنەدا بکات. من وا باس لە ڕەخنەی ئەدەبی دەکەم کە رامان و شیکردنەوەیە، ڕەخنەی ئەدەبیەك کە بتوانێت چەند جارێك ئەو کتێبە بخوێنێتەوە کە دەیەوێت لە بارەیەوە بدوێت. (هەروەك چۆن مۆسیقای ناوازە دەشێت بەردەوام گوێی لێبگریت، هەروەهایش ڕۆمانی مەزن بۆ ئەوە دانراوە کە چەند جارێك بخوێنرێتەوە) ڕەخنەی ئەدەبیەك بێت کە بتوانێت لەسەر کارێکی تازەی ئەمساڵ چەندوچوون بکات، یان لەسەر کارێکی سی ساڵ لەمەوبەر، یان سێ سەد ساڵ لەمەوبەر. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەوەندە جەخت لەسەر کاتی کونکرێتی ڕووداوەکانی ئایندە ناکات، ئەو ڕەخنە ئەدەبیەی هەوڵی دەرککردنی کاری جیدی بێت دەبێت بەم جۆرە لە یادەوەریەکانی مێژودا تۆماری بکات. ئەگەر مێژوی ڕۆمان ئەم تێفکرینەی تیا نەبوایە، ئێستا شتێکمان لەبارەی دوستویفسکی‌یان جۆیس یان بروست نەدەزانی، هەروەها هەموو کارەکان ئەکەوتنە بەر بڕیاری زاڵمانەو لە بیرکردنێکی خێراوە، بەم جۆرە، ئەم حاڵەتەی ڕوشدی ئەوەی سەلماند (ئەگەر پێویست بە سەلماندن بکات) کە ئەو جۆرە تێفکرینە ئێستا ناکرێت، چونکە


سەلمان ڕوشدی

هەر لە پەناوەو، بە بەرائەت و، بەهێزی شتەکان و، گۆڕانــــە کۆمەڵایەتیـــەکان و ڕۆژنامـــەکان ڕەخنەی ئەدەبی بـوە بـە ڕاگـەیاندنێکی ڕووت (زۆرجار زیرەك، بەردەوامیش حازر بەدەست) بۆ ڕووداوە ئەدەبیەکانی داهاتوو.

ئەو ڕووداوە ئەدەبیەی لـە حاڵەتی ئایەتە شـەیتانیەکاندا هاتـەدی فـەرمانی مـردن بـوو بەسەر نوسەرەکەدا، لە دۆخێکی وادا کە مردن و ژیـان یەکسـان دەبـن بەیـەکدی، تـا ڕادەیـەك بـاس لـە هونـەرکردن کـارێکی بێهودەیـە. لـە ڕاسـتیدا هونــەر چیــە لــە بەرانبــەر پرنســیپە گەورەکاندا؟ بۆیە لە هەموو جێگایەکی دنیادا، هـەموو قسـەکان لەسـەر تـەوەری ئیشـکالیەتی پرنسیپەکان خۆی گرتەوە: ئازادیی ڕادەربڕین، بەرگری لێکردنێکی پێویست لێی (لە ڕاستیدا، خەڵکی بەرگریان لێکـرد، ناڕەزاییـان دەربڕیـو ئیمزایــان بــۆ کۆکــردەوە) ئــاین، ئیســـلام و مەسیحیەت، بـەڵام لەگـەڵ ئـەم پرسیارەیشـدا: ئایـا نوسـەر هـەقێکی ئاکـاریی خۆیـەتی کفــر بکــات و بــەو ڕێگایــە باوەڕدارەکـــان بریـنـــدار بکات؟ هـەروەها ئـەم گومانـەیش: ئایا ڕوشـدی هێرشکردنە سەر ئیسلامی تـەنیا بۆ ئـەوە بـوو بناســـرێت و کتێبــە پشـــتگوێ خراوەکـــانی بخوێنرێنەوە؟

لە یەك دەنگیەکی ژێر بەژێردا (لـە هـەموو جێگایـەکی دنیـادا هـەمان کاردانــەوەم بینــی) ئـــەدیب و ڕوناکبـــیرو شـــارەزاکانی نـــهێنی ساڵۆنەکان ئـەم ڕۆمانـەیان بـە زریـان نـاوزەد کرد، بڕیاریـان دا ئەمجارەیان بـەرەنگاری هـەر کاریگەریەکی بازرگانی ببنـەوە، خوێندنـەوەی شــتێکیان ڕەتکـردەوە کـە وای بــۆ دەچــوون بابەتێکـە تـەنیا بـۆ وروژانـدن، هـــەموو ئـــەو بەیانەیان ئیمزاکرد کە بەرگری بوو لە ڕوشدی. هـــەر لــــەو کاتەیشـــدا بــــە تەوســــەوە زەردەخەنەیــــەکیان دەکـــردو دەیـــانگوت: کتێبەکەی؟ "ها.. نا.. ها! نا! نەمخوێندۆتەوە" پیـاوە سیاسیەکان کـەڵکیان لـەم "نەگبەتیـە" سەیرەی ڕۆماننووسێك وەرگرت کە خۆشـیان نەدەویســت. مــن ئــەو جوامێریـــە مەزنـــەی ئەوسـایان لـەیاد ناکـەم: "ئێمـە بەرانبـەر بـەو حوکمــــەی خومــــەینی بــــێزاری دەردەبڕیــــن، ئـازادیی ڕادەربڕیـن لای ئێمـە پـیرۆزە، بـەڵام لەوەیش ناڕازین کە هێرش بکرێتە سەر ئیمان، ئەوە هێرشێکی عەیب و نابوودەو سـوکایەتی کردنە بە بیروباوەڕی گەلان".

بێگومـان، ئیدی کـەس گومـانی لـەوە نـەما کـە ڕوشـدی هێرشـی کردۆتـە سـەر ئیسـلام، چونکــە خــودی تۆمەتبارکردنەکــە بــوو بـــە حەقیقـەت، دەقـی کتێبەکـە بایـەخی نـــەماو، خودی کتێبەکەیش هەروا.

**بەریەك کەوتنی سێ سەردەم:**

ئەمە حاڵەتێکی دەگمەنی مێژوە: بنەمای ڕوشدی لە کۆمەڵگایەکی ئیسلامیدایە کە هێشتا زۆربــــەی زۆری و تــــاکو ئێســــتایش لــــە ســـەردەمێکی پێــش ئـەم ســـەردەمە نوێیــەدا دەژی. لە سەردەمی نوێی ئەوروپادا کتێبەکەی دەنووسێت، زیاتری وردبکەینەوە لـە کۆتـایی ئـەم سـەدەیەدا (مەبەسـت کۆتــایی ســەدەی

بیستە -وەرگێڕ-) چۆن ئیسلامی ئێرانی لەوکاتەدا لە میانەڕەوی دووردەکەوێتەوەو بەرەو سیوکراتیەکی شەڕانی دەچێت، هەروایش مێژووی ڕۆمان لەگەڵ ڕوشدیدا لە زەردەخەنەیەکی جوانی تۆماس مانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ڕۆحێکی سەرکێش کە لە دۆزینەوەیەکی تازەی تەنزەکانی ڕابلیەوە سەرچاوەی گرتبوو، دژایەتیەکان بەریەك کەوتن و، گەیشتنە ئەوپەڕی.

لەم گۆشەنیگایەوە، تاوانبارکردنی ڕوشدی تەنیا ڕێکەوت و شێتی نەبوە، بەڵکو ململانێیەکی قوڵی دوو سەردەمە: سیوکراتیەت پەلاماری سەردەمی نوێ ئەدات، ئەو جۆرە داهێنانەیش تاوانبار دەکات کە زیاتر نوێنەری سەردەمەکەیە: ڕۆمان، چونکە ڕوشدی کفری نەکردوە، پەلاماری ئیسلامی نەداوە، بەڵکو ڕۆمانی نوسیوە، بەڵام ئەمیان بەلای گیانە سیوکراتیەکەوە لە هێرشەکە خراپترە، چونکە کە یەکێك پەلاماری ئاین دەدات (بە هەڤپەیڤین یان سوکایەتی پێکردن یان داهێنان) بۆ پاسەوانەکانی پەرستگا هەیە بە ئاسانی لە چوارچێوەی پسپۆڕی و بە زمانی تایبەتی خۆیان بەرگری بکەن، بەڵام ڕۆمان بە نیسبەت ئەوانەوە ئەستێرەیەکی ترە، جیهانێکی ترەو لەسەر ئەنتولوژیایەکی تر بنیات نراوە، دۆزەخێکە تاقە ڕاستیەك کە تیا هەبێت ئەوەیە کە دەسەڵاتی نیە، نهێنیە شەیتانیەکەیشی هەموو یەقینەکان دەخاتە گومانەوە.

با زیاتر دەست لەسەر ئەمە دابگرین. ئەوە هێرش نیە بۆ سەر ئیسلام، بەڵکو تەم و مژێکە، چونکە بەشی دوەمی ئایەتە شەیتانیەکان (واتا ئەو بەشەی کە بە تاوان تۆمەت بارکراوەو باس لە موحەمەد دەکات و ڕیٚ بە ئەسڵی ئیسلام دەگرێت) ڕۆمانەکە وەك خەونێکی جبریلی فریشتا پیشان دەدات کە دەنوسێت، پاشان، هەر لە خەوەکەدا، دەیکاتە فیلمێکی دزێو کە خۆی تیایدا دەوری سەرۆکی فریشتەکان دەبینێت. تا ئێرە چیرۆکەکە لەسەر هەموو ئاستەکە لێك نزیکن /یەکەم وەك خەون، پاشان وەك فیلمێکی دزێوی سەرنەکەوتوو/ ئەمەیش وا دەردەخات کە مەبەستەکە جەختی لەسەر نەکراوە، بەڵکو تەنیا وەك داهێنانێکی گەمە ئامێز وایە. ئایا ئەمە داهێنانێکی ناقۆڵایە؟ من دەڵێم نا: چونکە بۆ یەکەمین جار لە ژیانمدا، لە شاعیریەتی ئاینی ئیسلام و دنیای ئیسلام تێگەیشتم.

با لەسەر ئەمە بڕۆین: لە دنیای ڕێژەیی ڕۆماندا جێگایەك بۆ ڕق و کینە نیە، ئەو ڕۆماننوسەی ڕۆمان بۆ پاککردنەوەی حساباتی خۆی دەنوسێت (حساباتەکان شەخسی بن یان ئایدیۆلۆژی) بێجگە لە شکستێکی ئیستاتیکی تەواو چی تر وەدەست ناهێنێت. ئەو کچە جوانە -عائشە- کە گوندنشینەکان بەرەو مردن دەبات، دزێوە، بەڵام لە هەمان کاتدا جوان و قەشەنگە (بۆ هەر جێگایەك دەچێت پەپولەی تێوروکاوە) زۆر جار کاریگەریشە، تەنانەت لە وێنەی ئیمامی

ئاوارە کراودا (وێنەی گۆڕاوی خومەینی) تا ڕادەیەك تێگەیشتنێکی عاقڵانە دەبینین، نوێخوازی خۆرئاوا لە چاوی گومانەوە تەماشاکراوە، بە هیچ جۆرێك وا پیشان نەدراوە کە لە خۆرهەڵاتێکی پێشینەدار پێشکەوتووترە، ڕۆمانەکە "لە ڕووی مێژویی و دەرونییەوە" دەقە پیرۆزەکان دەدۆزێتەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە تا چ ڕادەیەك تەلەفزیون و ڕاگەیاندن و کارەکانی ڕابواردن و کات بەسەربردن لە نرخی هێناونەتە خوارێ. ئایا ئەو کەسایەتیە چەپرەوانەی کە گاڵتەیان بە پووچی دنیای نوێ دێت، بەر هیچ سۆزو هاوخەمیەکی بێ پێچ و پەنای ڕۆماننوسەکە کەوتوون؟ نەخێر، ئەوانە شیاوی ئەوەن پێیان پێبکەنیت، هیچ و پوچیش وەك دەوروبەرەکەیان، لەم کارەدا، لەم **کەرنەڤاڵە گەورەیەدا بۆ ڕێژەگەری** کە ئەم کارە هێناویەتە دی، نە کەس تەواو لەسەر هەقەو نە کەسیش لەسەر ناهەقە بە تەواویی. کەواتە لە ئایەتە شەیتانیەکاندا، هونەری ڕۆمان تاوانبار کراوە، لەبەرئەوە، لە هەموو ئەم چیرۆکە غەم ئەنگێزەدا، حوکمەکەی ئیمام خومەینی غەم ئەنگێزتر نیە. (ئەگەرچی حوکمەکە لۆژیکێکی بێ بەزەییانەی هەیە بەڵام گونجاوە) بەڵکو خەمەکە لە بێتوانایی ئەوروپادایە کە نەیتوانی بەرگری و توێژینەوەیەکی لەسەرخۆ بۆ خۆی و کەسانی دی) لەسەر هونەرێك بکات کە هی خۆیەتی زیاد لەوەی هونەری ڕۆمان بێت.

بە جۆرێکی تر، ڕاڤەی کلتوری تایبەتی خۆی بکات و، بەرگری لێبکات، "نەوەی ڕۆمان" سوکایەتیان بە هونەرێك کرد کە هی خۆیان بوو، ئەوروپاییەکانیش، "کۆمەڵگای ڕۆمان" هەر خۆیان وازیان لە خودی خۆیان هێنا.

من ئەوەم بەلاوە سەیر نیە کە زانا لاهوتیەکانی سۆربون، پۆلیسە ئایدۆلۆژیەکانی سەدەی شانزە کە گەلێك کەسیان سوتاند، ژیانیان لە ڕابلیە تاڵ کردبێت و، ناچاریان کردبێت کە هەڵبێت و خۆبشارێتەوە، ئەوەی بەلامەوە سەیرو جێگای سەرسوڕمانە، ئەوەیە کە پیاوانی دەسەڵاتداری سەردەمەکەی، وەك **کاردینال بیلای و کاردینال ئودین** و، بە تایبەتیش پاشای فەرەنسا **فرانسوای یەکەم**، پاراستیان، ئایا ئەمە بەرگریکردن بوو لە پرانسیپەکان؟ لە ئازادیی ڕادەربڕین؟ لە مافی مرۆڤ؟ ئەوەی ئەم هەڵویستەی پێوەرگرتن لە هەموو ئەو شتانە مەزنترە، ئەوان بە ڕاستیی عاشقی ئەدەب و هونەر بوون.

من ئەمڕۆ لە ئەوروپادا کەسێکی تری وەك کاردینال بیلای و فرانسوای یەکەم نابینمەوە. وەڵێ ئاخۆ ئەوروپا هێشتا هەر ئەوروپایە؟ واتە "کۆمەڵگەی ڕۆمانە؟" بە جۆرێکی تری بڵێین: ئایا ئەوروپا لەسەردەمی نوێدایە؟ ئایا ئێستا نەچۆتە سەردەمێکەوە کە هێشتا ناوی نیەو، بەلای ئەوەوە هونەرەکەیشی جێگای بایەخ پێدانی زۆر نیە؟ لەم حاڵەتەدا، پێویست بە سەرسوڕمان ناکات، کاتێك کە دەبینێت بۆ

یەکەمین جار لە مێژوویدا حوکمی مردن بەسەر هونەری ڕۆماندا دەدرێت، ئەو هونەرە دەگمەنەی خۆی، کەچی بە گەرمی نایەتە دەنگ؟ لەم سەردەمە نوێیەو ژیانە تازەیەدا، ئایا ڕۆمان، ماوەیەکە، وەك یەکێك ناژی کە فەرمانی مەرگی بەسەرا درابێت؟

### ڕۆمانی ئەوروپایی

بۆ ئەوەی زۆر بە وردی دەستنیشانی ئەو هونەرە بکەم کە دەمەوێت لێی بدوێم، ناوی لێ دەنێم **ڕۆمانی ئەوروپایی**، لەم ناوزەدکردنەدا مەبەستم ئەو ڕۆمانانە نیە کە لە ئەوروپادا دەرکەوتوون و نوسەرەکانیان ئەوروپاییە. بەڵکو مەبەستم لەو ڕۆمانانەیە کە بونەتە بەشێکی ئەو مێژوەی لە سەرەتای سەردەمی نوێی ئەوروپادا سەریانهەڵداوە. بێگومان ڕۆمانی تر هەن، ڕۆمانی چینی، ڕۆمانی ژاپۆنی، ڕۆمانی گریکی کۆن، وەلێ ئەو ڕۆمانانە پەیوەندیەکی گۆڕانکاریان بەو پڕۆژە مێژووییەوە نیە کە لەسەر دەستی ڕابلیەو سیرڤانتسدا لەدایکبوە.

کە لەسەر **ڕۆمانی ئەوروپایی** دەدوێم تەنیا بۆ ئەوە نیە لە ڕۆمانی چینی (وەك نمونە) جیابکەمەوە، بەڵکو ئەمەوێت بڵێم کە مێژوی ڕۆمان فرە نەتەوەیەو، ڕۆمانی فەرەنسی، یان ڕۆمانی ئینگلیزی، یان ڕۆمانی هەنگاری ناتوانێت مێژوویەکی تایبەتیو سەربەخۆ بۆ خۆی دروست بکات. بەڵکو هەموویان مێژوویەکی هاوبەش پێکدەهێنن، مێژویەکی جیهانی، لە زەمینەیەکدا کە دەشێت ئەو ڕۆمانانەی تیا دەربکەون، هەروەها مانای پێشکەوتنی ڕۆمان و بەهای بەرهەمە تایبەتیەکانیش پێکدێنن.

لە قۆناغە جیاوازەکانی ڕۆماندا، نەتەوەی جیاجیا دەستپێشخەر بوون، هەر وەك ڕاکردنی بەرید: یەکەم ئیتالیا لەگەڵ بوکاشیودا، گەورە مزگێنی هێنەکە، پاشان فەرەنسای ڕابلیە، ئینجا ئیسپانیای سیرڤانتس و ڕۆمانی وێڵەکان، سەدەی هەژدەیش سەدەی ڕۆمانی گەورەی ئینگلیزیە لەگەڵ هاتنی گۆتەی ئەڵمانی لە پێش کۆتایی هاتنی سەدەکەدا، سەدەی نۆزدە کە بە تەواوی تایبەتە بە فەرەنساوەو لەگەڵ خۆتێهەڵکێش کردنی ڕۆمانی ڕوسیدا لە سێیەی کۆتایی سەدەکەدا، هەر دوای ئەوەیش، سەرهەڵدانی ڕۆمانی ئەسکندنافی، پاشان سەدەی بیست و سەرکێشیە مەرکەزیەکەی ئەوروپا لەگەڵ کافکاو موزیل و بروك و گومبروفیتشدا..

ئەمەوێت بڵێم کە مێژوی ڕۆمان فرە نەتەوەیەو، ڕۆمانی فەرەنسی، یان ڕۆمانی ئینگلیزی، یان ڕۆمانی هەنگاری ناتوانێت مێژوویەکی تایبەتیو سەربەخۆ بۆ خۆی دروست بکات.

ئەگەر ئەوروپا یەك نەتەوە بوایە، لەو بڕوایەدا نیم مێژووی ڕۆمانی بەم شێوە زیندوەو بەو هێزو تواناو جۆراوجۆریەوە بۆ ماوەی چوار سەدە بەردەوام بوایە، ئەو بارە مێژووییە هەمیشە تازەیە (بە ناوەڕۆکە نوێکەی بوونیەوە) بوو کە جارێك لە فەرەنساو جارێك لە ڕوسیاداو، پاشان لە شوێن گەلێکی تردا سەریهەڵدا، هەر ئەوە ڕێڕەوی هونەری ڕۆمانی گۆڕیو، سروشتی تازەی پێبەخشی و ڕێگاچارەی جوانکاری نوێی بۆ پێشنیاز کرد، وەك ئەوەی مێژووی ڕۆمان لە ڕێڕەوەکەیدا گەلێك شوێنی جیاوازی ئەوروپای یەك بە دوای یەکدا ڕاپەڕاندبێت، تایبەتمەندی دانیو، لە هەمان کاتدا، لە هۆشیاریەکی هاوبەشی ئەوروپادا جێی کردەوە.

بۆ یەکەمین جار لەم سەدەیەدا، دەستپێشخەری گەورە لە مێژووی ڕۆمانی ئەوروپاییدا لە دەرەوەی ئەوروپا هاتەدی: یەکەمیان لە ئەمریکای باکور، لە ساڵانی بیست و سیەکاندا، پاشان لە ئەمریکای لاتین لە ساڵانی شەستا. دوای ئەو چێژەی لە هونەری باتریك شاموازو، ڕۆمان نوسی دورگەی ئانتیل و، پاشان لە هونەری روشدیم چەشت، حەز ئەکەم بە شێوەیەکی گشتی لەسەر ڕۆمانی **لەژێر هێڵی پانی سیو پێنج پلەوە**، یان ڕۆمانی باشور قسەبکەم: ڕوناکبیریەکی گەورەو نوێی ڕۆمان نوسی کە تایبەتمەندیەکەی لەو مانا غەریبەدایە بۆ واقیعێك کە پەیوەندیی بە خەیاڵێکی بێ سنورەوە هەیەو ڕێسا عەقڵانیەکان دەبەزێنێت.

بە تەواوی نازانم ئەم خەیاڵە سەرسامکەرە لە کوێوە دێت، لە کافکاوە؟ بێگومان، لەم سەدەیەدا کافکا ئەو ڕوداوەی شوێنی بڕوا پێکردن نیە لە هونەری ڕۆماندا ئەو وای کرد بڕوای پێبکرێت، بەڵام خەیاڵی **کافکاوی** لە خەیاڵی **ڕوشدی** یان مارکیز جیاوازە. ئەم خەیاڵە فراوانە پێدەچێت لە کلتوری تایبەتی باشورەوە سەرچاوەی گرتبێت، بۆ نمونە لە ئەدەبی زارەکیانەوە، کە هەمیشە زیندوە (شاموازو لە حیکایەتخوانەکانی **کراوا** لەوە ئیلهامی وەرئەگرت) یان وەك فوینتیس حەزی لێبوو پێی بڵێت حاڵەتی ئەمریکای لاتین، کە لە شێوازە باروکیەکەیدا، لەوەی ئەوروپا دەوڵەمەندو کێوی ترە.

کلیلێکی تری ئەم خەیاڵە: **مۆرکی بە گەرمەسێر بوونی (ئیستوایی) ڕۆمانە**. من لێرەدا فانتازیایەکی ڕوشدیم دێتەوە یاد، فاریشا بەسەر لەندەندا دەفڕێ و ئومێدی ئەوە دەخوازێت کە ئەم شارە دوژمنکارە مۆرکی گەرمەسێر وەربگرێت، سودی ئەم بە گەرمەسێربوونەیش لەمانەدا پوخت دەکاتەوە:

"حەسانەوەی نیوەڕوان لە هەموو دنیادا *[...]* دانانی باڵندەی تازە لەسەر درەختەکان (ئەرە[٣]، تاوس، تووتی) درەختی نوێ لەژێر باڵندەکاندا (گوێزی هیندی، دار خورمای هیندی، دار هەنجیری بەنگالی چڕ) *[...]* حەماسەتی ئاینی و هاندانی سیاسی *[...]* سەر لە یەکتری دانی دۆستان لە ناوەختا،

داخستنی تەمەڵخانە، پەرەپێدانی خێزانی گەورە، خۆراکێك زۆر داوودەرمانی تێبکرێت /.../ لایەنە خراپەکانیش: کۆلێرا، تیفۆید، نەخۆشی زۆر خستنەوە، دین خواز، تۆز، ژاوەژاو، ڕوناکبیریی زیادەڕۆ".

("ڕوناکبیری زیادەڕۆ": ئەمە "ڕۆناکبیریی زیادەڕۆ" دەربڕینێکی زۆر جوانە، ئاراستەی ڕۆمان لە دوا قۆناغی نوێ بوونەوەیدا: لە ئەوروپا، ژیانی ڕۆژانە هەمیشە یەك ڕیتمی هەیە، لێکدانەوەیەکی سەفسەتاییانە بۆ ڕەنگی خۆڵەمێشی لەسەر خۆڵەمێشیەك، لە دەرەوەی ئەوروپا: سیخناخ بوونی ڕوداوە زۆر ئاوارتەکان (استثنائی) کەوتنی ڕەنگ بەسەر ڕەنگدا، مەترسی: لە ئەوروپادا، بێزاربوون لە ڕەنگی خۆڵەمێشی، لە دەرەوەی ئەوروپا، یەك ئاهەنگی وێنە ڕەنگاڵەییەکان).

ئەو ڕۆمانانەی لەژێر هێڵی پانی سی و پێنجدا بەرهەم هێنراون، ئەگەرچی کەمێك بە زەوقی ئەوروپایی نامۆن، هەر بەردەوام بوونی مێژووی ڕۆمانی ئەوروپایین، شێوازیان، ڕۆحیان، بە شێوەیەکی سەرسامکەریش لە سەرچاوە بەراییەکان دەچن. ئەوەی کۆن ڕابلیە کردویەتی، ئەمڕۆ لە هیچ شوێنێکی تردا، بە ئەندازەی ڕۆماننوسانی غەیری ئەوروپایی بە خۆشیەوە پەیڕەوی لێناکرێت.

### ئەو ڕۆژەی کە ئیدی پانورژ کەس ناخاتە پێکەنین

ئەوەی بۆ دواجار من دەگێڕێتەوە لای پانورژ، لە **پانتاگروید**، پانورژ حەز لە ژنێك دەکات و دەیەوێت بەهەر نرخێك هەیە پێی بگات، لە کڵێسەدا، لە کاتی قوداسدا (ئایا ئەمە پێشێلکردنی پیرۆزییەکان نیە؟). زۆر هەوەس بازانە قسە لەگەڵ ژنەکەدا دەکات (ڕەنگە ئەمڕۆ لە ئەمریکادا، لەسەر ئەو ڕەوشە سێکسیە سەدو سیانزە ساڵی بخەنە زیندانەوە).

کە ژنە گوێی ناداتێ، ئەو گۆشتی وردکراوی لەشی سێکسیی دەڵە سەگێك بە جلەکانیا دەکات، کە ژنە لە کڵێسەکە دێتە دەرێ هەموو سەگە گۆڵەکانی ئەوناوە (وەك ڕابلیە دەڵێت شەش سەد هەزار و چواردە سەگ بوون) دەکەونە دوای و میزی پێدا دەکەن. لە بیرمە تەمەنم بیست ساڵان بوو، لە جێگایەکی کارگەراندا، کتێبەکەی ڕابلیەم بەوەرگێڕاوە چیکیەکەی لەژێر سەردا بوو، زۆرجار بە ناچاری ئەو چیرۆکەم لەو کتێبە گەورەیەدا بۆ کرێکارەکان دەخوێندەوە، ئەمەندەیان پێ سەیر بوو چیرۆکەکەیان لەبەر کردبوو، هەرچەندە ئەوان ڕەوشتیان جوتیارانەو، بەڵکو کۆنەپارێز بوون، لە پێکەنینەکەیاندا هەستت بەوە نەدەکرد لەو قسە سوکانە بە تەنگ بێن و ڕقیان لە پانروژ بێتەوە، بەڵکو خۆشیان دەویست و تەنانەت یەکێك لە هاوڕێکانمانیان بە ناوی پانورژەوە بانگ دەکرد، ئاه، نا، ئەو ژنانی نەبوو، بە گەنجێکی سادەو داوێن پاك ناوی دەرکردبوو، شەرمی دەکرد لە حەمامدا بە ڕووتی ببینین، گوێم لەهاواریانە وەك ئەوەی دوێنێ بووبێت "پانورك" ناوەکەی وا بە زمانی چیکی

دەکەوتە سەر زمان "دەی بڕۆ حەمام، ئەگینا بە میزی سەگ دەتشۆم"

ئێستایش گوێم لەو پێکەنینە خۆشەیە کە گاڵتەی بە شەرمنی هاوڕێیەك دەهات. وەڵێ لە هەمان کاتدا خۆشەویستیەکی زۆر سەرسامکەر بوو بۆ حەیای ئەو کوڕە. زۆریان حەز بەو وشە حەشەریانە بوو کە پانورژ لە کڵێسەدا بە ژنەکەی وتبوو، ئەوەیشیان پێ خۆش بوو کە ژنەکە تۆڵەی داوێن پاکی خۆی وەرگرتوە، لەوەیش خۆشتر سزادانی ژنەکە بوو بە میزی سەگ، هاوڕێ کۆنەکانم لەگەڵ کێدا هاوخەم بوون؟ لەگەڵ شەرمنیا؟ لەگەڵ بێ شەرمیا؟ لەگەڵ پانورژا؟ یان لەگەڵ ژنەکەدا؟ یان لەگەڵ ئەو سەگانەدا کە شانازی ئەوەیان پێبڕا میزیان بە کچێکی جوان و قەشەنگدا کرد؟

**تەنز:** پزیسکێکی خوداییە، دنیا لە تەم و مژی ئەخلاقی و، مرۆڤیش لە بێ تواناییە سەختەکەی لە داوەریکردنی خەڵکانی تردا ئاشکرا دەکات.

**تەنز:** مەستیەکە ڕێژەیی شتە مرۆڤایەتیەکان دەوروژێنێت، چێژێکی ناوازە لەو یەقینەوە کە یەقین نیە.

بەڵام تەنز وەك ئوکتافیوپاز دەڵێت کە: "لە داهێنانە مەزنەکانی گیانی مۆدێرنەیە" نە لە سەرەتای دروستبونەوە لەگەڵماندا بوە، نە تا کۆتاییش لەگەڵماندا دەمێنێتەوە.

بە دڵێکی غەمگینەوە، بیر لەو ڕۆژە دەکەمەوە کە ئیدی پانورژ کەس ناخاتە پێکەنین.

## پەراوێزەکان

[١] – ئەم ڕۆمانە لە لایەن وەرگێڕی ئەم باسەوە کراوەتە کوردی و بەم زوانە چاپ دەکرێت -وەرگێڕ-.

[٢]– *Weltanschaug* ڕوانینێکی میتافیزیکە بۆ دنیاو پەیوەندی بە مانای ژیانەوە هەیە، فەیلەسوفە ئەڵمانیە ڕۆمانسیەکان پێی بەناوبانگن.

[٣]–ئەرە *Ara* جۆرە تووتیەکی بەرازیلی گەورەیە.

## سەرچاوە

الوصايا المغدورة. ميلان كونديرا، کۆمەڵێك وتاری جۆراوجۆر.

# ماڵپەڕی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

*www.sardam.org*




خوینەرانی کتیب و چاپەمەنیەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەتوانن لە ریی تۆری ئینتەرنیتەوە هەموو بەرهەمەکانمان بخویننەوە بە ناونیشانی (**www.sardam.org**) کە بریتین لە:

نویترین ژمارەی گۆڤارەکانی "سەردەم، ئایندە، زانستی سەردەم، رۆڤار، کتیبی گیرفان، کتیبی منداڵ"، کە راستەوخۆ لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ژمارەکانیان لە ناوەوەی کوردستاندا، دەخرینە ناو سایتەکەوە.

هەروەها کتیبیش کە هەر (١٥ تا ٢٠) رۆژ جاریك ٣ کتیب لە کتیبەکانی دەزگا پیشکەشی خوینەران دەکەین.

خوینەرانی **sardam.org** دەتوانن ئەو بڵاوکراوانەی سەرەوە بە خۆرایی بخویننەوە.

شایانی وتنە ئەم ماڵپەرە بە هەوڵ و توانای کارمەندانی دەزگا، ئامادەو جیبەجی کراوە.

# گفتوگۆ

- گفتوگۆ لەگەڵ هـ. گ. گادامێردا          و: بەکر عەلی



# قەرەج

• ئەلێکساندەر پوشکین

▪ لە عەرەبییەوە: ئازاد بەرزنجی

(لە پێدەشتەکانی بیسارابیادا قەرەجەکان کۆچ و باریان لێك ناوەو ژاوەژاویان ئەو ناوەی تەنیوەتەوە، ئەوەتانێ دەیانەوێ ئەمشەویان لای کەناری ڕووبارەکەو، لەژێر ڕەشماڵە شڕەکانیاندا بەسەر بەرن. هەوارگەکەیان، وەك ئازادی دڵ شاد دەکاو، لەژێر ئاسمانی فراواندا خەوێکی هێمن دەچێتە چاویان، لەنێو پێچکەی گالیسکەکانیاندا کە کلیم و بەڕەکانیان تا نیوەیانی داپۆشیوە ئاگر پێکراوەو، خێزانەکانیش بە دەوریدا دانیشتوون و خەریکی سازکردنی شێوی ئێوارەن. وڵاخەکانیان لەو کێڵگە بەرین و فراوانەدا دەلەوەڕێن و، لە پشت ڕەشماڵیشەوە ورچەی ماڵیکراو خۆی لێداوە بە زەویدا، لە نێوەندی ئەم پێدەشتانەدا هەموو شتێك زیندوو دێتە بەرچاو. خێزانەکان خەریکی کاروباری ساکارن و خۆیان بۆ کۆچ بەرەو شوێنێکی نزیك ئامادە دەکەن. دەنگی گۆرانیی ئافرەتان و قیژەی منداڵان و ئاسن کوتان ئاوێتەی یەکدی بوون.

وا خەوی ئارام خۆی کشاندە ناو هۆبەی ڕەشماڵەکانەوە. لەو بێدەنگییەدا کە باڵی بەسەر ئەو دەشت و سارایەدا کێشاوە، تاوناتاوێ نەبێ وەڕینی سەگێك یان کوڕژنی ئەسپێك، هیچی دی نابیسترێ.

وا ئاگرەکان کپ بوونەوە، بە تەنها تریفەی مانگ لەم شەوە هێمنەدا دەوارەکان ڕۆشن دەکاتەوە. لە یەکێك لە دەوارەکاندا، کابرایەکی پیرەمێرد کە هێشتا نەنوستووە، لە کن کوانووی ئاگرەوە پالی داوەتەوەو خۆی داوەتە بەر دوا تینی ئاگری کپ بوو و، چاوانیشی بڕیوەتە کێلگەی بەرفراوان؛ کە تەمومژی شەوانەی لێ بڵند دەبێتەوە. کیژۆلە نیانەکەی هێشتا لە گەردشی شەوانە

نەهاتۆتـەوە. بـەم جـۆرە سەربەسـتـییە فـێرە، دەگەڕێتـەوە.. بـەڵام دەمێکـە شـەو داهـاتووەو تۆزێکی دی مانگ ماڵئاوایی لە ئاسمان دەکات و، خۆی لە پشت هـەورە دوورەکانـەوە حەشار دەدات، کەچی تـا ئێسـتا زەمفـیرا دیـار نییـەو شێوەکەیشی وا خەریکە سارد دەبێتەوە).

/ئەوەتانێ وا هاتـەوە.. بـەڵام پیرە دەبینـێ وا کوڕە لاوێکیش لەگەڵیدایـەو هـەنگاوی خێرا دەنێ، تۆ بڵێی ئەم کوڕە لاوە کێ بێ؟/



*زەمفـیرا:* بابـە.. میوانێکـم لەگـەڵ خۆمـدا هێناوە.. لە پشت گردەکەوە.. لەو چۆڵەوانیەدا بینیم و منیش حەزم کرد بیهێنمـەوەو ئەمشـەو لـــەژێر ئـــەم دەوارەداو لەگـــەڵ ئێمـــەدا بەســـەربەرێت، حـــەزدەکات وەك ئێمـــە ببێتـــە قـەرەج.. دیـارە ئـەوەی لـە چـارە نووسـراوە.. منیــش حــەز دەکــەم ببمــە هــاوڕێی.. نــاوی ئەلیکۆیـــەو مـــن ڕوو لـــە کـــوێ بکـــەم لێـــم جیانابێتەوە.

*پـیرەمێرد:* مـن بەمـە بەختـــەوەرم.. (بـــە ئەلیکۆ) دەتوانیت تـا سـبەینێ لـەژێر سـایەی ئەم ڕەشماڵەدا لەگەڵماندا بمێنیتەوە. خۆ گەر ویسـتت ئەوا هـەر بـە یـەکجاری لەگەڵماندابـەو منیش نان و خوێنت لەگەڵدا بەش دەکـەم، ببـە بە کـوڕی ئـەم ماڵـەو بـەم ژیانـە پـڕ هەژاریـەمان ڕابێ، سبەینێش لەگەڵ کازیوەدا پێکەوە *ڕێی* کۆچ دەگرینە بەر. خۆت فێری کارێکیش بکە؛ ئاسنگەری، یـان گۆرانـی، یـان لـە تـەك ورچـەدا *ڕێی* ئــەم دێ و ئــەو دێ تـــەی بکە.

*ئـــەلیکۆ:* (بـــە بەختەوەریـــەوە) دەمێنمەوە.

*زەمفیرا:* (بە شادییەوە) دەبێتـە مـێردم.. کـێ دەتوانـێ لێمـی زەوت بکـات؟ (ڕوو لـەوان دەکـات) شـەو درەنگـە.. مـانگ ئـاوابووەو تـــاریکی پێدەشـــتی چۆڵـی تەنیوەتـەوە. بـە دەســت خۆم نییە وەنەوز دایگرتـووم و خەوم دێ.

* * *

/سـپێدەیە.. هێـدی هێـدی پـیرە لـە ژێـر ڕەشمـاڵدا دێـت و دەچـێ، دەیـەوێ زەمفـیراو ئەلیکۆ بەخەبەر بهێنێتەوە/.

*پیرەمێرد:* هەڵسە زەمفیرا وا خـۆر کـەوت.. تـۆش میوانەکـەم.. کـاتی هەڵسـانە، ڕۆڵـەکانم دەسبەرداری چێژی خەوبن.

/دەنگی قەرەجەکان ئاسمانی پڕکردبووەوە، ڕەشماڵەکان پێچرانەوە، وا گالیسکەکان دەکەونە ڕێ، ئەوەتانێ ئەو دەشتە کاکی بە کاکییە تەی دەکەن، مناڵە ژیکەڵەکانیان لەنێو ئەو سەبەتانەدان کە بەملاولای گوێ درێژەکاندا شۆڕ بوونەتەوە، لە دوای ئەمانیشەوە پیاوان و برایان و دایکان و کیژۆڵان و پیران و لاوان ڕێگایان گرتۆتە بەر. دەنگە دەنگی قیژەو گۆرانیی قەرەجیانەو مرخە مرخی ورچ و زرنگەی زنجیر تێکەڵ بە پەڕپووتی و هەژاری و ڕووت و قووتیی پیران و مناڵان بووە. پێژنی گیسکەکان و شڵقەی ئاوی نێومەشکەکان لەگەڵ یەکتریدا تەبان. هەموو شتەکان سەرەتایی دێنە پێشچاو. بەڵام کەف و کوڵ و تین و تاویان.. بە ژیانی مردووی ئێمە.. بە ژیانە سست و خاوەکەمان گەڵێ نامۆیە.. وەك نامۆیی گۆرانیی کۆیلەکان../.

/ئەلیکۆ بە ماتییەوە دەڕوانێتە پێدەشتی چۆڵ و نایەوێ ڕووبەڕووی نهێنییەکانی ئەم خاکە سارییەی خۆی بێتەوە.. چ پێویستی بەوە هەیە؟ مادامەکی زەمفیرای چاوڕەشی لە پەناوەیەو، سەربەست و ئازادەو خۆری پڕشنگداریش تینی خۆی پێ دەگەیەنێت.. دەبێ هۆی ئەم دوودڵییەی چی بێت؟ چ خەمێکە وا گینگڵ بە ڕۆحی دەدات؟

باڵندە دەزانێ خەم چییە؟ خۆی ماندوو دەکات تا هێلانەیەك چێ بکات بەرگە بگرێ و درێژخایەن بێ؟ نەخێر.. لەسەر هەر لقێك بێ ئارام و دڵنیا لە ئامێزی شەودا لێی دەخەوێت، لە گزنگیشا گوێ بۆ وشەی یەزدان ئەدێرێ و ڕادەپەڕێت و دەکەوێتە خوێندنێکی بە جۆش.

بەهار.. شۆخی ئەم سروشتە وا تێپەڕی.. هاوینی گەرم و پاشانیش خەزانی درەنگ بە خۆی و تەم و مژو هەورەوە دێ.. لەم وەرزەدا مرۆڤ هەست بە جاڕسی دەکات.. پۆلە باڵندەکان بەسەر شینیی زەریاکاندا کۆچێکی دووریان لەبەرە– تاوەکو بەهاری ئایندە بگەڕێنەوە.

ئەم کۆچەرییە پەڕاگەندەیە لە باڵندەیەکی بەختەوەر دەچێت کە هێلانەیەکی سەقامگیری نییەو لەسەر هیچیش ڕانەهاتووە، بۆ کوێ بچێ ڕێگاکان لەبەردەمیدا ئاوەڵان.. لەهەرکوێش بارگەو بنە بخات ساپییتەیەك هەیە بیگرێتە خۆی. سپێدان کە لە خەو ڕادێ کاروباری ئەو ڕۆژەی دەداتە دەست یەزدان، گەڵێ شادەو چ نییە لەم ژیانەدا کامەرانیی تەڵخ بکات. هەندێ جار ئەستێرەی بەختی دەبێتە لەمپەر لە ئاست هەنگاوەکانیدا و بێئەوەی چاوەڕوانی بێ دەیەوێ گەمەی لەگەڵ بکات. گەڵێ جار گەواڵە هەورە بێ بەزەییەکان بەسەریدا گرماندوویانە، وەلێ ئەلیکۆ گوێ پێنادا.. گەردەلوول بێ یان سایەقە.. بەبێ پەروا چاوانی خۆی لە ئاستیدا دەنووقێنێ.. گوێ ناداتێ چارەنووسی بە زەبر و زەنگ لەتەك خۆیدا چی بۆ دێنێ.. ئای خودایە!

خۆزگەو ئارەزوو چۆن گەمە بە دڵی نەرمی ئەم لاوە دەکات، چ دڕدۆنگییەك لە سینەی پڕ کەسەرو کەشەنگیدا تافە تافێتی؟!! تۆ بڵێی هێور بووبێتەوەو هەتا هەتایەش هەروا بمێنێ؟ با چاوەڕوان بێ.. ئەوەتا ڕۆژێکیان زەمفیرا کە لە خەو هەڵدەسێ..

*زەمفیرا:* هاوڕێم پێم بڵێ.. خەفەت بۆ ڕابووردووت ناخۆیت؟

بۆ ڕۆژانێك کە بێ گەڕانەوە جێت هێشت؟ ئەلیکۆ لێم تێدەگەیت.. مەبەستم ئەوەیە بیری خەڵك و کەس و کارت.. بیری شارەکەت؟

*ئەلیکۆ:* بۆچی خەفەت بخۆم؟ ئەی تۆ کەنگێ هەست بە کۆیلایەتیی کوشندەی شار دەکەیت؟ لەوێ خەڵکی لە پشت شووراکانەوە دەژین.. نە هەوای پاکی سپێدەو نە بۆنی خۆشی مێرگە بەهاریەکان هەڵنامژن. خۆشەویستی و عیشق لای ئەوان شوورەییە.. خاوەن بیرو هزرێکی ترساون.. لە پێناوی ئاڵتوون یان کۆت و بەندا بازرگانی بە ئازادیی خۆیانەوە دەکەن و لەبەردەم بتەکاندا مل کەچ دەکەن. دەبێ من چیم جێهێشتبێ؟ درۆو دەلەسەو بێ ئەمەگی، فەرمانڕەواییەکی هیچ و پووچ؟ یان ستەم و زۆری کەسانێکی شێت، یان شوورەیی و ئابڕووچوون؟

*زەمفیرا:* کۆشکەکانیان بەرز و گەورەن، فەرشەکانیان ڕەنگاوڕەنگن، خۆشگوزەرانی و ڕابواردن و خوانی پڕ لە خۆراك، یان بەرگ و والای کیژۆڵەکانیان، چەند قەشەنگن!

*ئەلیکۆ:* خەڵکی شار جەژن و ئاهەنگی خۆشیان نییە، لەوێ ناهێڵن خۆشەویستی هەناسە بدات.. شادمانی شك نابەن.. کیژۆڵەکان؟ تۆ ئاوەها بێ زێڕو زیو.. بێ مرواری و بێ گەردانە لەوان گەلێ قەشەنگتری. هاوڕێ بە سۆز و نیانەکەم بیر لەوانە مەکەرەوە و مەگۆڕێ! منیش تاقە ئارەزوویەکم هەیە.. ژیان و خۆشەویستی و ساتەکانی تەمەنی خۆم لەگەڵ تۆدا بەش بکەم.. ئێرەش بە نیشتمان و زێدی خۆم هەڵدەبژێرم.

*پیرەمێرد:* کوڕم گەرچی تۆ لەنێو کەسانێکدا لەدایك بوویت کە حەز بە ژیانی پڕ ئاڵاو والا دەکەن کەچی ئێمەت خۆش دەوێ، وەلێ ڕۆڵە.. ڕەنگە ئەم ئازادییەی ئێمە هەمیشە بەو جوانییە نەمێنێتەوە لە چاو کەسێکدا کە بە ژیانی شار ڕاهاتبێت.

لەنێو ئێمەدا بەسەرهاتێك هەیە دەیگێڕنەوە و دەڵێ: کاتی خۆی کابرایەك لە باشوورەوە ڕووی کردە ئێمە.. ئەو کابرایە لە دەست جەوری قەیسەرەکان هەڵاتبوو، ئێستا وەك جاران ناویم لەیاد نەماوە.. بە تەمەن بوو، بەڵام دڵی هێشتا لاوو پڕ جۆش بوو.. خاوەن دەنگێکی زۆر خۆش بوو، گۆرانی دەچڕی.. سەدای لە خوڕەی تاڤگەکان دەچوو، قەرەجەکان هەموو خۆشیانویست و لەگەڵیاندا لە کەنار ڕووباری (دانوب)ەوە نیشەجێ بوو. خراپەی بۆ هیچ کەسێ نەبوو.. چیرۆکەکانی دڵڕفێن بوون.. هیچ پیشەیەکی نەدەزانی و

وەك كوڕیژگەیەك شەرمن بوو، خەڵكی ماسی و باڵندەیان بۆ ڕاودەكرد.

كاتێ ڕووبار دەیبەست و دەبووە شەختە؛ پەڕوباڵی ئەو باڵندانە دەبوونە پۆشاكی جەستەی. ڕۆڵەم كەچی ویڕای ئەوەیش بە نەهامەتیو هەژاری هەر ڕانەهات.. بە ڕەنگزەردی و لاوازیەوە بە دێهاتەكاندا دەگەڕاو دەیوت: (چونكە من تاوانم كردووە خواوەندە توورەكان دەیانەوێ تۆڵەم لێ بسێننەوە.. تۆ بڵێی كەی سەرم فرازبێ؟) هەموو ڕۆژێ بە مەلوولی لە كن ڕۆخی (دانووب)ەوە دادەنیشت و فرمێسكی بەدبەختیی دەڕشت و یادی شارە دوورەكەی خۆی دەیخرۆشاند، لە ساتی سەرەمەرگیشدا وەسیەتی كرد ئێسكەكانی بۆ باشوور ببرێتەوە چونكە ئالوودەی نیشتمانە. كوڕەكەم غەریبان تا ساتی ئاویلكەو مەرگیش هەر میوانێكی بێ ئارام و دوودڵن.

*ئەلیكۆ:* ئەی ڕۆمای بەهێز و ناودار ئەمەیە چارەنووسی ڕۆڵەكانت! ئەی سترانبێژی ئەوین، ئەی سترانبێژی خواوەندەكان.. تۆ بڵێی سەربەرزی چی بێت؟ شین كردنە لە كن گۆڕەكان؟ یان ستایشە؟ كە لەم وەچەوە بۆ ئەو وەچە دەمێنێتەوە؟ یان ئەم بەسەرهاتەیە كە لەژێر سایپیتەی پڕ دووكەڵی قەرەجێكدا دەگێڕڕێتەوە؟

★ ★ ★

/دوو ساڵ تێپەڕی، قەرەجەكان وەك ڕاهاتوون هەر ڕەوەندن و لەم دەڤەر بۆ ئەو دەڤەر دەچن.. ڕوو لە كوێ بكەن ئاسوودەیی وەچنگ دەهێنن، ئەوەتانێ ئەلیكۆ وەك قەرەجێكی ئازادو ڕەها گاڵتەی بە كۆت و پێوەندی جارانی خۆی دێ و بێ خەم و بێ پەشیمانی لەگەڵ قەرەجەكاندا لە كۆچ و گەڕاندایە. تازە ئێرە بووەتە دیارو هەوارگەی.. بووەتە خێزانی.. بە ژیانی قەرەجێتی ڕاهاتووەو ڕۆژانی دێرینی لەیاد چووەتەوە. ئای چەند تامەزرۆی ژێر سایەی سایپیتەو ئۆخژنی بێكاریی هەمیشەیی و زمانی هەژاریانە! ورچێكی لانە شێواو میوانی دەوارەكەیەتی؛ لە تەك خۆیدا بەو پێدەشتانەداو لە دێهاتەكانداو لە نزیك



كوخەكاندا قورس قورس سەما دەكات و دەمرخێنێ و گاز لە كۆت و زنجیرەكەی دەگرێ و خەڵكیش بە شاگەشكەییەوە تەماشا دەكەن. پیرەش خۆی بەسەر گۆچانەكەیدا دەدات و هێدی هێدی دەف دەژەنێت. ئەلیكۆ بە دەم گۆرانییەوە پێش ورچە دەكەوێ و زەمفیرایش لەگەڵیاندا ئەم دێو ئەو دێ دەگەڕێت و بەخشیشەكان كۆدەكاتەوە، كاتێ كە شەویش

دادێ؛ هەرسیکیان سەربەسەری یەکتردا دەکەن و بە دیار مەنجەلیك برویشەوە دادەنیشن، پاشان پیرە رادەکشیت و دنیا کش و مات و رەشمالیش کپ و تاریك دەبیت/.

/پیرەمیرد خۆی داوەتە بەر تیشکی خۆرەتاوی بەهار، تەمەن خەریکە خوینی بەرەو ساردی دەبات، زەمفیرایش بە دەم راژەنینی لانکەکەوە خەریکی چرینی بالۆرەیەکەو ئەلیکۆیش رەنگ لە رووی هەلگیراوەو گوێ رادەدیریت/.

*زەمفیرا:* ئەی میردی پیرم، میردی ترسناکم، سەرم ببرە، بمسووتینە.. من پتەوم.. نە لە چەقۆو نە لە ئاگر دەترسم.. رقم لیتە.. قیزم لیت دیتەوە.. پیاویکی دیکەم خۆش دەوێ.. دەبا لە پیناوی ئەو عیشقەمدا بمرم.

*ئەلیکۆ:* بیدەنگ بە.. ئەم گۆرانییە بیزراوە چییە دەیلییت؟! من حەزم لە گۆرانیی درندانە نییە.

*زەمفیرا:* جا با حەزت لیی نەبیت! چیم لەوە داوە؟.. من گۆرانی بۆ خۆم دەلیم.

(دەست بە گۆرانی وتن دەکاتەوە)

سەرم ببرە.. بمسووتینە.. هیچت پێ نالیم.. ئەی میردە پیرەکەم.. میردە ترسناکەکەم.. تۆ نایناسیت.. ئەوەی من خۆشم دەوێ گەلی لە بەهار گەشترە.. لە خۆرەتاوی هاوین زۆر گەرمترە، ئای چەند شەنگ و دلاوەرە!. ئای چەندە منی خۆش دەوێ! من دلنەرم بووم لەگەلیدا.. هەردووکمان پیکەوە بە قژە سپییەکەی تۆ پیکەنین.

*ئەلیکۆ:* زەمفیرا بیدەنگ بە.. بەسە.

*زەمفیرا:* ئاخریەکەی لە گۆرانییەکەم گەیشتیت؟

*ئەلیکۆ:* تۆ هەقی خۆتە تووڕە بیت؛ چونکە گۆرانییەکە پەیوەندیی بە تۆوە هەیە.

(بە دەم گۆرانی وتنەوە ئەوێ جیدەهیلیت)

*پیرەمیرد:* ئەم گۆرانییەم لە یادە.. لە یادمە، ئەوسا لاویکی بەگور بووم، ئەم گۆرانییە زۆر کەسی دەهینایە جۆش و خرۆش.. لەو ساتانەدا کە مانگ تریفەی خۆی دەبەخشیە ئاسمانی باشوور ئەم سترانە دەوترایەوە.. ئەو رۆژگارانە لە پیدەشتەکانی (کاغول) بووین.. ماریۆلای خۆشەویستم کاتیك لای ئاگرەکەوە بیشکەی منالەکەمانی رادەژەنی ئەم گۆرانییەی دەوت.. بەلێ تابێ رابوردوو لە یادمدا تاریك دەبێ.. بەلام ئەم سترانە وا لە ناخمدا رەگی داکوتاوە کە هەرگیزاو هەرگیز لە یادم ناچیتەوە.

/لە بیدەنگی شەوی کپ و کش و ماتا زەمفیرا وا خەریکە باوکی لە خەو هەلدەسینێ/

*زەمفیرا:* بابە.. بابە سیمای ئەلیکۆ زۆر ترسناکە، گوێ رادیرە.. بە دەم خەوی قورسیەوە دەنالینێ و دەگری.

*پیرەمیرد:* وازی لیبینە.. هیور بەرەوە.. سەرگوزەشتەیەکی رووسیم بیستووە دەلێ: نیوە شەوان میردەزمە سواری سنگی خەوتووان دەبێو هەناسەی سوار دەکات..

پێش کازیوەیش جێی دەهێڵێت.. وەرە لای باوکتەوە دانیشە.

*زەمفیرا:* باوکە.. گوێت لێیە.. ناوی من دێنێ.

*پیرەمێرد:* تەنانەت لە خەویشدا ناتوانێ دەسبەردارت بێ، تۆ لای ئەو لە گشت جیهان بەنرختریت.

*زەمفیرا:* لەم هەموو خۆشەویستیەی بێزار بووم، هەست بە جاڕسی دەکەم، دڵم حەز دەکات ڕەهابێ.. بە ڕاست.. بەڵام تۆ گوێ بگرە.. گوێت لێیە؟ ناوی یەکێکی دی دێنێ.

*پیرەمێرد:* ناوی کێ؟

*زەمفیرا:* گوێت لێیە؟ دەنگی گڕ بووەو جیڕەی دانی دێ.. ئەمە چەند ناخۆشە.. خەبەری دەکەمەوە.

*پیرەمێرد:* نەکەی کچم.. ڕموزنی شەوان دەرمەکە.. خۆی دەڕوات.

*زەمفیرا:* ئەها کەوتە سەر تەنیشت.. وا هەڵسا.. بانگم دەکا خەبەری بووەوە.. دەچم بۆ لای.. تۆ بنوو. خوا حافیز.

*ئەلیکۆ:* لە کوێ بوویت؟

*زەمفیرا:* لای باوکم دانیشتبووم، چ خەونێك هەراسانی کردبووی، تۆ کە دەنوویت ئازار دەچێژیت.. دەمترسینیت.. جیرەی دانت دەهات و بە دەم خەوەوە بانگت دەکردم.

*ئەلیکۆ:* خەونم بە تۆوە دەبینی.. لە خەونمدا لەوە دەچوو نیوانمان.. (قسەکە دەبریت) خەونی ناخۆشم دەبینی.

*زەمفیرا:* باوەڕ بە خەونی فریودەر مەکە.

*ئەلیکۆ:* ها.. نا.. من باوەڕ بە هیچ ناکەم.. نە بە خەون و نە بە قسەی شیرین و نە بە دلیشم.

*پیرەمیرد:* ڕۆڵە تۆ شیتیت! بۆ هیندە پیش دەخۆیتەوە؟ خەلکی لیرە گشت سەربەستن، ئاسمانی ئیرە بیگەردەو ئافرەتەکان هەموو جوان و قەشەنگن.. خەم مەخۆ، مات و مەلوولی دەتکوژێت.

*ئەلیکۆ:* بابە.. زەمفیرا منی خۆش ناویت.

*پیرەمیرد:* هاوریم هیور بە.. زەمفیرا کیژۆلەیەکە هیشتا مندالە.. ئەم خەمانەی تۆش سەرەرۆن.. عیشقی تۆ عیشقیکی بەلەنگاز و بەدبەختە.. دلی ئافرەتیش گەمەبازە.

تۆ سەیرکە مانگی ڕەها لەژێر قوببەی ئاسماندا بە ئارەزووی خۆی دێ و دەچێ و تیدەپەرێ– بێ جیاوازی پرشنگی خۆی بەسەر هەموو سروشتدا پەخش دەکا؛ بەو جوانییە دلرفینەیەوە بچیتە ناو هەر گەوالە هەوریکەوە ڕۆشنی دەکاتەوە، ئەوەتانێ وا دەسبەرداری ئەو هەورە بوو و دەچیتە نیو گەوالە هەوریکی ترەوە و هیندەش لای ئەو نامینیتەوە. کەس دەتوانێ وا لە مانگ بکات لە شوینیکدا سەقامگیر بێ؟ دلی ئافرەتیش وەك مانگ وایە؛ کێ دەتوانێ فەرمان بەسەر دلی ئافرەتیکی لاودا بدات؛ گەر هاتوو شەیدای یەکیك بوو دەبێ هەتا هەتایە پیوەی پابەندبێ؟ کێ دەتوانێ.. کەواتە هیچ گویی مەدەرێ.

*ئەلیکۆ:* ئای چەند منی خۆش دەویست! لەم دەشتە ڕووتە بێدەنگانەداو لە شەوانی ئەنگوستە چاودا کاتێ لە ئامێزی دەگرتم هەستم بە ئارامی دەکرد.. لە ساتێکدا هەموو شتێکی لە بیرم دەبردەوە.. بە ماچ و ڕامووسینە ناسك و شیرینەکانی.. بە گیانی پڕ شادیە منالانەکەی! بەلام ئێستا؟ زەمفیرا ئێستا ئەو وەفاو ئەمەگەی جارانی بۆم نەماوە.. ئێستا ساردو سڕە لەگەلمدا.

*پیرەمێرد:* گوێ بگرە؛ بەسەرهاتێکی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە.. دەمێکی زۆر لەمەوبەر.. کاتێ هێشتا دانووب لە لایەن ستەمکارانەوە داگیر نەکرابوو.. ئەلیکۆ بێگومان ئەمە برینێکی دێرینە بەلام قوولەو بە یادیەوە دەکولێمەوە.. هەنگینێ ئێمە لە تووڕەیی سولتان دەترساین، لە دوندە بەرزەکانی (ئەکرەمان)ەوە پاشایەکی بە زەبروزەنگ فەرمانڕەوایی دەکردین، ئەوسا لاو بووم، خوێنێکی گەرم لە دەمارەکانمدا کەف و کولی بوو، هێشتا تالە موویەکی سپی چیە نەکەوتبووە قژە لوولەکەمەوە.. لەنێو کیژۆلە قشتەکاندا چاوم تەنها یەکێکیانی دەبینی.. کە لێی ڕادەمام وام دەزانی لە خۆر ڕادەمێنم و ئەویش تینی خۆیم پێ دەبەخشێ. بەهەر حال کیژە بوو بە هی من..

ئاخ.. لاوێتیم وەکو تیرە ستێرەیەك تیژ تێپەڕی.. هەروەها خۆشەویستیەکەشم تەنها سالێکی خایاند و هیچی دی.. "ماریۆلا" منی خۆش ویست و بوو بە هاوسەرم، جارێکیان لای ئاوی "کاغول"ەوە کۆمەلێك قەرەجی دی لە نزیك ئێمەوە دەواریان هەلداو بارگەو بنەیان خست.. لای بناری کێوەکەوە.. بە تەنها دوو شەو مانەوە.. سەری سێیەم شەو کۆچیان کرد.. ماریۆلاش لەگەلیاندا ڕۆیو کیژە بچووکەکەی لەگەل خۆیدا برد، لە کازیوەدا کاتێ بە ئاگا هاتمەوە هاوسەرەکەمم نەبینی.. هەموو ئەو ناوەم تەی کرد و دەپارامەوە.. هیچ ئاسەواریکیم بەدی نەکرد، کە گویم لە گریانی بەکولی زەمفیرا بوو منیش دامە پرمەی گریان.. ئیدی لەو ڕۆژەوە لە گشت ئافرەتانی ئەم سەرزەمینە وەرسم، لەنیو هەموو کیژۆلەکانی ئەم گیتیەدا چاوانم نەیانتوانی هاوسەریکی دی هەلبژیرن، ئیدی نەمتوانی ڕۆژانی وشك و برنگم لەگەل ئافرەتیکی تردا بەش بکەم.

*ئەلیکۆ:* ئەی چۆن شوین ئەو ئافرەتە بێ ئەمەگە نەکەوتیت؟ چۆن نەچوویت تا خەنجەریك ڕۆبچینیتە دلییەوە وەك ئەوەی بە دلی درندەیەکدا دەیچەقینیت؟

*پیرەمیرد:* بۆچی؟ عیشق بالندەیەکی ئازادە! چ هیزیك دەتوانیت عیشقی ئافرەتیك کۆت بکات؟ ئەو ئەڤینەی ئەمرۆ بە من و تۆ دەبەخشرێ سبەینێ بە یەکیکی دی دەدرێ.

*ئەلیکۆ:* نەخیر.. من وا نیم.. من دەسبەرداری مافی خۆم نابم! یان هیچ نەبێ تۆلەی خۆم ئەستاندەوە.. نەخیر.. گەر لەنیو دوری دەریاشدا دوژمنی خۆم بە

نوســـتوویی ببینمـــەوە.. ســـویند بـــێ کەموسکەیەك بەزەییم پیا نەیەتەوە.. گەرچی نووستبێ و بەرگریش نەکات؛ بێ دوودلی توور هەلی دەدەمە بنی دەریاوەو ئەوسا بە دلیکی خۆشەوە قاقا بە ترس و لەرزەکەی پیدەکەنم.

★ ★ ★

*کورە لاویکی قەرەج:* ماچیکی دی.. تەنها ماچیك.

*زەمفیرا:* درەنگە دەبێ بڕۆم.. میردەکەم دلی پیسە.

*کورە لاو:* بە تەنها ماچیکی دی.. بەلام دەبێ ماچیکی دریژ بیت چونکە ماچی مالئاواییە.

*زەمفیرا:* مالئاوا.. بەرلەوەی پەیدا بیت.

*کورە لاو:* پیم بلێ.. ژوانی داهاتوومان کەی بیت؟

*زەمفیرا:* ئەمشەو کە مانگ هەلهات، لەوێ.. لە پشت ئەو گردەوە.. لای گۆڕەکەوە..

کورە لاو: درۆ دەکەیت.. نایەیت!

*زەمفیرا:* وا هات.. رابکە.. دیم خۆشەویستم.

★ ★ ★

/ئەلیکۆ نوستبوو؛ ببووە نیچیری کۆمەلێ خەونی ترسناك، ئەوەتانێ بە دەم هاوارەوە لەو تاریکیەدا بیدار بووەوە؛ کە دەستی بۆ جیگەی زەمفیرا دریژ کرد جگە لە پیخەفیکی ساردو سر هەستی بە هیچی دی نەکرد، هاوسەرەکەی لەوێ نییە.. لەپڕ لە جیگا راپەری و گوییەکانی شل کرد.. دنیا کش و ماتە.. ترسا.. ئاگرو بەفر بە دەمارەکانیدا دەجمێ.. وا هەلساو رەشمالی جیهیشت.. دنیا کپە.. پیدەشت خاموش. شەو شەویکی ئەنگوستە چاوەو تەم بەری ئاسمانی گرتووەو مانگ وەکو پەلەیەکی بچووك خۆی دەنوینێ، ئەستیرەکان بێ جریوەن.. دردۆنگن..، بەم تەمە شوین پییەکان بە دژواری دەبینرین.. هەرچۆنیك بێ ئەلیکۆیان گەیاندە گردە دوورەکان.. لە هەژمەتا ئارام و ئۆقرەی لی هەلگیراوەو بە دووی شوین پییە شوومەکاندا دەروات/.

/وا تروسکایی کیلی گۆڕیکی بەدی کرد کە وا لە قەراغی ریگاکە، ئەوەندە ختوورە بە دلیدا دیت هیزی ئەژنۆی شکاوە؛ لیوەکانی هەلئەلەرزن.. ئەژنۆکانی ناسرەون.. لە ناکاوا.. یان لەوانەیە خەون بیت؟ لە پریکا چاوی بە دوو تارمایی دەکەوێ کە زۆر دوور نین، هەردووکیان لەسەر گلکۆکەن.. گوێی لەو چرپەو سرتەیانە/.

*دەنگی ١-:* (کاتی ئەوە هاتووە بڕۆم.

*دەنگی ٢-؟:* چاوەری کە.

*دەنگی ١ -* (:خۆشەویستم دەبێ بڕۆم..

*دەنگی ٢-؟* : نا.. نا.. دەبا تا سپیدە پیکەوەبین.

*دەنگی ١ - (:* کات درەنگە.

*دەنگی ٢ – ؟:* با عیشقت عیشقیکی پرکیش بێ.. ساتیکی دی..

*دەنگی ١ –* (: تۆ شەکەتم دەکەیت.

*دەنگی ٢ –* (: هەر ساتیك.

*دەنگی ١ –* (: دەزانیت گەر میردەکەم خەبەری بیتەوەو بزانیت لەوێ نەماوم؟

*ئەلیکۆ:* ئەوەتانێ خەبەرم بووەتەوە.. بۆ کوێ؟ هەردووکتان بوەستن! کن ئەم گۆرە بۆ هەردووکتان شوینیکی خۆشە.

*زەمفیرا:* راکە خۆشەویستم.. راکە.

*ئەلیکۆ:* چاوەری بکە.. بۆ کوێ ئەی لاوی شۆخ و شەنگ؟ دە ئینجا بکەوە سەرزەوی!

(چەقۆیەك لە سنگی دەچەقینێ)

*زەمفیرا:* ئەلیکۆ!

کورە قەرەجەکە: وا دەمرم..

*زەمفیرا:* ئەلیکۆ! دەیکوژیت.. تەماشاکە.. خوینی لی دەچۆرێ.. ئۆ.. چیت کرد؟!

*ئەلیکۆ:* هیچ، دەبرۆ ئیستا شیت و شەیدای بە.

*زەمفیرا:* نا.. وا هەست نەکەی لیت دەترسم.. من لە هەرەشەو گورەشەت ناترسم و نەفرەت لە تاوانەکەت دەکەم.

*ئەلیکۆ:* کەواتە تۆش بمرە.. (سەری دەبریت)

*زەمفیرا:* بە عاشقی دەمرم.

* * *

*اسپیدەیەو ئاسمان خەریکە روون بیتەوەو خۆر هەلبێ، لە پشت گردەکەوە ئەلیکۆ لەسەر گلکۆی گۆر دانیشتووە، لەشی شەلالی خوینەو چەقۆکەی بەدەستەوەیە، دوو لاشە لەبەردەمیدا کەوتوون.. روخساری ئەم بکوژە ترسناکە. قەرەجەکان دەورو خولیان داون.. هەموو شلەژاوو پەشۆکاون، گۆریکیان لەولاوە لیداوە، ئافرەتەکان بە خەمناکی لە ریزیکدا وەستاون و یەکە یەکە دینە پیشێ و پیلوەکانی ئەو دوو قوربانییە ماچ دەکەن. لەم خاکە سارییە ماتەدا پیرە سەیری تەرمەکان دەکات.. وا دوو لاشەکەیان هەلگرت و بە ئامیزی ساردی خاکی دەسپیرن، ئەلیکۆش لە دوورەوە لەم شتانە رادەمینێ، دوای ئەوەی خۆل بەسەر مردووەکاندا کرا، هیدی هیدی ئەلیکۆ لەسەر گلکۆکە هاتە خوارێ و خۆی بەسەر گژوگیاکەدا دا.. هەنگینێ کابرای پیرەمیرد لیی نزیك بووەوەو پێی گوت:

*پیرەمیرد:* ئەی کابرای لەخۆبایی بوو برۆ جیمان بیلە! ئیمە خەلکیکی ساکار و سەرەتایین، هیچ یاسایەکمان لا نییە، ئازاری کەس نادەین و کەس ناکوژین، پیویستمان بە خوین و نالە نال نییە؛ بەلام ئیمە لەگەڵ پیاوکوژاندا هەل ناکەین. تۆ بۆ ئەم ژیانە سەرەتاییەی ئیمە نەخولقاویت، تۆ سەربەستیت تەنها بۆ خۆت دەوێ. دەنگی تۆیش بە گویی ئیمە ترسناکە، دل و دەروونی ئیمە پاك و بیگەردە، تۆش دلپیسیت.. کەواتە جیمان بیلە.. بمانبەخشەو خوا ئاگای لیت بیت.

* * *

/بەم جۆرە ئاخاوت.. قەرەجەکان کەوتنەوە ژاوەژاو: دەیانەوێ دۆڵی شەوە ترسناکەکە جێ بهێلن و کۆچ بکەن.. ئەوەندەی نەبرد لەو دەشتە پان و بەرینەدا لە چاو ون بوون.. هیچ ئاسەواریکیان نەما؛ تەنها گالیسکەیەك نەبیت کە بە کلیمیکی شر داپۆشرابوو، لە دەشتە خوینینەکەدا جیما بوو: بەم جۆرە.. جاری وایە بەر لە زستان و لە تەم و مژی چیشتەنگاودا کاتێ پۆلی مراوپی کیویلە لە درەنگە کۆچدا بە قیژە قیژ رووەو باشوور لە شەقەی بال دەدەن، یەکیکیان بە خەمبارییەوە دوا دەکەوێ و بالە برینداره‌کەی شۆر دەبیتەوە؛ چونکە گوللەیەکی کوشندە پیکاویەتی.

وا شەو داهات، لە گالیسکە تاریکەکەشدا و لەژیر ساپیتەی بەرزەوەبوویدا تاکو رۆژ بۆوە نە دەستیك هەبوو مۆمیك دابگیرسینێ و نە چاویك هەبوو ببیتە میوانی خەونە رەنگاورەنگەکان/.

*کۆتایی:*

بەم جۆرە هیزە ئەفسووناویەکەی شیعر کۆمەلی تارمایی رابووردوویەکی پرشنگدار یا رەش و خەم ئامیز لەم یادە تەماویەمدا دەبووژینیتەوە. لەو ناوچەو دەڤەرانەدا، کاتێ هیشتا ئاگری جەنگ بە بلیسە بوو لە باشوور سنوورمان دانابوو، هیشتا هەلۆ دوو سەرە دیرینەکەمان سەربەرز بوو، منیش لە پیدەشتەکاندا لە نزیك پاسگەکانەوە گالیسکەی قەرەجەکانم دەبینی.. ئەو قەرەجانەی نەوەی ئازادی و هەژارین. من گەلی جار شوین هەندیکیان دەکەوتم و لەگەلیاندا ژەمە نانە هەژارەکەیانم دەخوارد یان تا وەنەوز دایدەگرتم لەبەردەم کوانووی ئاگرەکەیاندا دەمامەوە، ئای چەند عاشقی ئەو گۆرانیانەیان بووم کە لە کاتێ کۆچ و باردا دەیانچری، زۆر جاریش ناوی ماریۆلای ناسك کەوتووەتە سەر زمانم.

بەلأم تەنانەت ئیوەیش بەختەوەر نین ئەی رۆلە بەسزمانەکانی ئەم سروشتە، لەژیر سایەی رەشماڵە شرەکانتاندا کۆمەلیك خەونی ئازاراوی نەش و نما دەکات، ساپیتە کۆچەرەکانیشتان دووچاری وشك و برنگی و بەلەنگازی بوون، ئیمە هەر ئاوەهاین.. روو لە هەر کوییەك بکەین کۆمەلیك ئارەزوو هەن کە تەفرو توونامان دەکەن و کۆمەلیك چارەنووسی رەشیش هەن کە چاوەریمانن.

## سەرچاوە

لە ژمارە (١)ی گۆڤاری (الثقافة الاجنبية)وە وەرگیرراوە، سالی ١٩٨٠، شاعیری عیراقی "حسب الشيخ جعفر" کردوویە بە عەرەبی.

# سێ کورتە هۆنراوەی "ڕافایێل ئالبێرتی"*

▪ لە ئیسپانیەوە: حەمەی ئەحمەد ڕەسوڵ

-١-

## لاوانەوە

کیژۆڵە گچکە گوڵ ئاساکە
لەسەر تەنورەکەی دانیشتوە
چەشنی گوڵێ لە ئەتلەسێکی کراوەدا
چۆنی ئەبینم..!؟
لە هەیوانەکەمەوە(**) بەرەو گەشتێ
وەدەرئەکەوێ.. پەنجەکانی
کەشـــتیەکی ســـپی نێـــو دورگـــەکانی
کەناریا(***)یەو
ڕوەو دەریای ڕەش وەدەریا کەوتن..
چۆنی ئەبینم..!؟
لە هەیوانەکەمدا، لە هەوارەکەمدا ئەمرێ
کیژۆڵە گچکە گوڵ ئاساکە
لەسەر تەنورەکەی دانیشتوە
چەشنی گوڵێ لە ئەتلەسێکی داخراودا..
هەورە خوێن لێچۆڕاوەکان،
بەسەر دەریای ئێوارەوە ئەکشێن و
دورگـــەی ســـوری لـــە خوێـــن چێبـــوو
دەرئەهاوێژن..

-٢-

## کورتە لێدوانێکی پایزیی

ئۆو، چەند درەنگە!!
بۆوەی گەشتێ بە فڕۆکە بکەین
تا بەنێو هەوا بفڕین..
دەی خێراکە، ئەی ئازیزم
بەڵام تۆ دڵەکەم
چی لە بارەی فڕینەوە ئەزانی..!؟
هیچ ئازیزەکەم..!
شنەی با یاری بە پەپولەکەو
وەنەوشەی کراسەکەت ئەکرد..
کە بۆ من مێلۆدی سترانێك بوو..
ئۆو، چەند دڕەنگە..

بۆوەی گەشتێ بە فڕۆکە بکەین..
تا بە نێو هەوادا بفڕین..!

-٣-

## بڵێ بەڵێ

ئەی هاودەمی دەریاوانم
پێم بڵێ؛ بەڵێ
پێم بڵێ؛ کە پێویستە -با- ببینم
کە من پێویستە لەنێو -با- دا
تۆم خۆشبووێ..!
ئەی دەریاوان،
پێم بڵێ؛ بەڵێ
پێم بڵێ؛ بەڵێ
ئەی هاودەمی من
پێم بڵێ، پێم بڵێ، بەڵێ..!
لە دەریای هەڵکشاودا منت وەبیر بێتەوە
ئەی هاوڕێ..
لە دەریای بەرزو بڵندا منت بیر نەچێتەوە
کاتێ تۆ ئەڕۆیت و ئیدی ناگەڕێیتەوە..!!
ئەی هاوڕێم، منت بیرنەچێتەوە
ئەودەمەی گەردەلول هەڵدەکاو
لە چارۆکەدا ڕمێك دائەچەقێنێ
ئەودەمەی تەلەگرافی بێتەل،
لێڵ و شێواوە، کەس لێی تێناگا
ئەودەمەی شەپۆل؛
هەڵکشان و داکشانی دەریا هەڵئەلوشێ..!
ئەودەمەی تۆ لە بنی دەریادا،
بە سرپی و بە سرەوتی ئەمێنیتەوە..!!

## پەراوێز

* ڕافاییل ئالیبێرتی لە ساڵی ١٨٩٩داو لە شاری پویێرتۆ سانتاماریا سەر بە هەرێمی ئاندەلوس-ی باشوری ئیسپانیادا، چاوی بۆ شیعر و دڵناسکی و دەردو مەینەتی تاراوگەی ژیان هەڵێناوە.. سەرەتای خولیای ئەم گەورە هۆنەرە، بۆ هونەری وێنەسازی ئەگەڕێتەوەو بە شێوەکاری دەستی پێکردوە. بەڵام یەکەم نۆبەرە هۆنراوەی لە تەمەنی هەڤدە ساڵیدا نوسیوەو بە کاریگەری ئەو چرکەساتەی کە باوکی ماڵئاوایی لە ئالبێرتی و ژیان کرد.. هەتاکو یەکەم نامیلکەی شیعریی خۆشی لە بیستەکانی تەمەنیدا چاپ و بڵاودەکاتەوە، هەر خولیا دێرینەکەی- وێنەسازی دونیای فلچەو ڕەنگ - هەر هاودەم و هاوژینی بوو..

سەرەتای ناسین و وەدەرکەوتنی لە ساڵی ١٩٢٧ەوە سەرچاوە دەگرێو، لەو کۆڕە فراوانەدا کە بۆ چلەی ماتەمینی شاعیری ئیسپانی گۆنگۆرا سازدرابوو، ئیدی لەو دەمەوە بە تەواوی خۆی بۆ جیهانی هۆنراوە تەرخان کردو بە نەوەی -بیستو حەوتەمی ئەدەبی ئیسپانی و ئەمریکای لاتینی لە قەڵەم دەدرێ.. لەگەڵ هەڵایسانی شەڕو کوشتاری ناوخۆی سەردەمی فرانکۆی دیکتاتۆردا دەبوایە ئالبێرتی بە گەشتێکی دورو درێژی دەم تاراوگەدا.. وڵاتەکەی و بیرەوەری مناڵی و ئەندێشەکانی و ئەوینی بەجێبێڵێ.. ئاتیانا-ی کچی زۆر لە دڵا شیرینی ڕافاییل، لە کوباو لە ساڵی ١٩٩٨دا تێکڕاو سەرجەمی هۆنراوەکانی لە دووتوێی کتێبێکی گەورەدا بە نێوی "ئەوین و

فریشتە" چاپ و بڵاودەكاتەوە، كە یەكێكە لە شاكارە جیهانیەكان و -بە داخەوە تەنها بۆ زمانی كوردی وەرنەگێڕدراوە-" ئێمەش جارجارە هەوڵدەدەین هۆنراوە ناسكەكانی ئەم هۆنەرە مەزنەو/ زۆر لە نوسەرەكانی دیكەی بە زمانی ئیسپانی دەنوسن بكەینە كوردی.

**هەیوان، لە دەقە شیعریەكەدا -باڵۆن-ە.

***كەناریا بریتیە لە سێ دورگەی زۆر ناودار و قەشەنگی ئیسپانی كە دەكەونە بەرامبەر وڵاتی -مەغریب-ەوە لە ئۆقیانوسی ئەتلەسیدا.

## سەرچاوە

*Rafae'l Alberti, El amory angel, Habana, Madrid, 1998.*



# بڵاوکراوەی نوێ






# له ئەدەبی گەلانەوە

- قەرەج                                        ئەلێکساندەر پوشکین
- سێ کورتە هۆنراوەی "رافاییل ئالبێرتی"

# گفتوگۆ لەگەڵ ه. گ. گادامیردا

-سەبارەت کایرۆس و خۆشنوودیی لەحزە-

▪ لە ئەلمانیەوە: بەکر عەلی

*بیرند شتاپیرت:* لە ئەزموونی مرۆییدا هەمیشە شتیك هەیە كە بە وشە گوزارەی لیناكریت بەلكو دروستتر بە وشەی ریكەوت و گونجان و تەبایی و هەماهەنگی لەحزە تۆمار دەكریت، وە ئەو دەركپیكردنەی وەها تۆماردەكریت دەبیتە حەزیكی فاوستیانەی پرۆمیتۆسی بۆ "مانەوە". كە ئەمە زۆر جار بە كایرۆس *Kairos* ناوبراوە.

*هانز گیئۆرگ گادامیر:* بەلێ، بەلێ.. خودی ئەم شتەیە كە هەمیشە بەسەر دەچیت. هەلبەت ئەمە لە ئەزموونە بەراییەكانی كاتە، كەوا ئەم خۆشنوودی لەحزەیە سروش بە شتیكی لەو جۆرە دەبەخشیت. دواجاریش لە هەموو پەیوەندیەكی مرۆییدا توخم و ئیلەمینتیك هەیە، من خۆم لەو باوەڕەدام، كە لە پەیوەندیە پتەوە عەقڵانیەكانی كۆمەلگادا ئەرك و فەرمانیكی گەورە لە توانای وەئاگاهینانەوە بۆ بیستنی ئەم لەحزەیە پیكدەهینیت. من حەزدەكەم ئەمە لەگەڵ كانتدا ناوبنیم هیزی (بەهرە)ی حوكمدان - *Urteiliskraft*- كە بە مرۆڤ ناسەلمینریت و ناكریت و ناچەسپینریت.


گادامیر

*شتاپیرت:* وا دەردەكەویت ئەم لەحزەی كایرۆسە تەواو بەردەوام بیت، وە بە تەنیا "پیشتر" و "پاشتر" وای لیدەكەن كایرۆس وەكو ئەوەی كە هەیە دووبارە ببیتەوە بە لەحزەی بەردەوامی.

*گادامێر:* بەڵێ، کە بشمانەوێت بە بیرکردنەوەیەکی تێگەیەنراوەوە ڕووەوپێش بچین ئەوا دەستبەجێ ڕووبەڕووی ئەو گرفتاریە دەبینەوە، کەوا "لەحزە"، بەوپێیەی گریکەکان بیریان لێدەکردەوە، لە ڕاستیدا نیە، چونکە "ئەو" هەمیشە بەسەردەچێت، گەر مرۆ بخوازێت "لەحزە" وەکو "بریتیە لە.." ئاماژە پێبدات. ئەمە گرفتە دژوارەکەیە لە بیرۆکەی "کات چیە؟"دا. ئەو لەحزەیەی کە ئێمە زۆربەی جار بە "کات" تێی دەگەین، کەچی لە ڕاستیدا ئەو تێدەپەڕێت و چیدی لەوێدا نامێنێتەوە. لە ڕاستیشدا دروست لەم کێشەیەدایە بیری خۆرئاوا بە شێوەیەکی تەواو تایبەتمەند هەوی کردوە.

*شتاپێرت:* ئەم بیرەی خۆرئاوا کە هەڵبەت مەرجێك بوە بۆ لەحزەی دووبارە تۆمارکردنەوەی چەمکی -کایرۆس- لە سەدەی ٢٠دا، وەکو ئەزموونێکی وجودیانە پاش جەنگی جیهانی یەکەم لە فۆرمگەلێکی زۆرداو هەروەهاش لای ئێکسپریسیۆنیزم "گوزارەگەری- تەعبیریەت" گوزارشتی لێکراوە. بەڵام بەر لە هەر شت وا هەست دەکەین کەوا لە لایەن تیۆلۆگەکانەوە زۆر بە هەند وەرگیرابوو، لەوانە کارل بارت و تۆرینسن، بەڵام بێگومان بەر لە هەموویان لەلایەن پاول تیلیش، کە ئەم لەم ڕووەوە زۆر ئاشکرایانە خۆی ڕاگەیاندوە.

*گادامێر:* کایرۆس هێمای ئەو بوو. تەنانەت هایدیگەری لاو لە هەمان ئەو کاتەدا گوزارەی کایرۆلۆگی داهێنابوو، کە ئەم هەمیشە بە توندی و هەندێك جاریش سەختگیرانە لەگەڵیدا مامەڵەی دەکرد، بەڵام کاتێك دواتر تیلیش هێندە کاری بە کایرۆس کرد ئیدی ئەم گوزارەیە لە فەرهەنگی هایدیگەردا بزر دەبێت. هەڵبەت دیارە کێشەکە وا مایەوەو لە میانەی "لەحزە"وە بەکارهێنرا، دروستتر بڵێین لە میانەی گوزارەی کیرکیگاردیەوە. واتە وەك چۆن بە شێوەیەکی گشتی ئێوە وەسفی ئەو دووبارە تۆمارکردنەوەیەی کایرۆس دەکەن، لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەمداو پاشتریش وێکچوویەکی لەناو ڕەخنەی کیرکیگاردو لای ئیدیالیزمی ئەڵمانی و لای هیگڵیش هەبوو. وە دواهەمین نووسینی کیرکیگارد بریتیە لە "لەحزە" ئەمە زۆر بە مانای وشەکە وەرگیراوەو بە ئاشکراش لە بیری هایدیگەردا دەردەکەوێت، کاتێك دەڵێت: لەحزە بریتیە لەو تەماشایەی کە بە شێوەیەك لە شێوەکان لەحزەیەك دەکاتەوە.

ئەمەش بە شێوەیەکی زۆر تەسکئامێزانە پابەندە لەسەر ئەوەی کەوا ئێمە لێرەدا سەبارەت "ئێستا" یەك نادوێین کەوا لەبەرئەوەی بەسەردەچێت ئەوا ئیدی بە مانایەکی تر شوناساندنی خۆی لە کیس دەدات، بەڵکو دوراییەك والا دەکاتەوە، کە وەکو ئەو خۆی دەکەوێتە ناو جەوهەری تەماشاکردنەوە. ئەمەش کتومت ئەوەیە کە ئێوە بە گونجان و بە "پیتداری" ناوزەدی دەکەن: هەروەها لەحزەی بەپیتیش بریتیە لە گوزارەیەکی ناسراو. دیارە ئەمەش بریتیە لەو هۆکارەی، بۆچی چەمکی کایرۆس کە بە تەنیا هەندێك جار لای گریکەکان دەرکەوتوەو

ئەوساش جارێکی دی لەئامێز گیراوەتەوە، کە گریکەکان هێشتا نەکەوتبوونە ژێر فشاری چەسپاندن و پیشاندانەوە.

*شتاپێرت:* دیارە ئەم چەمکە کە کیرکیگارد دایمەزراند، لە ڕێی کەڵەکەبوونەوە جارێکی تر مانا تایبەتەکەی وەرگرتەوە، بەوجۆرەی کە تیلیش لە میانەی مێژوویەکی دروستەوە تۆماری کردوە: لێرەدا سەرەتاو کۆتایی دانرا، وە ئەو کایرۆسەی لە "ئینجیلی نوێ"دا بوە ناوەندی دەرکەوتنی مەسیح، ئێستا وەکو "پێشتر ئاگادارکردنەوەیەک" بوە بە ڕۆژی دوایی "ڕۆژی قیامەت" و بوە بە شتەکانی داهاتوو و بە کۆتایی دنیا.

*گادامیر:* بەڵێ، بێگومان. بەڵام بەو ڕاستکردنەوەوە کە وا بە تایبەت و لە دواجاردا مەسیحیەتی پرۆتێستانتی لەوەوە پەیدا بوە، بەوپێیەی لەحزە بریتیە لە ئەمەو لە هەموو لەحزەیەک، واتا لەحزەی باوەڕو لەحزەی نا-باوەڕ. بە مانای لە چاوەڕوانی ئەوەدا نا کە پابەندبێت بەو شتەوەی دێت، بەڵکو بەو شتەوەی لە هەر لەحزەیەکدا خۆی دەسەپێنێت. ئیدی هەر لەم ڕێیەوە ئەم چەمکە وجودیانەی "سەپاندن/ چەسپاندن" هێندە توند ڕێزی لێگیراو هەروەها چەمکی کایرۆسیش لە بنەڕەتدا وەکو شتێکی لێهات کە هەموو لەحزەیەک شیاوە ببێت.

لە تیۆلۆگی "بولتمان"دا ئەمە ڕۆڵێکی تەواو توند دەبینێت. من سەبارەت منالی خۆم ئەوەم دێتەوە یاد کە لە ماڵباوانێکی سروشتناسدا پێگەیوم و سەبارەت کەنیسەش بایەخێکی ئەوتۆمان نەبوو، بەڵام لە وانەی پەروەردەی ئاینیدا لە قۆناغی دواناوەندیدا مامۆستایەکمان هەبوو کە لەگەڵیدا ئینجیلی نوێمان بە گریکی دەخوێندەوەو ئێمەش زۆرجار سافیلکانە دەمانگوت: بەڵێ، هەڵبەت ئەمە ڕووداوی ئایندەیە، دواهەمین دادگاو هەستانەوەی دوایی. ئەویش دەیگوتەوە: ئەدی ئەمە لە کوێدایە؟ دەمانگوت: لە ئینجیلی نوێدا. کەواتە ئێوە سبەینێ لە بەهەشتدا لەگەڵ مندا دەبن، لەبەرئەوەی ئەمڕۆ باوەڕتان هێناوە. کەواتە ئەم بەهای لەحزەیە کە دەشتوانین لە چەمکی درەنگوەختی دواڕۆژ ناسیدا *eschatologie*-- دایماڵین. ئیشاتۆلۆگیش لە تیۆلۆگی پرۆتێستانتیدا ئەمڕۆ بە مانای: لەحزەی باوەڕهێنان دێت. لە یادمە قەشەکەمان هەمیشە بایەخی دەدا بە ئامۆژگاریدان: بەڕێزی باوەڕدار، یارمەتی بێباوەڕەکان بدە! ئەمەش زۆر لۆتەریانە بوو.

*شتاپێرت:* هەردەم و هەرگیز، ئەو چەقبەستنە لەسەر باوەڕپێهێنانی ئێستاو - هیچ کاتێکی تر نا.. دەبێت.

*گادامیر:* تەواوە، من مەبەستم ئەمە بوو.

*شتاپێرت:* ئەمەش لەو برگەیەی تۆماسی قەشەدا گەلێك ڕوون بوو، هەروەها ئەوەش کە دواتر پاول تیلیش لە بیستەکاندا هەوڵیدا لەسەر مێژووی لەحزە گردی بکاتەوە.

*گادامیر:* ڕاستە، ئەوەشی لە شیلینگەوە دۆزیبووەوە.

*شتاپێرت:* ئەو پرسیارەی لێرەدا لە دووفاقێتی چەمکی کایرۆس لە سەدەی ٢٠دا دەکرێت بریتیە لە پرسیاری؛ چۆن دنیای

ئینجیلی نوێو گریکی، بە شێوەیەکی تر واتە دنیای جولەکەیی و مەسیحی، بەیەکدا دەکەون، هەروەها پرسیاری ئەمڕۆ مرۆڤ چۆن مامەڵە بە ئەزموونی پوچەڵکردنەوەی کات فڕێدان بۆ ناو کات خۆی -کە من بە زمانێکی وجودیانە- ناوی دەهێنم - دەکات؟

*گادامیر:* ئێستا ئەوە لە دنیای مۆدێرندا پرسیاری هەرە گەورەی ژیانی ئاینیمانە. ئێمە هەموو مرۆگەلی ڕۆشنگەرین و هەر لەوێشەوە هۆشیاریمان لەوەدا هەمیشە زیادی کردوە کە وا سنورەکانی خودی ڕۆشنگەری خۆی لە مرۆڤدا شیاوی تێگەیشتن دەبێت.

ئەمەش پەیوەستە بەوەی کەوا ئێمە هەموو بەلای کەمەوە -هەر لەکاتی ڕۆمانتیکی ئەڵمانیەوە- شتێك لە بارەی ئەم گرفتەوە دەزانین، کە چۆن مرۆ لە دنیای زانستداو لە شارەزایەتی ئەزمونەکەی لە ڕێی پێوانـدن و کێشاندن و ژماردنەوە بایەخ بە ئەزمونێکی تر سەبارەت بە "ڕاستەقینە" دەدات. لە ڕاستیدا ئەمە واتایەکی تەواو چەسپاوی هەیە کە چۆن مرۆ لە دنیای زانستی مۆدێرندا خۆی لە ئەزموونی ڕاستەقینەی مرۆییدا دەبینێتەوە. هەڵبەت ئێمە هەموو ئەمانە بە زۆری لە میانەی پێکدادانی هەردو ئەو توخمەی مرۆیی بوونمانەوە دەناسین کە لەناو زانستی پزیشکیدایە، وەکو چۆن لەوێدا زانست دواجار چارەسەری دۆخێك ناکات بەڵکو چارەسەری مرۆیەك دەکات کە ئەو لە بنەڕەتدا ناتوانێت. من پێم وایە، زانستی پزیشکی بۆ ئەم گرفتە ڕەنگە زەقترین ئەزموونی گرژی بێت کە هەموو نەخۆشێك دەناسێت: من جارێکیان ناچار بووم بچم بۆ خەستەخانەیەك، کە زۆر مۆدێرن بوو، یەکەمین شت لەوێ بە من درا ژمارە بوو، ئیدی ناوم لەبیرکرا.

*شتاپێرت:* بەڵام ئێوە خۆتان لەیاد نەکرد!

*گادامیر:* بێگومان! لەوکاتەشداو لە ناکاوێکدا مرۆ وەئاگا دێتەوە کاتێك دەبینێت وەك حاڵەتی دەزگایەك تەماشا دەکرێت نەك وەك کەسێکی تر. من لەگەڵ ڤیکتۆر ڤۆن ڤایزێکەردا زۆر دۆست بووم، ئەو لە هایدلبێرگیش دۆستایەتی لەگەڵ بوبەرو کەسانی دیدا هەبوو، ئەم تێڕوانینەی پەیوەندی "من-تۆ" لە ژیانی پزیشکایەتیدا زۆر بە زەقی دەرکەوتوە، کە ئەمەش پەیوەستە بە گرفتەکەی ئێمەوە.

*شتاپێرت:* هەڵبەت من پێم وایە لەم نمونە کەسیە تایبەتیانەدا بایەخی ئەو سەلماندنەی نیوتن و کانت لەم پرۆسەی دەرکپێکردنەی کاتدا بینیان ئاشکرا دەبێت، بەڵام لەو ڕونکردنەوەیەی دواترتانەوە هەنگاوتان تەنیا ڕوەو هەستپێکردنی کات ناوە.

*گادامیر:* ئەوە میراتی شارستانیەتی خۆرئاوایە کە هەرگیز دەستپێکە گریکیەکان بەجێناهێڵێت. لای ئەرستۆتێلیس فێری ئەمە دەبین: کات بریتیە لە ژماردنی جوڵەکان. واتە هەر پێوانەکردنی کات خۆیەتی کە لای ئەرستۆتێلیس چەمکی کات دیاریدەکات. بەڵام لە فیزیکی نیوتنیشدا ئەمە دەخرێتە بنەمایەکی تەواو جیاوازەوە، کە تیایدا بەس پەیوەندیەکانی ئیشکردن هەیەو چیدی بوونەوەر لە جووڵەکەیدا نیە، بەڵکو ئەوەی هەیە بریتیە لە جوڵە وەك جوڵەو بەس. بەڵام

ئەمانەش بریتین لەو شتگەلە قورسانەی کە ئێمە هێشتا تاقیکردنەوەیان تێدا دەکەین و هێشتاش ڕۆڵێکی زۆر گەورە دەبینن. من هەمیشە ئەوە بە نمونە دەهێنمەوە کە چۆن لە ڕاستیدا هەموو مرۆیەك لە مەتەڵی کاتدا زۆر هەرەمەکیانە لە جێیەکدا -کە ئەمەش مەسەلەی تێگەیشتنێکی باڵا نیە- دەشێت ببێتە جێی بیرکردنەوە. بە نمونە؛ لەبەرئەوەی غەمی گەورەی ئەم هەسارەیە لەگەڵ پەیدابوونی گەردووندایە، ئەوا مرۆڤە سادەکان هێشتا هەر دەپرسنەوە: ئەدی پێشتر چی هەبوو؟ ئەوسا ئەوگوستین ئەم پرسیارەی کردو دواتر لۆتەر *Luther* وەڵامێکی جوانی دایەوە: ئایا دروست یەزدان بەر لە خولقاندن چی دەکرد؟ وەڵامەکەی دەزانن؟ لۆتەر دەڵێت: ئەو لە دارستاندا بوو و لە دار شۆڕەبییەکان شوڵکێکی داتاشی بوو بۆ پیاکێشانی ئەو کەسەی پرسیاری لەو جۆرە بکات. مەبەستی ئەو لەم وەڵامەدا بەلای منەوە زۆر ساکارە، ئەو دەخوازێت کتومت بڵێت: ئێوە نابێت لە فزول و حەزێکی پووچەوە پرسیاری وەها بکەن، ئێوە دەبێت بیر لە شتی تر بکەنەوە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە جگە لە پرسیاری بێ مانای لەو جۆرە هیچی ترمان پێناکرێت.

لەم نزیکانەدا کتێبێکی زۆرخۆش دەرکەوت کە ئەمە پیشانی کەسانی ناشارەزا دەدات، بە ناوی "مێژوویەکی کورتی کات". ئەوە چۆن ڕوویدا کە وا کات هەبێت؟ سەرەتا لە ڕێی تیۆری تەقینەوە گەورەکەوە *Urknal*-- لەم میانەوە شتێك ڕوویدا: تیۆرەکە وەهایەو ئێمەش وەك کەسانی بیرمەند -کە ئەرستۆتێلیسیش هەروەها دەبینی- دەڵێین: بەڵێ وایە، بەڵام ئێمە پرس لە ئەودیوی ئەو لەحزەیەوە دەکەین. بەو جۆرەش نیە کە ئێوە پێم دەڵێن، سەرەتا لەوێدا کات هەبوو.

*شتاپێرت:* وەکو هۆکینگ "ستیڤن هۆکینگ خاوەنی کتێبی ناوبراو -وەرگێڕ-" هەولێدا ئەوە پیشان بدات کە وا ڕەنگە پیناسەکردنی کات بە هیچ جۆریك شیاو نەبیت بەبێ ئەو دەرك پیکردنەی کات کە وا مرۆ پیکیهیناوە.

*گادامیر:* هەروەها ئەرستۆتیلیسیش ئەمەی دەبینی، ئەم بەردەوام بیرکردنەوە ناکۆتایەی، کە خۆمانین و، لە هەموو ناکۆتا دارییەکیشماندایە.

*شتاپیرت:* ئایا ئەوەش مەرجیکی پیویست نیە وەکو بلیین دەستوریك بۆ ڕەفتاری مرۆڤ لەناو کاتدا دابمەزریت: گەر لەحزەی میژوویی وەکو ئیستایەکی -وەهاو وەکو هەرگیز -وەهای تر نا- بە زەقی دیاری بکریت، ئەوەشی لەناو کاتدا دەشیت روویدات، ئەوسا وا پیویست دەکات ئەم دەروازە گەمەئامیزیە بۆ ڕەفتاریکی تایبەتمەندو بۆ ئەزموونکردنی کاتیش جۆرە ڕەفتاریکی ئاکاریانە بەرانبەر کایرۆس بهینیتە کایەوە.

*گادامیر:* لیرەدا دەشیت مرۆ بپرسیت داخۆ شتە مرۆییە دروستەکە دەکەویتە کویوە؟ ئەوسا گەمە بەوپییەی بریتیە لە گەمە لەناو سروشتداو بەبێ مرۆڤیش هەر هەیە. با بیر لە گەمەی ئەو میشانە بکەینەوە کە لە هاویناندا دەردەکەون، یان تەنانەت لای بەچکە ئاژەل یاخود لای هەر ئاژەلیك بیت، دەبینین ئەم

خۆشـیەی گەمـە مانایـەکی بـۆ کـات هەیـە ئەگـەرچی مـرۆڤ تاکـە بوونـەوەری زینـدوە. ئەرستۆتێلیس وەهای گوتوەو ئەمەش هـەمان ئەو شتەیە کە ئێوە مەبەستتانە. مانا بۆ کات هـەبوون واتـە شـوێنی خاڵیمـان بـۆ داهـاتوو هـەبێت کـە بـە جۆرێـك لـە جۆرەکـان پـڕی دەکەینـەوە. هەڵوێستەکردن یـاخود دروسـتتر بڵێـین پەرچـەکرداری ڕاسـتەوخۆیانە لەگـەڵ ئاژەڵـەکاندا کـە بـە شـڵەژان و ترسـەوە بـە ڕوویـاندا بچینـەوە لای مـرۆ ئەمـە بریتیـە لـە کـردار. واتـە ئێمـە بـەم شـێوەیە یـان ئـەویدی دەتوانین هەڵوێستە بکەین و هەموو شتێکیش دەخەینـە بـەر ئـەم ئەرکـە بەردەوامـە بـۆ هەڵبژاردنی باشترین شت.

کـانت جـارێك گوتویـەتی: گـەر سروشـت لەگەڵ ئیمە چ مەبەستیکی نەبوایە بـەوەی لـە ڕیـی ژیانـەوە ئیمـە خۆشـحال بکـات، ئـەوا پیدەچوو هەلە بکەوتایەتەوە. بەوپییەش کەوا ئیمـە هـەلدەبژیرین ئـەوا دەشـیت هەلـە هـەلبژیرین، دەشـیت ئیمـە بـە جۆریـك هەلـەو چەواشە بین کە دواتر وەکو یادەوەری و وەکو پەشـیمانی و ڕەخنـە لـەخۆگرتن.. و هتـد هـەلمانبگریت. کەواتـە ئـەم هـەموو گرفتـە باوانـەی مـرۆڤ جیادەکەنـەوە پابـەندن بـەو خانەخالییەوە *Freiraum* کە لە ڕیی هەلبژاردنی ئامـانجی دروسـتەوەو لـە ڕیـی هۆکـاری دروستەوە بۆ ئامانجی دروست پردەکریتەوە.

*شـتاپیرت:* گـەر چەمکـە هیگلیەکـەش وەرگرین ئەوا کایرۆس لە فرەداریتی خۆیداو لە یەکیك لە ماناکانیدا بریتیـە لـە پیوەریکـی دروستی حەزی چەپینراو.

*گادامیر:* زۆر ڕاستە. مەسەلەکە سەبارەت ئەوەیـە، کـە بریتیـە لـە حـەزیکی چـەپینراو. ئەمەش پیوەرە دروستەکەیە: ئیوە جاریك ئەو گوزارەیـەتان لەگـەڵ منـدا باسـکردوە، منیـش دەخوازم بەوەوە گریی بدەمەوە، چونکە لیرەدا ئەوە پیشان دەدریت کە پیویستە ئیمـە لـە چ چەمکیکی جیاوازی پیوەر *Mass* رابمینین کـە بریـتی نییـە لـەو پیـوەرەی ئیمـە پیوانـەی پیدەکـەین، ئـەو پیـوەرەی شـتیکی پـی بـەرەو کۆتـایی و بنـبر دەبـەین، بـەلکو بریتیـە لـە پیوەریـك کـە وا بوونـەوەر خـۆی هەیـەتی: گریکـەکان جیاوازیـان دەکـرد لـە نیـوان "مـەترۆن" و "مـەتریۆن"دا کـە دروسـت ئـەو هـارمۆنی و پیـوەرە ناوەکیـە دەگریتـەوە کـە خودی شت خۆی هەیـەتی. تیگـەی دروسـتی "هەقیقەت"یش لەوەدا نیە کە وا ئیمە بەپیی بنـەمای زانسـتە پیوانەییـەکانمان مامەلـەیان پیبکـەین، بـەلکو لەوەشـدایە کـەوا ئیمـە دروستییەکەی ئەو بناسین، ئـەو دروسـتییەی ئیمە دەجولینیت، منالیك کە چ مانایـەکی بـۆ کـات پـی نیـە لـە ڕیـی تاکـە ڕاستییەکی لـەو جۆرەوە والا دەبیتەوە. لەم لەحزەیەدا کە ئیمە خۆمان لەناو هەبوونە پر غەم و گیچەلەکەماندا پیویسـت دەکـات بـە بـەردەوامی و چالاکانـە بخەینەکار.

*شتاپیرت:* من دەخـوازم لـە کۆنتیکسـتی "ڕەوتی" ئەو وەسفەی بۆ منالبوون کردتان بە هەردوو شیوازی تیۆلۆگیانەو پراگماتیکیانـەی پـەتی بلیـم: ئایـا هـەبوونی کرانـەوە ئـەوە دەگەیـەنیت کـە کـایرۆس بـە شـتە ڕەهاکـان دابنیت.

*گادامێر:* بەوجۆرەیە کە ئیمە دەگەریین بۆ دەرك پیکردنـی ئـەم ئەزموونـە. بـەلی بـەو جۆرەیە!

*شتاپیرت:* شتیکی تریش لەتـەك ئـەوەدا هەیـە، کـە ئەرسـتۆتیلیس زۆرجـار راستەوخۆیانەو بە کورتی گوتویـەتی/ ئـەویش بریتیە لە "هووس دای *Hoos dei*" واتە "ئـەوە چۆن دەبیستریت".

*گادامێر:* ئەمـە کوتومـت پنتـی ئیتیکـی "ئاکارناسی" ئەو دیاری دەکـات، کـە تـاوەکو ئیسـتاش بـە بـەردەوامی راسـیۆنالیزمی بـە زانستبووی مۆدیرنە دەخاتە گومانەوە، لەوەدا کە هەرگیز ئەو راست پیمان نالیت ئەو دروست چی دەگەیەنیت. "هوس دای *Hoos dei*" بە مانا وشـەییەکەی بریتیـە لـە: "ئـەوە چـۆن دەبیـت" یـاخود "پیویسـتە ئـەوە چـۆن بیـت". ئەرستۆتیلیس بە پیکەنینەوە هەلویستە لەسەر ئەوە دەکات، "هووس دای" دەبیت لە راستیدا چۆن بیت. ئەوسا وەسفی ئەوە دەکات، ئـەوە بریتیە لە چی، پاشان هەستیك یاخود زانینیك بـۆ ئـەو چەمکـە پـەیدا دەبیـت، کـەوا "ئـەوە چۆنە" بریتی نیە لە زانستیش. ئەمەش ئـەو گوزارەیەیە کە لە کارەکـانی منیشـدا رۆلیکـی ناوەندی گەمـە دەکات، کە لـە راستیدا هـەر لـە سـەرەتاوە هایدیگـەر فیری ئەمـەی کردم، واتـە گـوزارەی "فرۆنیسـیس- *Phronesis*" کـە وشـەیەکی گریکیـەو دەکریـت بـە "ژیرایـەتی- *Vernunftigkeit*" وەری بگیرم، بەلام ژیرایەتییەك کـە نـەك هـەر باشـترین هۆکـار بـۆ ئامانجـە گەمژەلـەکان بدۆزیتـەوە بـەلکو ژیرایـەتییـەکیش کە بەشداری دانانی ئامانجە ژیرەکانیش بکات.

بەمەش ئیمە بیگومان لە خالیکی بریاردەردا بە هـەبوونی مرۆییمـان دەگـەین. فەلسـەفەی ئەمرۆش بە بەردەوامی لە لایەن ئەو کۆششەوە هاوەلایـەتی دەکریـت، ئـەوەی ئیمـە لـە ریـی زانسـتەوە رای دەپـەرینین، هـەروەها ئەوەشـی هەمیشـە زمانییانـە لای هایدیگـەری لاو دەردەکەویت و ئەوەشی لای بولتمان، کە ئیوە ناوتان هینا، ناودەبریت بە مامەلە پینەکردنی باوەر. ئەمەش لە راستیدا چەمکیکی ستۆیکی "رواقـی"یـە، دروسـتتر بلیـین، چەمکیکـە کـە لەگەل زانستی مۆدیرندا پەیوەندییەکی چاکی هەبوو. بەلام لـە راستیدا ئەمـەش بەندە لەسـەر ئەوەی کەوا ئەمە بریتیـە لـە تاکانـەیی ئیرادەی مۆدیرنە. ئەمەش هیدی هیدی فیری ئـەوەمان دەکات چاکتر بیربکەینـەوە، بەم پییـەش ئیـدی ئەو مانایـەکی زۆرترمـان بـۆ دەپـاریزیت، نـەك هـەر بـۆ ئیمـە بـەلکو بـۆ هـەموو کایـە کولتوریەکانی دنیا. پزیشکەکان خۆیان دەلین، بـەلی ئیمـە دەتوانـین بەسـەر ئـەم نەخۆشـیەدا زالبین. ئایا ئیدی لەویدا چ دەروازەیەکی والای دنیا شك دەبـەین؟ لە راستیدا ئـەو دەروازەیـە شك دەبەین کە کولتوری ئیمـەی لـە پلەیـەکی بالادا لە چوارچیوە گرتوە. لە هـەمان کاتیشدا چاومان لەوەیە کەوا ئەمە هەموو شتیك نیـە. لـەم تیمایەشـدا راسـتەوخۆ نـەتوانینی مامەلـەپیکردنی کاتمـان بـۆ دەردەکـەویت، بـە نمونـە لـە لـەدایکبوون و لـە مـەرگدا لـەو شـتانەدا کـە ئیمـە نـاتوانین بیانکـەین و لـە بـەردەمیاندا ئومیـدی ئـەوە دەکـەین کـە پاشمـاوەی عەقلانیـەتیکی گشـتی بپـاریزریت لـە بـەد بـەکارهینانی

جینتـــەکنیکدا -ئـــەندازەی بۆمـــاوەزانی- *Geutrchnik*-.

***شـــتاپیرت:*** ئیـــوە زۆرجـــار لـــە نوسـینەکانتاندا چـەمکی بناغـەیی "نۆئـین- *Noein*"ی گریکیتـان بـە "نـاوەوە- یـاخود هەناو- *Innesein*" وەرگیراوە، ئەمەش هاوشانە بـە بـەریکردنی بـەردەوامیتی -فرۆنیسـیس- *Phronesis*- لـــــەناو "ســـــۆفرۆزینە- *Sophrosyne*"دا، زانینـــــی زانینیـــــش وەك شتزانینیکی پەتی ری دەکات، واتـە مـن خـۆم دەخەمە ناو کاتەوە، بـەلکو لـە راسـتیدا خـۆم لەناو کاتدا چەق دەبەسـتمە سـەر "ئیسـتا" و "چ کاتیکی تر" نا.

***گادامیر:*** بەلی، دواجار کە ناچار بووم بۆ ئەوەی بە مەبەستە گرنگەکـە بگـەم، گـوزارەی "نـاوەوە" دابنیـم، راستییەکەشـی ئەوەیـە، گریکەکانیش هەستیان بەوە دەکردو ئیمـەش لـە هـەموو هەسـت کردنیکـدا ئـەوەمان هەیـە کاتیك دەلیین؛ من هەست بە شتیك دەکەم. ئایا هـەموو هەسـتیك بریـتی نیـە لـە جۆریـك لـە هەناوی یەکگرتوو، بە نمونە "ئازار"؟

من هەست بە شتیك دەکەم، بەلام "ئازار" شتە گشتییەکەیە کە ئیمە بە تەواوی ناتوانین شـوینگەکەی دیـاری بکـەین. کـاتیك پزیشـك دەپرسیت: ئازارەکە ئا لەویدایە؟ بەلی ئازارەکە لەویدایـە. بـەلام راسـتییەکەی ئەوەیـە ئیمـە ئازارمـان دیت، واتـە مـن ئیشـم دیـت نـەك ئـەو جیگەیـە. لەبەرئـەوە مـن لـەو بـاوەڕەدام کـە "ناوەوە بوون- *Innesein*" هـاو وشـەیەکی زۆر گونجاوە، هەروەها بە برانەوەی ئەوەی کە ئیمە وەدووی کـــەوتووین، ئـــەوا ئیمـــە نـــابیت دەسـتبەجیٚ هەلپـە بکـەین بـەلکو سـەرەتا بـە تەواوی گویرادیرین، ئەوەشی من لیرەدا گویی بـۆ رائـەدیرم، پیـی دەبمـە "هـەناو"؟ لـەو بـاوەرەدام لـە رووی زمانیشـەوە هەروەهایـە، کەوا وشـەی گریکـی "نـوس- *nus*" پـەیوەندی هەیە بە بۆنکردنی مەترسیەوە لە کاتی هاتنی درندەیـەکدا کـە لـە لوتـەوە *Nase* دیـت، واتـە "نـاوەوە *nus* و لـوت *Nase*" پەیوەسـتن بـە یەکدییەوە.

***شتاپیرت:*** پاشان کایرۆس وەکو ئەزموون دەبیت..

***گادامـیر:*** ئـەوەش بریتیـە لـە فۆرمیکـی هەلکشاو.

***شـــتاپیرت:*** کـە شوناسـی "بـوون" و "ناوەوەبوون" پیشاندەدات.

***گادامـیر:*** ئەگـەرچی حەزدەکـەم بلیـم، لـە راسـتیدا کـایرۆس بریتیـە لـەوەی ئیمـە لـە تەماشـاکردنەوەدا سـوپاسمەندیانە سـەرنجی دەدەیـن: ئـەوە کاتیکی خـۆش و گفتوگۆیـەکی چاك بـوو. ئەوەشـی خـۆی بـۆ گفتوگۆیـەکی چـاك ئامـادە بکـات، ئـەوە کـاریکی هەلـە دەکـات. خۆشـی لـەحزەو هـی کـایرۆس وا دەکات.

***شـتاپیرت:*** پاشـان رەنگـە ئـەم ئاسـۆی ئەزموونە جاریك بۆ "پیوانە" و جاریکی تریش بـۆ ئـەم چەمکـە گریکیـە "*maden agan*- هیـچ شتیك زۆرنیە" بیت.

***گادامیر:*** بە دلنیایی! گەر ئیمە لە خۆمان بپرسین، داخۆ ئەمرۆ لە دنیای گریکیدا هەست بـە چ شـتیکی هەنووکـەیی دەکـەین، مـن ئـەم فۆرمەلە تەواو بنبرکەرەی دەدەمیٚ: لای گریك

چ وشەیەك بۆ "خواست– *Wille*" نییە، بەلكو هەموو گەلیك گوزارەی شیاوی بۆ ئەوە هەیە، وەك سووربوون لەسەر شتیك، یاخود خۆویستن، بەڵام ئەوەنا كە ئیمە ئەمرۆ لە دنیای هاوچەرخداو لە زانستی مۆدیرندا بە خواستی كویر ناودەبریت. لە سەدەی ١٨دا ئیدی ئەوە لای شۆپنهاوەر تەواو دەبیت و: لەمەودوا دەبیتە ئیرادەی كویر، رەوتی سروشت، نەست، پالهیز و شتگەلیكی لەمجۆرە. شتەكە بەو جۆرەیە كە دەشیت ئیمە شتیك لە گریكەكانەوە سەبارەت مەزنی یەكلایەنی شارستانیەتی ئیرادە فیربین، كە ئەوروپا ئەمەی هەلكشاندوەو هەلبریوە و ئەمرۆكەش ئیمە لە پیشدەم ئەو ئەركە مرۆڤانەیەدا راوەستاوین كە ئەو هاوسەنگی شیواندنەی رۆژ بە رۆژ زۆرتر دەردەكەویت، لەو دۆخەوە هاوسەنگ و هاوتا بكەینەوە. ئەمە ئەو ئەركەیە كە لە پیشدەمی هەموو فەرهەنگ و كولتورەكانی دنیادا راوەستاوە، بە تایبەت ئەو ولاّتانەی لە رووی ئابورییەوە بە دواكەوتوو ناودەبرین. من لە هەندیك لەو ولاّتانەدا بووم، بە راستیش ئەمە زۆر شیاوی پرسیاركردنە كاتیك ئیمە شارستانیەتەكەمان بۆ ناو شارستانیەت و شیوە ژیانە داخراوەكانی دنیا دەنیرینە دەرەوە. من جاریكیان لە ئەفریكای باشوور لە زانكۆیەكی رەشدا وانەم بە پیاوانی دارستانی دەوتەوە، كە هەمیشەش بەرەو مالەوەیان دەبردمەوە، لە ریگادا دەمبینی منالاّن كە لە قوتابخانەكانەوە بەرەلڵا دەكران چ ئازادییەكیان تیا بەدی دەكرا.

ئەوان و خویندكارەكانی منیش دەبوو فیری زمانی ئینگلیزی بن، لەبەرئەوەی منیش بە ئینگلیزی وانەم دەدایەوە، هەروەها ئەمریكاییەكانیش ئەوسا هەر بە ئینگلیزی دەدوان.

*شتاپیرت:* گەر ئیمە هیندە لە كولتورەكان قوولبینەوە، ئیدی نەك هەر لە سەرسامی بەس دەبین بەلكو هەروەهاش لە سنورەكانی ئەو خەیالپلاّویانەی دروستی دەكەین: گەر ئیمە ئەوە ببینین، كام كتیب سروشتی ئەم مرۆڤە بوە ئەوسا دەتوانین كام ئاماژەی دیرین لەو كولتورانەدا هەیە بیانبینین.

*گادامەر:* ئەی ئاسنگەریك چی پی دەكریت؟ من لە هەموو ئەو ئەزموونانەوە فیری ئەوە بووم چەند پیویستە ئیمە وریابین، ئیستاش لە هەندیك حالەتی زەقی كەمدا، لەوانە كە سەبارەت ئەلمانەكان و ئاسیاییەكانی خۆرهەلاّتی ئەوروپابن ئیستا لەم لەحزەیەدا وەكو كیلگەیەكی گەورەی مەتەلئامیز لە پیشدەمماندان: ئیمە دەبیت چەندیك وریابین تاوەكو لەویدا هەروا بە سانایی كۆلۆنیالیزمیكی هەلە نەكەینە كارگەیەك.

بیگومان ئیمە تەنیا لە ریی خۆ دیاریكردنیكی ژیرانەوە دەتوانین بۆ خۆمان شتیك فیربین. من هەمیشەش لە چاوەروانی ئەوەدا بووم كەوا لەو خالەشدا كایرۆسیك لە چاوەروانی ئیمەدایە: پیویستە لە كویدا ئیمە شت فیربین، بیگومان لەویدا كە دەتوانین یارمەتی بدەین و یارمەتی بدریین، گەر ئابووری ئەلمانیش كەمیك دەرفەتی ئەوەی

هەبێت کەوا ڕادەی ژیانی هاووڵاتیانی بەشە خۆرهەڵاتیەکەی ئەڵمانیا بەرزبکاتەوە؛ ئەوا ئەوە بە ئەرکێکی حەکیمانە پێوان دەکرێت.

*شتایپرت:* کەواتە گەر کات بچێتە ناو خۆیەوە ئەوا پێویستی بەو جۆرە گوزارانەیە کە پتر فرەشێوەن *Pluriform*.

*گادامیر:* بەڵێ، من لەو باوەڕەدام چونکە هەبوونی فرە زمانێتی لە جیهاندا خێرو بەرەکەتە.

*شتایپرت:* دەخوازم بگەڕێمەوە سەر ناوهێنانێکی کورت کە ئێوە پێش کەمێك لە ڕەوتی تێگەی "کات"دا باستان کرد، کات پێواندن و کایرۆس هێنان کە بە تایبەت سەبارەت کۆتایی ژیانی مرۆگەل و، سەبارەت مەرگ دەدوان، هەروەهاش دەخوازم ئەم باسکردنە پەیوەست بکەمەوە بە ڕستەیەکی ئالکمایۆنی کرۆتۆن *Alkmaion von Kroton* کە ئێوە لەنوسینەکانتاندا گەلێك جار دەیهێننەوە: مرۆگەل دەبێت بمرن، چونکە فێری ئەوە نەبوون کە "کۆتایی" و "سەرەتا" پێکەوە ببەستنەوە.

*گادامیر:* ئێوە بەم وەرگێڕانە ئەوەم دەهێننەوە یاد کاتێك من سەبارەت ئەمە لەگەڵ هایدیگەردا نامەیەکم دەگۆڕییەوە، کە ئەو نکوڵی لەوە دەکرد، چونکە ئەمە بە گریکی واتا "دیناستای– *dynasthai*" کە بە مانای "فێرنەبوون" نایەت، بەڵکو بە مانای "ناتوانن" دێت، چونکە ئەوان "ناتوانن". پێشم وایە من توانیبێتم باوەڕ بەو بهێنم کەوا وەرگێڕانەکەی من دروستە. خۆ ئەگەر پزیشکێك ئەوە لە ڕستەیەکدا دابڕێژێتەوە، ئەوا بە نیگا کردنێکەوە دەڵێت؛ پێویستە ئێمە هەوڵ بدەین فێری ئەوە بین کە "سەرەتا" و "کۆتایی" پێکەوە بەستینەوە. شتێکیش لە سروشتدا کارابێت ئەوا لە مرۆڤیشدا هەروا دەبێت: بە نمونە، ئەو ئەزمونە مرۆییەی کەوا منداڵێتی هەمیشە لە پیربووندا خۆی نزیك دەخاتەوە، ئەوەیە کە خودی یادەوەری خۆی لە ناکاودا بۆ کۆنترین ئەزمونی منالی وەئاگا دێتەوە.

من لە "برێسلاو" پێگەییوم و پێش ماوەیەکیش چوومەوە ئەوێ، ئەوێش بۆ ئەو خەڵکە پۆڵۆنیەی لەوێدا دەژیان گران بوو، چونکە هەر ئەوەندەم پێدەکرا کە ناوی ئەو شەقامە ئەڵمانییەیان پێبڵێم کە ئەوان شارەزای نەبوون. یاخود لە مەسەلەیەکی تردا، کاتێك کتێبێك دەخوێنمەوەو لە پڕێکدا دەبینم ناوی شەقامەکانی کاتی منالی زووم لا وەئاگا دێتەوە. بەم شێوەیە شتێك لەناو ڕێکخستنی دەرونیماندا بە سەرەتاوە دەبەستێتەوە، هەڵبەت ئەمەش بریتیە لە مەرجێکی بنەڕەتییانەی قبوڵکردنی مەرگی دواکۆتایی. هەرچۆنێك بێت من هەوڵدەدەم بەم جۆرە کەمێك پتر بیر لەم ڕستەیە بکەمەوە، هایدیگەریش لەگەڵمدا تەبابوو: کە ڕەنگە مەسەلەکە لەوەدا بێت کە بۆچی من وەهای وەردەگێڕم. شتێکی دیاریشە کەوا فۆرمێکی نەخشە بناغەییەکەی ئەزموونی کات دەکەوێتە ئەوێوە. گەر ئێمە بخوازین ئەوە بزانین ئەوا لە کاتژمێردا ئەوە دەبینین کە چۆن ئەو لەگەڵ کاتدا هەیە. ئیدی کاتژمێر چیە؟ ئەو شتەیە کە هەمیشەو بە بەردەوامی "کۆتایی" بە "سەرەتا"وە دەبەستێتەوە، واتە

جوڵانەوەیەکی بازنەییە. ئیدی بەم شێوەیە هەموو شتێک لە ژیانماندا لەلایەن جوولە دووبارەبوەکانەوە سەرلەنوێ زاڵ دەبێتەوەو بەرێ دەکرێتەوە. ئێمە هەموومان ریتمی بیداری و خەوتوویی دەناسین. بە لای منەوە ئەمە سەر بە ئەرکی گەورەی بیرکردنەوەیە، وەك چۆن گریکەکان بیریان بۆ ئەوە چووبوو، کە خوداوەند بیدارەو ناخەوێت. بیداریش شتێکە لە جییەکدا وەکو موعجیزە و پەرتوویەکە. ئێمە کەسی نوستوو دەبینین، ئێمە سەبارەت مردوان دەدوێین، کاتێك کە دووبارە وەئاگا نەیەنەوە. خەوتن- مردن تەواو لە یەکتریەوە نزیکن. هیراکلیت وەها سەبارەت ئەوە دواوە. بە هەمان شێوە لەگەڵ شتگەلێکی تریشدا وەهایە وەك: هەناسەدان، ئەو هەناسە گۆڕینەی "پاول سیلان"ی شاعیر لە بارەیەوە دواوە. ئەو لەحزە سەیرو تایبەتەی کە تیایدا "هەناسەدان" خۆی دەگۆڕێت و دەبێت بە "هەناسەدانەوە".

بەم جۆرە دەشێت لە هەموو لایەك ئەم سیما بناغەییەی "ریتم" ببینرێت، کە ئێمە وەك زیندەوەران خۆمان خستوتە ناویەوەو رەنگەش هەموو پێکهێنانێکی راستیش لەوەدا بێت، یاخود لە هەموو ئەو شتانەدا بێت کە ئێمە لە جیهان و لە ئەزموونەوە وەریاندەگرین، ئەم بەیەکەوە بەستنەوە ریتمییەش ناکرێت لە یاد بکرێت. پێکهێنان، من هەمیشە باسی لێوە دەکەم، لەبەرئەوەی: پێکهێنان ئەوە نییە کە مرۆ شتێك پێکبهێنێت، بەڵکو ئەو شتەیە کە شتێك بۆ خۆی پێکدەهێنێت.

ئێمە سەبارەت خولقێك یاخود شێوەیەك دەدوێین، بە لاتینی سەبارەت شێوە پێکهێنانی دیمەنێك، دیمەنێکی چیایی یاخود لەوجۆرە. ئەمانە هەموویان خولقێنراون، واتە شتگەلێکن کە لە داخراویتی خۆیانداو لە پێوەری خۆیاندا دەردەکەون. بەلای منەوە خولق گوتەزایەکی بنەماییە بۆ چەمکی هونەر، هەروەك چۆن ئێوە لە کارەکانی مندا شارەزای ئەوەن.

*شتاپیرت:* هەروەك چۆن وەها بوەو هەر لە پێش هەزاران سالەوە لە دەقە گریکیەکاندا کایرۆس بەستراوەتەوە بە "جوانی- *Kalon*"ەوە.

*گادامیر:* بەلێ، لە میانەی ئەوەی کە "کالۆن- *Kalon*" مانایەکی رامیاری- کۆمەڵایەتی گەلێك فراوانی هەیە. مەبەستم لەوەیە کە "کالۆن- جوانی" بریتیە لەوەی کە مرۆ دەکرێت لێوەی ببینرێت. هەروەها "ئایشۆس- *aischos*" واتە "بەرانبەر" و "ناشیرینی"، بریتیە لەو شتەی کە مرۆ لێوەی خۆی لە تەماشاکەران دوورەپەریز دەکات. بەلای گریکەکانەوە "جوانی" هەمیشە بوارێکی ئاشکراو کراوە بوە. ئەمەش سیمایەکی گرنگی هەناوی کولتوری رۆحییانەی خۆرئاوایە کە نابێت لەیاد بکرێت. بەوپێیەشی کە روە سیاسییەکەش زۆر قول لەناو شێوە ئەزمونی ژیانماندا و هەروەها لەناو قسەکردنەکانیشماندا رەگی داکوتاوە: ئەوا وەك دەزانین ئێمە بۆ تاکە شتێك زمانێك شك نابەین، بەڵکو تەنیا یەك زمان هەیە کە لەگەڵ یەکتریدا قسەی پێدەکەین. ئێمە لەبەردەم مەترسی لەیادکردنی هەموو ئەمانەداین،

لەوكاتەدا گەر تەماشای ئەوە بكەین كە ئێمە چۆن دەتوانین بە هاوكێشەكان و بە ئامرازە تەكنیكیەكان ئاڵوویر بكەین و شت ساز بكەین.

ئەمانە هەموو دەخرێنە ناو چوارچێوەی ئەركی ژیانێكی تەواو گەورەترەوە، كە هەریەكەو لە ژیانی خۆیدا بەجێی گەیاندوە. ئەوەشی چەمكی "پێكهێنان و خوڵقاندن" دەكاتە چەمكی جیاوازی چینەكان ئەوە بە هیچ جۆرێك لەوە تێنەگەیشتوە كە پێكهێنان و سازدان چی دەگەیەنێت.

*شتاپێرت:* لە هەنووكەدا، وەك ئەم چركە بەختەوەرمەندە، كە بە شێوەیەكی پێویستی دۆزینەوەو ئاشكراكردن هەیە - دواجار پێكهێنان هەر ناوەڕۆكێكیشی هەبێت بەڵام هەمیشە وەك بیبەشبوون دەردەكەویت.

*گادامیر:* هیگل جاریكیان گوتویەتی: مرۆڤی پیكهینراو "فیركراوی فیكری و روناكبیری" ئەو كەسەیە كە دەتوانیت ببیتە هاوریی بیرۆكەكانی كەسانی دی: واتە ئەو كەسەی كە دەتوانیت خودئەوینی و نارسیزمی خۆی تیپەرینیت. واتە كاتیك كەسانی تر دەخوازن شتیك بلیین ئەم بەوپەری تیگەیشتنەوە گویرادەدیریت. لۆگیكیش شتیكی كەمیك نەزۆكانەیە ئەگەرچی ئامرازیكی زۆر گرنگیش بیت كە مرۆ لیوەی بۆ یەكتر دەدوین. نمونەیەكی زۆر گەورەش هەیە بۆ ئەو شتەی ناودەبریت بە نالۆگیكی ئافرەتان، ئەوەش دروست نیە كەوا ئەو ناكەویتە هیچ شتیكی ترەوە، بەوپییەی ئەوانە زۆر لۆگیكین، چونكە ئەو گوێبیستی هیچ شتیك نابیت. ئەم كاریكاتۆرانەی كە بە شیوەیەكی گشتی راست نین، بەلكو راستتر ئەوەیە ئیمە بەلگەو ئەرگومینت بەكاردەهینین -وەك لە ئەوینداری و لە شەری ژن و میردایەتیداو لە شتی لەو جۆرەدا- هەندیك جار وشەی ئەوتۆ بەكاردەهینین كە چ پەیوەندیەكی بە لۆگیكەوە *Logik* نیە، بەلام بۆ ئەوەش لۆگیكیكی تەواو قول دەكەویتە پشتەوەی.

*شتاپیرت:* ئەو كەسەشی زۆر لۆگیكی دەربكەویت دواتر هەموو ئەسپەكانی ویژدانە ئارامەكەی سرك دەردەچن.

*گادامیر:* بەلێ، بەلی بەو جۆرەیە.

*شتاپیرت:* گەر زمان لە پال ئەم لادانەدا یاخود ئەم رونكردنەوە پیویستانەدا، دواجار دەشیت ئەوانەشی لەویدا بن بەو جۆرە پەنهان بمیننەوە، كەوا ئەوان تەنیا دەشین دووبارە بنووسرینەوە، وەك لە سەرەتادا وتمان، كە ئەم لەحزە خۆشنوودییەو ئەم پیوانە دروستە كە لەم لەحزەیەدان، ئایا ئیمە دەتوانین مەرگیش بە كایرۆسیك دابنیین؟

*گادامیر:* بیگومان، دواجار ئەوە ئەركیكی مرۆییەو مرۆش زۆرجار هەست بەوە دەكات: وەك ئەو شتە بەناوبانگەی گویتە "روونـاكی پتر" یاخود ئەو شتانەی كە بریتین لە دواهەمین وشە. ئەوەش شتیكی سەرسورهینەرە وەكو چۆن بەلای كەمەوە لەناو ئەفسانەی دواهەمین وشەدا وەلامیك بۆ پرسیارەكە دەخریتە روو، ئەوا جۆریك لە كورتكردنەوەو قبولكردن دەكەویتە ناو دواهەمین وشەكانەوە. رەنگەش تەواوی

پیكهاتــەی ئەفســانەیی كــە دوا وشــەی ئــەم ئەزموونـە بنەرەتیـە مرۆییـە دیـاری دەكاتــەوە، كـەوا مـرۆڤ پیشـتر ئـەوانی تـری وەك قسـەكەر ناسیوەو ئیستاش بە هەمیشەیی بیدەنگ بوە. لەبەرئەوەشـــی "دوا وشـــە" لـــە هـــەموو شتەكانی تر پتر دەگریتەوە ئەوا ئەو بریتیـە لـە كایرۆس.

*شتاپیرت:* رەنگە بۆ ئەوەش بیت كەوا ئەم دوا ئامــانج ئاراســتەكردنەی *Alkmaion* ئــەوە بیت: سەرەتاو كۆتایی پیكەوە ببەستیتەوە.

*گادامیر:* رەنگە وابیت، مـن زۆر بـیرم لـەو وشـەیە كردۆتـەوە، كـە بـەر لـە هـەر شـت ئـەوە دەخاتـەروو كە سروشت بـە بـەردەوامی خـۆی نوێ دەكاتەوەو بەم پییەش ئیدی چ كۆتاییەك نیـە. جۆرەكــان و رەگــەزەكان و گیانــەوەران.. هتــــــد، هــــــەروەها وردە زینـــــــدەوەران *Microlebewesen*، بریتین لە تەواوكردنیكی نویی ئــەو ئەزموونــە بنەرەتییــەی هــەموو كەســیك دەیكات. وەك چۆن هـەبوونی سروشت هـەموو یەكیك لە مەرگدا كۆدەكاتەوە، ئاوەهاش رەنگە لەحزەیـەكی گونجـاوی وەهـا هـەبیت بۆ بـەلی– گوتن. من لەوە بیئاگام.

رۆشــتن روەو مــەرگ، كــە شــتیرنبیرگەر لەلایــەن خۆیــەوە رەخنــەی تونــدی لــەم گوزارەیەی هایدیگەر دەگرت، ئەگەرچی كەمیك بە كورتـی تیگەیـەنراوە، بـەلام هـەرچۆنیك بیـت بـە تـەواوی هەسـت بـەوە دەكریـت كـە رۆشـتن بـەرەو مـردن هەمیشـە وەك پالهیزو هـاندەریكی پیویسـتی مـردن دەمینیتـەوە. مـن لـە كـاریكی بچووكدا یـادی ئـەو چیرۆكـەم كەوتـەوە، رەنگـە ئیــوەش بیتــەوە یادتــان، كەلــە منــالیمدا سـەرنجیكی گـەورەی لا چـێ كردبـووم، كـاتیك كەسیك بەهـەر هۆیـەك و بەهـەر شـیوازیك بیـت دەخریتـە مالیكەوە كـە تیایدا هـەموو روناكیـە زیندەگیەكانی مرۆ دادەگیرسینریت و دەچیتـە لای ئـەو ریبــەرەی ریبــەری ئــەوێ دەكــات و دەپرسیت: ئەی روناكییەكەی من كوانێ؟ ئیدی رەنگـە هـەمووی بكوژینیتــەوەو بەكاربـهینریت: ئەم هەموو ئەزموونەی روناكیو كوژاندنەوە كە بەرجەسـتەی روناكـی ژیـان دەكـەن.. بـە راسـتی چـیرۆكیكی پرواتایـە كــە رەنگدانــەوەی ئــەو خیرو بەرەكەتەیـە كـەوا ئیمـە سـاتی مـەرگمان پینـــازانین. گریكـــەكان ئەمـــەیان بـــەناوی پرۆمیتۆســـەوە بەســـتوەتەوە، خــودای دیــوە خوداییەكان، كە وەكو بە ناوەكەیدا دیارە، بە پیشـبینییەكانی دەناسـریتەوە، لەبەرئەوەشـە ئــەو وەكــو دۆزەرەوەی هــەموو هونــەرەكان سـەروەر دەكریـت. ئـەو ئاگرهینـەرە، ئـاگریش بریتیــە لــە ســەرەكیترین بەدیــهینراوەكانی مـرۆڤ. لیرەوەیـە مـرۆ بەسـەر ئـاگردا زالــەو توانـای ئـاگر هەلگیرساندنی هەیـە، ئیـدی بـەم جــۆرە مــرۆ شـــتیكی دەســـتدەكەویت كـــە زیندەوەرانـی تـر نیانـە. لەبەرئەوەشـە لـە رووی ئاسایشـەوە بەرانبـەر ئاژەلـە درندەكـان گرنگـتر بـــوو وەك لـــە گـــەرمی بەخشـــین، هـــەروەها وەرچــەرخانیكیش بــوو بــۆ كولانــدن؛ لیڤــی شـتراوس كـاری لـەو نیوەنـدەدا كـردوە. شـتی گرنــگ بریتیــە لــەو چــەكی بەرگرییـــەی كـــە ئیســـتاش ئەمەیـــە؛ پرۆمیتیـــۆس: شـــتی پەسەندی گەورەی ناو دراماكەی ئەسخیلۆس چیـە؟ ئـەو بـە شـیوەیەكی گەمژەلانـە مرۆڤـی لـە ژیــاندا تەمبــەل و گۆشــەگیر كــردوە، تــاوەكو

پیشـبینی سـاتەوەختی مردنیـان بزانـن، ئـەم زانینەی لی سەندوینەتەوەو دواتر ئاگرو هەموو هونـەریکی تـری پـێ بەخشـیون. ئایـا ئـەوەی پێبەخشـیون یـان لـە میانـەی ئەمـەوە ئـەوەی پێبەخشـــیون؟ لەبەرئـــەوەی لـــە ئاکـــاودا ئایندەیـەکی نـەزانراو لـەویدا هەیـەو کراوەشـە. ئایـا ئـەو گیانلەبـەران و زیندەوەرانـی لـەناو مرۆڤدا وەئاگا هیناوەتەوە؟ ئیدی بەم مانا قوله مـردن لـە پەنهانیەکـەی و لـە حەتمیەتەکـەی خۆیدا پەیوەستە بە وزەی ژیانەوە.

**سەرچاوە**

*Sinn und Form*

*Marz/ April 2002*



# ئینسایكلۆپیدیا

ئینسایكلۆپیدیای زاراوەی ڕەخنەی ئەدەبی د. بەهرام میقدادی

- ئۆمبێرتۆئیكۆ
- پاشنوێگەرایی (پۆست مۆدێرنیزم)
- پاشبونیادگەرایی
- بەناویەكداچوونی دەقەكان

# ئینسایكلۆپیدیای زاراوەی رەخنەی ئەدەبی

• بەهرام میقدادی

▪ لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی

## ئومبیرتۆ ئیكۆ

ف: اكو، اومبرتو Eco, Umberto

ع: امبیرتو إكو



ئومبیرتۆ ئیكۆ سالی ١٩٢٩ لە ئیتالیا هاتە دونیاوەو لە زانكۆی تۆرین خویندی. ئیكۆ لە زانكۆكانی تۆرین و، میلان و فلۆرەنساو، بلۆنیادا فەلسەفەو نیشانەناسیی وتۆتەوەو، شیوازیكی لە بوارەكانی نیشانەناسی (یا ئاماژەناسی) و نووسینی رۆماندا بە شیوازی پۆست مۆدیرن و رۆژنامەنووسی ناسراوە.

سەرەتا وا چاكە وینەیەكی گشتیی ئەو وەك ئاماژەناسیك بناسین. لە بواری ئاماژەناسیدا سێ كتیبی لە چاپدراوی هەیە:

١-تیۆرەی ئاماژەناسی (١٩٧٥).

٢-رۆلی خوینەر، چەند دۆزینەوەیەك لە ئاماژەناسیی دەقدا (١٩٧٩).

٣-ئاماژەناسی و فەلسەفەی زمان (١٩٨٤).

پیناسەیەكی كورتی ئاماژەناسی ئەوەیە كە بریتیە لە زانستی ئاماژەو، بە بۆچوونی سۆسۆریش زمان بەشیكی لاوەكیی ئاماژەناسییە. دوو ئەنجامی ئەم جۆرە تیروانینەش بۆ زمان بریتین لە:

١-بەرەو پیشبردنی تۆژینەوەی تەتبیقیی هۆیەكانی راگەیاندنی ئەدەبی و وینەیی، بە تایبەتیش لە بواری چیرۆكنووسیدا.

٢-تیكشكاندنی دەمارگیریی باوی تەقلیدیانەی لایەنگرانی كەلتووری بەرز كە دژ بە بەرهەمی میدیای دەستەجەمعیی خەلكن.

ئیكۆ چەند بایەخ بە فرەمانایی دەدات لە "بیداریی فینیگانەكان"ی جەیمس جۆیسدا؛ هیندەش بایەخ بە ئاماژەناسیی جلوبەرگی

"جینز" یان چیرۆكی "سوپەرمان" دەدات و ئەم تایبەتمەندێتیەشی، لەگەڵ شێوازە زیندوو خۆشەكەی، ئەوی كردووە بە یەكێك لە بەناوبانگترین ڕەخنەنووسان لەناو كەلتووری بونیادگەری (یان بونیادخوازی)دا.

(ئەم زانیارییانە لە كتێبی ڕەخنەو تیۆرەی مۆدێرنی "دەیڤید لۆج"ەوە وەرگیراوە)

ئیكۆ لە كتێبی "تیۆرەی ئاماژەناسی"دا، ئاماژەناسی بە "تیۆرەیەكی درۆ" لە قەڵەم دەدا، ئەو دەڵێت:

"ئەم پرۆژەیە بۆ ئاماژەناسی، واتە تۆژینەوەی تەواوی كەلتوور و، هەروەها چاوخشان بە بابەتگەلێك و ڕووداوێكی زۆردا وەكو ئاماژە، دەتوانێ وێنەی ئیمپریالیزمێكی زەبەلاح بۆ ئاماژەناس بەدەستەوە بدات. كاتێ زانستێك "هەموو شتێك" دەكاتە بابەتی لێكۆڵینەوەی خۆی و بەم پێیە وا دەڕوانێتە خۆی كە بە هەموو جیهانەوە بەستراوەتەوە.. دەستی داوەتە گەمەیەكی پڕ مەترسی.. ئاماژەناسی بە تەواوی ئەو شتانەوە پەیوەندیدارە كە بتوانرێ لەگەڵ شتی تردا جێگۆڕكێیان پێ بكرێ. پێویستیش ناكات كە ئەو شتەی تر بوونی هەبێت و یان لە ڕووی كردەییەوە لە هەمان ئەو شوێن و ساتەدا بێت كە ئاماژەیەك تیایدا سەقامگیرە. كەواتە لە بنەڕەتدا ئاماژەناسی لەو شتانە دەكۆڵێتەوە كە بكرێ بۆ درۆكردن سوودیان لێ وەربگیرێ. ئەگەر شتێك نەكرێ بۆ درۆكردن سوودی لێ ببینرێ، بۆ گوتنی حەقیقەتیش ناكرێ سوودی لێ ببینرێ. لە ڕاستیدا ناكرێ بۆ "گوتن"یش سوودی لێ وەربگیرێ.

لە هەمان كتێبدا بەمجۆرە ئاماژە پێناسە دەكات:

"من ئەو شتانە بە ئاماژە پێناسە دەكەم كە لەسەر بنچینەی ڕێسایەكی كۆمەڵایەتی لە پێشدا سەلمێنراو بتوانرێ وەكو شتی تر جێگۆڕكێیان پێ بكرێ. بە دەربڕینێكی دی، من پێم خۆشە پێناسەكەی مۆریس (١٩٣٨) قبووڵ بكەم كە بە گوێرەی ئەو "تەنها لەبەر ئەوە شتێك ئاماژەیە كە لە ڕێی شیكەرەوەیەكەوە بە شتێكی دی لێكدراوەتەوە..، كەواتە ئاماژەناسی لە پۆلێك بابەتی تایبەت ناكۆڵێتەوە، بەڵكو لە بابەتگەلێكی ئاسایی تا ئەوكاتەی كە لە ئاماژەناسیدا بەشدار دەبن".

ئیكۆ بڕوای وایە كە دوو جۆر ئاماژەناسیمان هەیە. كتێبی "تیۆرەی ئاماژەناسی" لەم بوارەدا زانیاریی پێویست دەخاتە بەردەستی خوێنەر:

"لە نێوان دەلالەت و پەیوەندیدا جیاوازی هەیە: لە بنەڕەتدا ئاماژەناسی دەلالەت پێویستی بە تیۆرەی ڕەمزەكان هەیە، لە كاتێكا كە ئاماژەناسی پەیوەندی پێویستی بە تیۆرەی بەرهەمهێنانی ئاماژە هەیە..

سیستمێكی دەلالی (بەم پێیە ڕەمزیش) كاتێ بوونی هەیە كە توانای ڕێكەوتنی كۆمەڵایەتی بۆ بەرهەمهێنانی ئاماژە؛ كاریگەریی هەبێت، ئیدی هۆكارەكانی ئەم كاریگەرییانە یەكەی بەشبەشكراوبن بە ناوی ئاماژەوە یان بەشی گەورە بن لە گوتار، بەو مەرجەی كە پێشتر هاوپەیوەندی لە ڕێی ڕێكەوتنێكی كۆمەڵایەتیەوە سەلمێنرابێت. بە پێچەوانەشەوە، پرۆسەیەكی پەیوەندساز كاتێ بوونی هەیە كە

ئەگەرەکان لە ڕێی سیستمێکی دەلالیەوە بەکارهێنرابن؛ تا بە شێوەیەکی فیزیکی دەستەواژەگەلێك بۆ کۆمەڵێك مەبەستی کردەیی بخولقێنن. کەواتە جیاوازیی نێوان دوو میتۆدی تیۆرەیی.. پەیوەستە بە جیاوازییەکەوە کە لە نێوان یاساکان و پرۆسەدا (یان بە زمانی ئەرستۆیی، لە نێوان هێزو کاردا) بوونی هەیە.

بە مەبەستی لە کورتی بڕینەوە، لێرەدا کۆتایی بە باسی ئاماژەناسیی پەیوەندی و ئاماژەناسیی دەلالەت دەهێنین و قسە لەسەر تیۆرەکانی تری ئیکۆ دەکەین.

بە بۆچوونی ئیکۆ دەق دەکرێ بە دوو جۆرەوە: کراوەو داخراو. جیرمی هاوثورن لە "فەرهەنگی زاراوەی تیۆرەی ئەدەبیی هاوچەرخ"دا بەمجۆرە مانای ئەم دوو وشەیە لێکدەداتەوە "ئیکۆ دەقی لە چەشنی چیرۆکەکانی سوپەرمان و ڕۆمانەکانی یان فیلیمینگ (نووسەری جەیمس بۆند) بە دەقی داخراو لەقەڵەمدەدات، ڕێك لەبەرئەوەی کە ئەم کتێبانە لەبەردەم هەموو جۆرە خوێندنەوەیەکدا کراوەن".

هاوثورن قسەی ئیکۆ بە نموونە دەهێنێتەوە کە دەڵێت:

"ئەو دەقانەی کە بە شێوەیەکی دردۆنگ ئاسا وەلامێکی دیاری کراو لای خوێنەری ئەزموونگەر دەوروژێنن.. لە ڕاستیدا بە ڕووی هەموو جۆرە ڕەمزشکێنیەکی گومراکەردا کراوەن. دەقێك کە ئەوەندەو زیاد لە پێویست لەبەردەم هەموو جۆرە لێکدانەوەیەکی شیاودا کراوەیە؛ دەکرێ بە دەقێکی داخراوی لە قەڵەم بدەین".

هاوثورن بەمجۆرە پێناسەی دەقی کراوە دەکات: "بە بەراورد، لە کاتێکا کە نووسەری دەق، لە ساتی بەرهەمهێناندا ڕۆڵی خوێنەری لەبەرچاوە، بە بۆچوونی ئیکۆ، ئەو دەقە بە شێوەیەکی دژ و ناکۆك، بە ڕووی لێکدانەوەیەك بەدوایەکەکاندا کراوەیە"

لە کتێبەکەی هاوثورن دا ئیکۆ دەڵێت:

"تۆ ناتوانیت وەکو ئەوەی خۆت دەتەوێت بەو جۆرە سوود لە دەقی کراوە ببینیت، تەنها بەو جۆرەی کە دەقەکە دەیەوێت تۆ دەتوانیت سوودی لێ ببینیت. دەقێکی کراوە، چەند کراوەش بێت، خۆی بە دەست هەموو جۆرە لێکدانەوەیەکەوە نادات.

ڕامان سیڵدن و پیتەر ڤیدۆسان لە کتێبەکەیاندا "ڕێنومای تیۆرەی ئەدەبیی هاوچەرخ"، لە زمانی ئیکۆوە و لە کتێبی "ڕۆڵی خوێنەر"یدا؛ بەمجۆرە ئەم دوو وشەیە ڕوون دەکەنەوە کە ئیکۆ "دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە هەندێ دەق کراوەن (وەکو بێداریی فینیگانەکانی جۆیس) و خوێنەر بۆ بەرهەمهێنانی مانا بانگهێشت دەکەن، لە کاتێکا کە ئەوانی‌دی داخراون (کارە کۆمیدی و خەیاڵیە پۆلیسیەکان) و پێشوەخت وەلامی خوێنەر دیاری دەکەن". بەم پێیە دەقی "کراوە" دەقێکی "داینامیك"ە، لەبەرئەوەی خوێنەر وا لێدەکات کە مانای بێشومار بەرهەمبێنێت.

وەکو دوا قسەش، پێویستە ئەوە بڵێین کە بەپێی ڕوونکردنەوەکانی هاوثورنیش "تویژینەوەکانی ئیکۆ بیر وروژێن و کاریگەرن، بەلام ئالۆزییەکانی زاراوەیەکی ئەدەبی وامان لێ دەکات ئەوەمان لەیاد بێت کە دەقی داخراو

بەرامبەر هەموو جۆرە وەلامێك كراوەیەو هەروەها ئەوەی كە دەقی كراوەش وا لە خوێنەر دەكات كاردانەوەی بەرامبەری سنووردار بێت، ئەو ڕاستییە لەخۆ دەگرێت كە پێناسە پێشنیازكراوەكانی هێشتا زۆر پەسەند نین، گەرچی وشەی "كراوە" و "داخراو" بەردەوام و بە شێوەیەكی ئازادانە لە باسە ئەدەبییەكانداو لە دەقی تردا سوودیان لێ دەبینرێ".

## پاشنوێگەرایی

## (پۆست مۆدێرنیزم)

**ف: پسانوگرایی** Postmodernism

**ع: ما بعد الحداثة**

پاشنوێگەراكان بیروباوەڕو پرنسیپەكانی نوێگەراكان (مۆدێرنیستەكان)ی لە بابەت حەقیقەتی ڕەهاو هاوپەیوەندی و یەكێتی ڕەتدەكەنەوەو، لە سەرێكی تریشەوە باوەڕیان بە فرە كەلتووری و بەڕێژەییبوونی كەلتوور هەیەو، لەگەڵ ئەقڵگەرایی زانستی و بەدیهێنانی یەكێتیی كۆمەڵایەتی و سیاسی و كەلتووریدا نین لە سەردەمی مۆدێرندا. فەیلەسووفانی پاشنوێگەرایی بۆ یەكەمجار دەركیان بە "هۆشیاریی درۆ" كرد. ئەمەش بەو مانایەی كە بڕواكردن بەوەی كە ئەقڵ و خودێتی ڕەنگدەرەوەی حەقیقەتن، شتێكی بێبناغەیەو بە پێچەوانەوە، هۆشیاری نەك دەشێ هەر ڕەنگدەرەوەی حەقیقەت نەبێت؛ بەڵكو لەوانەیە حەقیقەتیش بشێوێنێت.

پاشنوێگەراكان لەگەڵ فەلسەفەكەی كانت دا نەیارن كە بناغەی كۆمەڵگای مۆدێرنەو، ئەقڵ بە سەرچاوەی حەقیقەت دەزانێت، لەم بارەیەشەوە دەڵێن دونیای ڕاستەقینە بەدەر لە ئیدراكی ئێمە بوونی نیەو ئەو حەقیقەتەی كە ئێمە باوەڕمان پێیەتی؛ دروستكراوی زەینی خۆمانە. دەكرێ لە بیروڕاكانی ماركس و فرۆیدو نیچەدا بە دوای ئەم تیۆرەی "هۆشیاریی درۆ"یەدا بگەڕێین. بۆ نموونە ماركس بڕوای وابوو كە "هۆشیاریی درۆ" چ نیە جگە لە ئایدیۆلۆژیا. زۆربەی بیروباوەڕەكانی ئێمە ڕەنگدانەوەی حەقیقەتی كۆمەڵایەتی نین و ڕاستیەكان لە پێناوی بەرژەوەندیی چینی دەسەڵاتداردا دەشێوێنرێن. فرۆیدیش دەڵێت كە هۆشیاریی ئێمە دەكەوێتە ژێر كاریگەریی نەستەوەو هەندێ جار لە شێوەی نەخۆشیی دەروونیدا دەردەكەوێ. كەواتە ناكرێ ببێتە سەرچاوەی ڕاستی و بابەتێتی.

نیچە ڕۆڵێكی كاریگەرو زیندووی لە سەرهەڵدانی پاشنوێگەراییدا هەبووەو بە فەیلەسووفی خۆشەویستی پاشنوێگەراكان لەقەڵەمدەدرێ. بە بڕوای نیچە شتێك نییە ناوی بابەتێتی (مەوزوعیەت) بێت، بە تایبەتیش بابەتێتیی زانستی. ئەوەی هەیە كۆمەڵێك شیكردنەوەی جیاوازە كە لە ڕوانگەی جیاوازەوە سەرچاوەیان گرتوە. هیچ شیكردنەوەیەكیش دوا مانامان ناداتێ‌و، ڕاستیەكان چ نین جگە لە درۆگەلێكی سوودمەند. ئێمە لە ڕێی چەمكە ئەقڵیەكانی خۆمانەوە جیهان ڕێكدەخەین تا درێژە بە مانەوەی خۆمان بدەین، بەڵام ئەو كارە جگە لە شێواندنی ڕاستی هیچی تر نییە،

ئــــــەنجامی فەلســــــــفەیەکی لــــــەمجۆرەش پـــــــەیدابوونی هیچگەرایی (نیهیلیزیم) بوو. واتە ویناکردنی ئیمـە بـۆ جیـهانی دەرەوەمان بێ بناغەیەو، لەودیو بوونیشەوە جگە لە نەبوون هیچی تر نییە.


لیوتارد

نیچە باس لە دوو جۆری هیچگەرایی دەکات: هیچگەرایی نەریی (نەگەتیڤ) و هیچگەرایی ئەریی (پۆزەتیڤ). لە هیچگەرایی نەرییدا بڕوایەکی وا هەیە کە نە لە جیهانی دەرەوەو نە لە جیهانی ناوەوەدا، حەقیقەت نییەو ئەمەش خۆی لە خۆیدا دوو کاردانەوەی بەدوادا دیت. یەکیکیان ئەوەیە کە مادامەکی جیهان بێ نرخ و بەهاو بێ مانایە، کەواتە نابێ وابەستە بین پیوەی و جیهانیکی دیکە هەیە کە جیهانی راستەقینەیە، کاردانەوەکەی تریش ئەوەیە کە جیهان جگە لە ئازاریکی بێ ماناو بیوەر هیچی دی نییە. بەلام هیچگەرایی ئەریی ریبازی کەسیکە کە دەزانیت ژیان هیچ ماناو بەهایەکی نییە؛ بەلام بۆ سەلماندنی ئازایەتیی رۆحیی خۆی دریژە بە ژیان و زۆرانی خۆی دەدات. لیرەشدا رووبەرووی چەمکی (بالامرۆ- سوپەرمان)ی نیچە دەبینەوە.

دەتوانین زۆربەی گوتەکانی نیچە لە بیروباوەرەکانی پاشنویگەراکاندا ببینینەوە. بۆ نمونە بڕوابوون بە زۆری و فرەچەشنی دونیاکان، ریژەییبوونی روانینەکان، هەروەها ئەوەی کە جیهان چ نییە جگە لە ئەفسانە کە ئیمە دەیخولقینین، مرۆڤی پاشنویگەرا ئەفسانە دەخولقینیت و دریژەی پیدەدات و پیویستیشی بەوە نییە کە ئەم چەمکانە لەودیو وشەگەلیکی وەکو راستی و بابەتیتییەوە بشاریتەوە. لیوتار کە یەکیکە لە کۆمەلناسە پاشنویگەراکان لەگەل گشتگەرایی تیۆرەی هونەرو فەلسەفەدا نییە، لەبەرئەوەی بە هەولیك بۆ لەناوبردنی جیاوازیی دەزانیت، پاشنویگەرایی دژی نمونەگەرایی (یان ئایدیالیزم)ەو باوەری بە دوا ماناو دوا بەها نییە.

هایدیگەریش دەلیت: ئیمە لەناو زماندا بەندین و، زمان ناتوانیت دەلالەت لە راستیی دەرەوە بکات. ئەگەر راستی بە دراویکی دەرەوەی زمان بزانین، ئەوا ریبەك بۆ زانینی شك نابەین. راستی (حەقیقەت) بە تەنها وشەیەکە لەناو زماندا کە توانای دەرچوونی لەناو چوارچیوەی زماندا نییە. نیچە پیشتر رایگەیاندبوو کە هەولدان بۆ تیپەراندنی زمان، واتە وەستان لەبیرکردنەوە.

بە زۆری پاشنویگەرایی بەو بزواتە رۆشنبیری و هونەری و کۆمەلایەتیە تایبەتە دەوترێ کە پاش دووەم جەنگی جیهانی هاتە ئاراوە. گەرچی هەندێ لە خاوەن رایان بڕوایان وایە کە هزری پاشنویگەرا تایبەت نییە بە رۆژگاریك و تەنانەت بەر لە دووەم جەنگی جیهانیش هەر هەبوەو هەموو بیرمەندانی دوای دووەم جەنگی جیهانیش باوەریان وا نەبوە. لیکدانەوەی دەستەیەکی تریش لە بیرمەندان بۆ پاشنویگەرایی ئەوەیە کە ئەوە دۆخی

گشــتیی جیهانــە لــە قۆنــاغی کــاملبوونی سەرمایەداریدا.

هـەروەکو بە ناوەکەشیدا دەردەکـەوێ و بـە پێــی تــیروانینی زۆربـــەش؛ ئـــەم بزاوتـــە رۆشـــنبیرییە؛ واتـــە پاشـــنویگەرایی دوای نویگەرایی هاتە ئاراوەو لە ئەنجامیشداو لە زۆر رووەوە بە درێژەی نویگەرایی لە قەڵەمدەدرێ، کە تیـایدا بنـەماکانی نویگـەرایی بـە تـیروانینیکی زیدەرۆیانــەوە، بوونــەوە مایــەی گرنگیپیــدان. دیــارترین روخســاری هاوبەشــی نویگــەرایی و پاشنویگەرایی، بە تایبەتیش لە بواری هونـەردا، خۆدزینەوەیانـــــە لـــــە واقیعگـــــەرایی و لاسـاییکردنەوەی واقیـع لـە هونـەردا، هـەروەها خالی جیاوازیشیان ئەوەیە کە هونـەری نویگـەرا لەگـەڵ هـەموو لافلیدانەکانیشـیدا سـەبارەت بـە لاسایی نەکردنـەوەی واقیع؛ خـۆی بە جۆریك لـە جۆران گرفتاری دەست ئەم مـەیلی خستنەرووی واقیعەیــە. بــەڵام ئــەم واقیعیەتــە جیــاواز لــەو واقیعیەتــەی کـــە هونەرمـــەندانی ســـەدەی ١٩ بایـــەخیان پیـــدەدا. ئـــەوەی نویگـــەراکان دەیانخستەروو واقعیـەتیك بـوو کـە بـە تەنـها بـە هـۆی روانینیکـی قولـەوە دەکرا ببینرێ و چـاوی کەسـانی سـادەو سـاکاربین نـەیاندەبینی. لـە سـەریکی تریشـەوە هونەرمـەندانی پاشـنویگەرا لـەو بروایـەدا بـوون کـە لـە راسـتیدا حەقیقـەتیك نییـە؛ نـە بـە روالـەت و نـە لـە ناوەوەشـدا، تـا بخریتەروو یان لاسایی بکریتەوە.

ئـەم بروایــەی پاشـنویگەراکان بـەوەی کـە حەقیقەتیکی رەها نییەو جیهان بە سەنتەربوونی خـۆی لەدەســت داوەو لــە جیــهانیکی وا بــێ سەنتەریشدا هاوپەیوەندی و مانا نەماوە، بوەتە مایـــەی ئـــەوەی کـــە پاشـــبونیادگەرایی و بەتایبـەتیش بونیـاد هەڵوەشـینی زۆر بـە نزیكـی پاشنویگەرایی بزانـرێ. ئـەدەبی پاشـنویگەراش لـەم بـە سـەنتەر نەمانـەی شـتەکان قوتـار نـەبوەو دوای ئەوەی کە دەسبەرداری زمانیش بوو وەکو سـەنتەریك کــە کەرەســەی یەکــەمی ئەدەبــە؛ ئەدەبیك پەیدابوو کە خۆی ئامانجی گاڵتەجاریی خۆیەتی و بەلای هەجوو تەنزدا شکایەوە. هاتنە ئــاراوەی لاســاییکردنەوەی کــارە ئــەدەبی و هونەرییـەکانی تـرو، ئاویتـەکردنی شیوەو رەنگـە جۆراوجۆرەکان لە نیگارکیشیداو کۆپلە ئەدەبیە جیاوازەکـان لـە ئـەدەبدا کـە بەشـیکن لـە ژانـرە هونەرییـەکانی پاشـنویگەراکان، بـە جۆریـك لـە جۆران پەیوەسـتن بـەم نەفیکردنـەوەی مانـاو بـە سـەنتەربوونەوە لـە جیـهاندا. لەبەرئـەوەی لـە جیــهانیکی بیمانــاو بــێ ســەنتەردا، چیــدی هونەرمەند خاوەنی شیوازو ریگایەکی تایبەت بە خۆی نابیت و دزیی ئەدەبی و سوودوەرگرتن لە کاری هونـەریی ئـەوانیتر، مانایـەکی نەگەتیڤانـە لـەخۆ نـاگریت. هـەروەها نوسـەرو هونەرمـەندی پاشنویگەرا جەخت لەسەر سـاختەیی داهینانـە هونەرییەکەی خۆیـان دەکەنـەوەو سـوورن لەسـەر ئـەوەی کـە ئـەو کـارە هونەرییـە رەنگدانـەوەی شتیکی دیکە یـان راسـتییەك نییـەو، لەبەرئەوەی هەروەکو باسمانکرد، بە بروای ئەوان شتیك نییە ناوی راستی بیت.

بیگومـان جیـاوازی لــە نیــوان فەلســەفەو جۆری روانینـی نویگـەرایی و پاشنویگەرایی بـۆ جیهان، بوەتـە هـۆی جیـاوازیی تریـش لـە کـارە هونەرییـەکانی ئـەم دوو ئاقـارەدا. نویگــەراکان روانینیکـی زۆر بەدبینانــەو نەگەتیڤانــەیان بــۆ

جیهان هەیەو سەردەمی تەکنۆلۆژیا بە سەردەمی تـەنیایی مـرۆڤ و ئەسـتەمبوونی دروسـتکردنی پـەیوەندیی مرۆیـی و بـە شـێوەیەکی گشـتی بـە سـەردەمێکی زۆر تـاریکی مرۆڤایـەتی دەزانـن. نوێگــەراکان ئــەم کەموکورتیانــەیان هەســت پێکـردوەو دەیانـەوێ نەیـهێڵن و تەقـەللا دەدەن نەزمێك بەو ئاشووبەی کە بەسەر جیهاندا زاڵە؛ ببەخشنەوە. هونـەری نوێگـەراش ڕەنگدانـەوەی ئـەم تـەرزە بیرکردنەوەیەیـە. لـە لایـەکی تـرەوە؛ پاشنوێگەراکان؛ سـەرباری ئـەوەی بڕوایان بـەوە هەیـە کـە جیـهان پـڕ ئاشـووبەو لـە پەیوەندییـە مرۆییە دروستەکان خاڵییە؛ بەڵام بە پێچەوانـەی نوێگەراکانـەوە؛ لـەم دۆخـە واقیـان وڕ نـەماوە. لـەوە دەچێـت ئـەم دۆخـەیان قبـووڵ کردبێـت و تەنانەت پێشوازیشـی لێبکـەن. ئەو تـەکنۆلۆژیاو پیشەسازییەش کە نوێگەراکان بە هۆکاری بـەڵا تازەکـانی مرۆڤایــەتیی دەزانــن و بەرامبــەری گەشــبین نــین، لای پاشــنوێگەراکان شــایانی ستایشـن و لەگـەڵ ژیـانی مرۆڤی هاوچـەرخدا بـە گرێــــدراوی دەزانــــن. لــــە هــــەمانکاتدا؛ پاشـنوێگەراکان لافـی هیـچ چـارە دۆزینەوەیـەك یـان ئایندەبینیـەك لێنـادەن و، بـە پێچەوانـەی نوێگەراکانەوە هیچ تەقەللایەکیان بۆ باشکردنی بارودۆخەکان نییەو هەموو ئەمانەش لە هونەری پاشنوێگەرادا ڕەنگیانداوەتەوە.

خـاڵێکی جیاکـەرەوەی تـری نوێگـەرایی و پاشــنوێگەرایی ئەوەیــە کــە پاشــنوێگەراکان هـەوڵیانداوە ئـەو مەودایـەی لـە نێـوان کـەلتووری عـەوام و کـەلتووری توێـژی ڕۆشـنبیراندا هەیـە بیسڕنەوەو ئەو هونەرەی کە بەرهەمیشی دەهێنن لــــەو هەڵبژاردەییــــەی نوێگــــەراکان دوورە. پاشنوێگەراکان گاڵتەو سووکایەتی بـە هونـەری عـەوام ناکـەن و بـەهای چیرۆکـە پۆلیسـیەکان و چیرۆکـە زانسـتی- خەیاڵییـەکان و حیکایــەتی پـەرییان بە هاوشانی بەهای ژانرە ئەدەبیـەکانی تر دەزانن کە جێی بایەخی توێژی ڕۆشنبیرانن.

هــەموو ئەمانــەش کاتــێ پاســاوی بــۆ دەهێنرێتــەوە کــە وەکـو فریدریــك جیمســۆن وتویــەتی، پاشـنوێگەرایی بــە زادەی قۆنــاغی کامڵبوونی سەرمایەداری بزانین و کەلتوورەکەی بە کەلتووری مرۆڤی ئەو سەردەمە لەقەڵەمبدەین. بێگومـان دوا چـاخی سـەرمایەداری خوازیـاری هونەرێکە کە کەلتووری بازرگانیشی کردبێت بە بەشـێك لـە خـۆی، بـە جۆرێـك کـە جواننـاسـی و سوودمەندیی ماددی بۆ هەموو خەڵکی تێکەڵ بە یەك بکات. ئەگەر بمانەوێ بە شێوەیەکی گشتی پێناسەی هونەری پاشنوێگەرا بکەین، دەتوانین بڵێـین کـە هونــەری پاشــنوێگەرا هونــەرێکی کۆمەڵایـەتی، هـەڵبژاردەیی و ئاشـووبگەرایە، کـە بابەتەکەی واقعیەت نییە؛ بەڵکو خودی خۆیـەتی و لە پیرۆزیو باڵایی میتافیزیکاش دوورە.

لە کۆتاییدا پێویستە بڵێین کە لـە ڕاستیدا هــەر جــۆرە هــەوڵێك بــۆ سیســتماتیزەو پێناسـەکردنی پاشنوێگەرایی لەگـەڵ ماهیـەتی پاشــنوێگەراییدا نــاگونجێت، لەبەرئــەوەی لــە خەســڵەتە دیارەکــانی کــەلتوورو ڕوانینــی پاشنوێگەرا بڕوابوونـە بە نـەبوونی پـەیوەندی و نــەبوونی توانــای دیــاریکردن لــە جیــهانی هاوچەرخدا.

# پاشبونیادگەرایی

**ف-پساساختگرایی Post- Structuralism**

**ع-ما بعد البنیویة**

بونیادگەرایی لەسەر بناغەی ئەو پرنسیپەی سۆسۆر دامەزرا کە دەڵێت دەبێ زمان وەکو سیستمێکی ئاماژەیی بە شێوەی (هاوزەمانی) لێی بکۆڵرێتەوە، واتە لە قۆناغێکی زەمەنیی دیاریکراودا. لایەنی "ناوزەمانی"ی زمانیش، واتە چۆنێتیی گۆڕان و پەرەسەندنی بە درێژایی زەمەن، بایەخێکی کەمتری هەبوو. بەڵام لە هزری پاش بونیادگەرادا بۆ جارێکی دی لایەنی "ناوزەمانی" بووەوە بەجێی گرنگیپێدان. گەرچی کاری کەسانێکی وەکو ژاك لاکانی دەروونشیکارو میشیل فۆکۆ تیۆریزەکردنێکی کەلتووری بوو و لە هاتنە ئاراوەی پاش بونیادگەراییدا گرنگیی خۆی هەبوو، بەڵام دەبێ دان بەوەدا بنێین کە کاریگەریی تیۆرە بونیادشکێنیەکەی ژاك دێریدای فەیلەسووفی فەرەنسایی لەسەر ئەم بزاوتە فیکرییە لە پێشترو زیاتر لە هەموو ئەوانی دی بوو. دێریدا ڕەخنە لە بەسەنتەربوونی قسە (لۆگۆسەنتەریزم)ی هزری خۆرئاوا دەگرێت، واتە ئەو پرنسیپەی کە بە گوێرەی ئەو مانا وەکو بونەوەرێکی سەربەخۆ لە زمان، کە نێوەندی گواستنەوەیەتی، بوونی هەیەو، بەم پێیەش ناکەوێتە ژێر کاریگەریی یاریی زمانەوە. دێریدا ئەم هەڵوێستەی سۆسۆری پێ قبووڵە کە مانا دەرەنجامی ئەو پەیوەندییەی (دال)ەکانە کە جیاوازی دروست دەکەن، بەڵام بە جۆرێك لە جۆران سۆسۆر تێدەپەڕێنێت وەختێ دەڵێت کە ڕەهەندی "ناو زەمانی"ی زمان ناکرێ هەروا بە سادەیی نەبینرێ.

زمان زنجیرەیەکی بێکۆتاییە لە وشە کە تیایدا هیچ بنەماو پرنسیپێکی سەرکەوتووی زمانی نییە. هەروەها دێریدا دەڵێت کە سۆسۆر نەیتوانی خۆی لە هزری لۆگۆسەنتەریزم بپارێزێت، لەبەرئەوەی بە پەسەندکردن و بەرزتر ڕاگرتنی قسە بەسەر نووسراودا، پیشانیدا کە تەسەور دەکات دال و مەدلول لە قۆناغێکی زەمەنیی دیاریکراودا لە گوتاردا کۆدەبنەوە. دێریدا هێرش دەکاتە سەر ئەم لۆگۆسەنتەریزمەو دەڵێت کە نووسراو خاوەنی نمونەیەکی گونجاوترە بۆ تێگەیشتن لە کارکردەکانی زمان. لە نووسراودا، دال هەمیشە بەرهەمهێنەو بەمجۆرەش لایەنێکی "ناوزەمانی" و بگرە چرکەساتێك بە دەلالەت دەبەخشێ کە ڕێ بە پێکەوەگرێدانی دال و مەدلول نادات. ئاماژەکانی نووسراو سەربەخۆیی ئاماژەناسییانەیان هەیە، بەوەی کە گەرچی مانا بە هۆی ئەو پەیوەندییانەوە دێتە بەرهەم کە جیاوازی دروستدەکەن، بەڵام ئەم سەربەخۆیی نووسراوە ئەو خاسیەتەی هەیە کە هەمیشە مانا بە هەڵواسراوی دەمێنێتەوە، لەبەرئەوەی نووسراو لەو بوارە مانایییە بێ سنوورانەدا کە دەشێ لە ئایندەدا بێنەدی؛ مانا دەخوڵقێنێت. بنەمای سەرەکیی هزری دێریدا واتە *differance* کە جیناسێکی گشتیی لەگەڵ وشەی *difference*دا هەیە، کە هەم بە مانای جیاوازی و هەم بە مانای دواخستنیش دێ؛ پایەکانی لۆگۆسەنتەریزمی خۆرئاوا تێکوپێك دەدات و

ئاماژه بۆ ئەوه دەكات كه هەرگیز مانا بە شێوەیەكی تەواو ئامادەگیی نییە، لەبەرئەوەی بەردەوام بوون و ئامادەگیی دوا دەخرێ. هەروەها بەكارهێنانی بونیادهەڵوەشێنی (یان بونیادشكێنی) لە شیكردنەوەی هەندێ دەقدا؛ كاریگەرییەكی زۆری لەسەر رەخنەنووسانی ئەدەبی هەبوە، لەبەرئەوەی بە پێچەوانەی رەخنەنووسانی نوێوە، ئەو نایەوێت یەكێتیی بونیادی یان یەكەی ئۆرگانیی دەق بسەلمێنێت، بەڵكو هەوڵدەدات ئەم مەسەلەیە روونبكاتەوە كه چۆن دەق وێنا شاراوەكانی ناوخۆی بێ بنچینە دەكات و بەمجۆرەش، لەناو خۆیدا جیاوازی و لێكنەچوون دەخولقێنێت. وتاری "بونیاد، ئاماژەو یاری له گوتاری زانستە مرۆییەكاندا"ی دێریدا، ئەم خاڵانەی خستۆتەروو. لەو شتە گرنگانەی تر كه لە پاشبونیادگەراییدا جێی بایەخە، مەسەلەی گوتارە. لە بونیادگەراییدا روانینی سیستماتیك، هەموو ئەو پرۆسە خودی و كەسییانە ئەفەرۆز دەكات كە بە هۆیەوە كەسەكان لەگەڵ یەكترداو لەگەڵ كۆمەڵگادا پەیوەندی دروستدەكەن. بەڵام بەرامبەر بەمە، رەخنەنووسانی پاشبونیادگەرا لە رەتكردنەوەیاندا بۆ ئەم تیۆرەی بونیادگەراییە، باس لە چەمكی بكەری قسەكەر دەكەن و لەبری ئەوەی زمان به سیستمێكی ناشەخسی بژمێرن؛ بروایان وایە كه هەمیشە زمان پەیوەندیدارە بە سیستمەكانی ترەوەو، بە تایبەتیش بە پرۆسە شەخسی و خودییەكانەوە. ئەم چەمكەی زمانی بەكارهێنراویش ناودەنێن "گوتار".


دێریدا

بەمجۆرە پاشبونیادگەراكان رایدەگەیەنن كە هەرگیز گێرانەوەكان ناتوانن لە حالەتی بەگوتاربوون دەربازبن، واتە هەموو گێرانەوەیەك پەیوەندییەكی من- تۆ لە نێوان نووسەرو خوێنەردا دەگرێتەخۆ. بە كورتی دروشمی پاشبونیادگەراكان لەم گوتەیەدا كورت دەبێتەوە كە هەرچی هەیە، گوتارەو هیچی دی.

لە سەرێكی ترەوە كریستیڤاو لاكان جەخت لەسەر ئەوە دەكەنەوە كه هەرگیز خود (ذات) و بابەت (موضوع) لەیەك جیاناكرێنەوەو، زانینیش هەمیشە له "گوتارێك"ەوە سەرچاوە دەگرێ كه پێش خود كەوتوە. لە كەسێتییە كاراكانی پاشبونیادگەرایی تیۆرەسازو فەیلەسووفی فەرەنسایی میشێل فۆكۆیە كە گرنگییەكی سەرەكی بە پەیوەندیی نێوان گوتارو دەسەڵات داو جەختی لەسەر جیانەبوونەوەیان لە یەكدی كرد، لەبەرئەوەی فۆكۆ بڕوای وابوو كە گوتار ئامرازی رێكخستن و بەڕێوەبردنی هەموو دەزگایەكە. ئەوە گوتارە ئەوە دیاریدەكات كە چ شتێك شایانی گوتنە، پێوانەكانی حەقیقەت چین، چ كەسێ بۆی هەیە بە دەسەڵاتەوە گوتاری خۆی بڵێت و لەكوێ.

رەخنەنووسە پاشبونیادگەراكەی دی، رۆڵان بارت، لە وتاری (مەرگی دانەر)داو لە هەڵوێستێكی پاشبونیادگەرایانەدا، ڕێی بە

خوێنەرەکانی دا کە بەبێ بایەخدان بە مەدلول، لە دالەکانی دەقێکدا نوقم بن و لەهەر کوێوە بیانەوێ سەردەربهێننەوە. واتە ئەوە خوێنەرە کە سەرەتاو کۆتایی پرۆسەی دەلالیی دەق دیاریدەکات، نەك دانەر (نووسەر).

بەهەرحاڵ، بەم لێکدانەوانە دەردەکەوێ کە بناغەی هزری پاشبونیادگەرا لەسەر ئەو کۆڵەکەیە دامەزراوە کە لە نێوان دال و مەدلولدا هیچ پەیوەندییەکی خزمایەتی نییەو، هیچ مەدلولێك بۆ هەمیشە لە خزمەتی دالێکدا نامێنێتەوە. بە دەربڕینێکی دی، ئەگەر پرۆسەی ماناسازی و مانا گەیاندن لە زماندا بە گەمەیەك بشوبهێنین، ئەوا هیچ ئەنجامێکی لە پێشدا زانراو نییە.

## بەناویەکداچوونی دەقەکان

**ف: بینامتنی** Intertextuality

**ع: التناص**

زاراوەی بەناویەکداچوونی دەقەکان (یان دەقئاوێزان) بەو پەیوەندییە دەوترێ کە لە نێوان دوو دەق یان زیاتردا هەیە. ئەم پەیوەندییە ڕۆڵی گرنگی لە چۆنێتی پەیبردن بە "ناو دەق"دا هەیە.

"ناو دەق" دەقێکە کە لە ناوخۆیدا دەقی تری هەڵگرتووە، یان ئامادەگیان تیایدا ڕەنگدەداتەوە. جیرار جینیت زاراوەی "پێش دەق"ی بۆ "ناودەق" داناوە، هەروەها زاراوەی "پاش دەق"یشی بۆ ئەو دەقە داناوە کە "ناودەق" پەیوەندییەکی گرنگی لەگەڵیدا هەیە، گەرچی ئەم زاراوانە بە شێوەیەکی فراوان بەکارنەهێنران.

هەر لە کۆنەوە، سەبارەت بە داهێنانی ئەدەبی ئەو بۆچوونە هەبووە کە هەر دەقێك دەمانگەڕێنێتەوە بۆ کۆمەڵێك دەقی دی کە یان لەو دەقە چوون و یان پێچەوانەی. بەهەرحاڵ، لە چەند تیۆرەیەکدا کە دواتر هاتنە ئاراوە، بایەخێکی پتر بە مەسەلەی بەناویەکداچوونی دەقەکان و شێوە جۆراوجۆرەکانی دراوە.

لەم ڕووەوە تیۆرەکانی بیرمەندی ڕووسی "میخائیل باختین" کاریگەرییەکی فراوانی جێهێشتووە. جەختکردنەوەی باختین لەسەر توخمی "دیالۆگ" لە تەواوی "گوتار"ەکانداو، ئەو پەلهاویشتنە فراوانەی "دیالۆگ"ە جۆراوجۆرەکان کە دەتوانین لە کارە ئەدەبیەکاندا بیاندۆزینەوە، بووە مایەی ئەوەی گرنگییەکی زیاتر بە مەسەلەی بەناویەکداچوونی دەقەکان بدرێ.

بە گویرەی پیناسەکەی باختین "گفتوگۆ" بنچینەو هۆی بەکارهینانی زمانە. هەرچۆن کە بناغەی گوتار، بەکارهینانی تاکە کەسییانەی زمانە بە مەبەستی دروستکردنی "دیالۆگ" و، هەر شیوە دەربرینیکی ئەدەبیش جۆریکە لە گوتاری ئەدەبی بە مەبەستی گفتوگۆ. بەلای "باختین"ەوە، ڕۆمانی چەند دەنگی؛ ڕۆمانیکە کە تیایدا هەر یەکێك لە کەسیتییەکان وەکو میلۆدییەکە کە لەگەڵ دەنگی کەسیتیەکانی ترداو دەنگی چیرۆکبیژ خۆیدا ئاویتە دەبیت و جۆریك لە "چەند دەنگی- یا فرە دەنگی" (پۆلیفۆنی)ی هارمۆنیانە دروستدەکەن. ڕۆمانیکی لەم جۆرە پیکهاتەیەکە لە

پێکەوەبوونی چەند دەنگێکی جیاواز. لەم رۆمانانەدا، وەکو رۆمانەکانی دۆستۆیڤسکی، دیالۆگ توخمی سەرەکیە: لەسەریکەوە دیالۆگی چیرۆکبێژو کەسیتیەکان و، لە سەریکی تریشەوە دیالۆگی نیوان کەسیتیەکان. لە رۆمانی "تاکدەنگی"دا، وەکو رۆمانەکانی تۆلستۆی، تاقە دەنگی زال؛ دەنگی چیرۆکبێژە کە دەنگەکانی تریش دەخاتە ژێر رکیفی خۆیەوەو لەگەڵ خۆیدا دەیانگونجێنیت. لەم رۆمانانەدا، بە تەنها گویمان لە دەنگی چیرۆکبێژ؛ واتە تاقە دەنگێک دەبیت. لە بەکارهێنانی رۆژانەدا "گفتوگۆ" واتە ئالوگۆری قسە لە نیو کەسەکاندا؛ بە تایبەتیش لە کارە ئەدەبیەکاندا. باختین لەو بروایەدایە کە تەنانەت لە گوتاریکدا کە بە شیوەیەکی ئاشکراش گفتوگۆ ناگریتە خۆی؛ دەتوانین گفتوگۆ بدۆزینەوە، لەبەرئەوەی هەموو دەربرینەکان تەئکیدکردنەوە و پووچەلکردنەوەی گوتاری تری تیایەو، ئەم دوو دیاردەیەش قابیلی بەراوردکردنن لەگەڵ رەوتی گفتوگۆ لە مانا رۆژانەکەیدا.

جۆلیا کریستیڤا لە تیۆرەکەی خۆیدا سەبارەت بە دەقئاویزان؛ کەوتۆتە ژێر کاریگەریی "باختین"ەوە. ئەو بروای وایە کە هەر دەقێک لە راستیدا، مەحکومە بە گفتوگۆ لەگەڵ دەقەکانی پیش خۆیدا. ئەو زاراوەی دەقئاویزان بە گوزەرکردن لە سیستەمیکی ئاماژەییەوە بۆ سیستەمیکی ئاماژەیی دی وەسف دەکات. ئەو دەنووسیت:

"بۆ نموونە، لە زماندا، دەشێ ئەم گوزەرە (ئەم پەرینەوەیە) لە گێرانەوەوە بۆ دەق بیت؛ وەکو جیگۆرکێ لە دیمەنی کەرنەڤالەوە بۆ دەقی نووسراو. زاراوەی دەقئاویزان بە مانای "جیگۆرکێ"ی سیستمیک یان زیاتر لە سیستمیکی نیشانەیی (ئاماژەیی) بە سیستمیکی تری نیشانەیی دیت، بەڵام لەو روانگەیەوە کە ئەم زاراوەیە زیاتر بە مانای لیکۆڵینەوەی سەرچاوەکانی کاریک دێ، ئیمە زاراوەی "جیگۆرکێ" پەسەند دەکەین". زاراوەی دەقئاویزان بە شیوەیەکی تایبەتی رێ بۆ پەرینەوەی سیستمیکی ئاماژەیی بۆ سیستمیکی ئاماژەیی دی خۆشدەکات. جیگۆرکێ تەنها بە مانای جیگۆرکێ لە سیستمیکی نووسینەوە بۆ سیستمیکی نووسینی دی نایەت، بەلکو چەمکی جیگۆرکێ لە سیستەمە نائەدەبی و نازمانەوانیەکانیشەوە بۆ سیستەمی ئەدەبی دەگریتەوە. بۆچوونی کریستیڤا لەم بارەیەوە کە دەقئاویزان بە تەنها کورت نابیتەوە بۆ کاریگەریی دەق لەسەر دەق و بەلکو لە راستیدا کۆمەلیک جیگۆرکێ لە خۆ دەگریت کە لە کۆمەلیک سیستمی ئاماژەیی جۆراوجۆرەوە سەرچاوە دەگریت، نزیکە لە بۆچوونەکەی رۆلان بارتەوە.



جۆلیا کریستیڤا

تیــۆرەی دەقئـــاویزان لای بـــارت لـــەژێر کاریگـــەریی تیۆرەکـــەی باختینـدایـــە، بـــەو جیاوازییەشـــەوە کـــە بیروبۆچوونـــەکانی بـــارت لەسەر بناغـەی پـاش بونیادگـەری بـەندن. بـارت هـەر دەقیك بـە "نـاودەق" سـەیر دەكـات. بـەلای ئـەوەوە، بزاوتـــن لـە بونیادگەرییـەوە بـۆ پـاش بونیادگەری، بزاوتنیکە لە "کاری ئەدەبی"ەوە بۆ "دەق". بـە رای ئـەو دەق فـرە چەشـنە. ئـەم فرەچەشنییە بە تەنها بە مانای "چەند مانایی" دەق نایـەت، بـەلكو جۆریكـە لـە فرەچەشـــنی کـــە کەمكردنــــەوە قبوول ناكات. بە رای بارت: "دەق پیكەوە ژیانی ماناکان نییە، بەلكو تیپەرگەیەكـە". بـەم پییـە هـــەر دەقیك تانوپۆیەكـە لـە كەرەسـەو ئـــــەزموونی جۆراوجـــــۆر: "رووناكیـــــەكان، رەنگـــــەكان، رووەكەكان، گـەرما، هـەوا، دەنـگ، خویندنی بالندەكان و جلوبـەرگی دانیشـــتووە دوورو نزیكـــەكان". لای بـــارت دەقئاویزان مانایەكی فراوانتری لەوە هەیە كە بە تەنها بریتـی بیت لـە كاریگـەریی دەقیك لەسـەر دەقیكـی دی، "نـاودەق" كە خۆی دەقیكـە لـەناو دەقیكـی تردا، نابێ وا بزانـین ئەمـە سـەرچاوەی دەقەكەیە. هەولدان بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەكان، یان ئەو شتانەی كاریگەرییان لەسەر دەق هەبوو، واتـە كەوتنـە نـاو داوی حیكایەتیكـەوە. ئـەو فاكتەرانـــەی دەق دروســت دەكـــەن نادیـــارن و قابیلی دۆزینەوە نین و، لە هەمان كاتیشدا پیشتر خویندراونەتەوە: "قسەوەرگرتنن بەبێ نیشانەی قسـەوەرگرتن". فـرە چەشـنی دەق راسـتەوخۆ كاریگـەریی لەسـەر خویندنـەوەی دەق هەیـە. بـە بۆچوونی بارت دەقی فرەچەشن یان فرە رەهەند بۆ "بەكاربردن" نییە؛ بەلكو بۆ "بەرهەمهینان"ە. كاتێ خوینـەریك تاقـەتی خویندنـەوەی دەقیكـی نابیت؛ واتـە توانای پیویستی بۆ بەرهەمهینانی نییـە، "توانـای لـەناوبردن یـان لانـی كـەم، كەمكردنـــەوەی مـــەودا لـــە نیـــوان نووســـین و خویندنەوەدا".

زاراوەی "پیاچوونــــەوە"ش كـــە لـــــە


بارت

نووسینەكانی پاش بونیادگـەرای ئـــەمریكاییدا؛ هـــارۆلد بلـــۆم، دەیبینـــین، پـــەیوەندیی لەگـــەڵ چەمكی دەقئامیزاندا هەیە. بلۆم بروای وایە كە هەموو شاعیرەكان بەدەسـت جۆریـك لـە تەسـەوری "درەنـگ كـەوتن"ەوە دەنـالینن. بەو مانایەی كە لە ئاست شاعیرە ناسـراوەكانی بـەر لـە خۆیـاندا جۆرە گرییەكی ئۆدیپیـان هەیـە، بـەوەی وایدەبینـن كـە ئـەو شـاعیرانەی پیـش خۆیـــان شـــتیكیان نەهیشـــتۆتەوەو هـــەموو شتیكیان وتووە. لە ئەنجامدا دوچـاری جۆریـك لـە كیشمەكیش دەبن و پـەنا دەبەنـە بـەر هـەندێ میكانیزمی بەرگری كە دیاردەی "خویندنـەوەی نادروسـت" یـا "لیكدانـەوەی نادروسـت" لـەخۆ دەگریـــــــت. بلـــــــۆم دەنووســـــــیت: "هـــەر شـــیعریك، دەربرینیكـــی نادروســـتە لـــە شـیعریكی دایـك. شـیعر زالبـوون نییـە بەسـەر دردۆنگیـدا، بـەلكو خـودی دردۆنگـی خۆیـەتی. هیـــچ لیكدانەوەیـــەك نییـــە، ئـــەوەی هەیـــە "لیكدانـــــەوەی نادروســـــت"ە، بـــــەم پییـــــە؛

تەواوی رەخنەی ئەدەبی بریتی‌یە لە شیعری هۆنراو.

بەر لە مەیلی بەلای پاش بونیادگەریدا؛ جۆلیا کریستیڤا ئاماژەناسیك بوو و هەولی دەدا دەربرینیکی ماتماتیکیانە بۆ تیگەیشتنی مرۆڤ لە ئاماژەکان؛ بخاتەروو. بەڵام پاشان دەسبەرداری ئەم تیروانینە زانستی‌یە بوو و، هەولی دا سروشتی داهینەرانەی ئەو ئاماژە دژە کۆمەڵایەتیانە دەرببریت کە لە چوارچیوەی مانایەکدا نامیننەوە. بە واتایەکی دی، ئەویش وەکو دیریدا پەی بە دولایەنەیی (دوالیزمی) زمان برد: زمانیك بەو سیفەتەی کە لەژیر رکیفی کۆمەلگاو کەلتووردایەو ئەوی تریش ئەو ئاماژە زمانەوانیانەن کە لە هەموو جۆرە سەقامگیربوونیك هەلدین و سنووری یەك سیستمیی ماناو ئاماژە تیدەپەرینن. سەرەتا پیدەچوو بە پیناسەکردنی بۆ لایەنی دژە کۆمەڵایەتی ئاماژە بیەوێ بۆ تاکگەرایی بگەریتەوە، بە تایبەتیش کە ئەو هەولیدەدا دووبارە پیناسەی بکەری قسەکەر بکاتەوە، بەڵام دواتر دەرکەوت ئەو بکەرەی ئەو پیناسەی دەکات، یەکتەرزی و سەقامگیریی تاکگەرایانی نییەو، پەرتی و دابەشبوونیکی تایبەتی بەسەر کردار و ئاماژەناسیی ئەودا زالە.

کریستیڤا بروای بە دوو ئاستی جیاوازە لە زماندا کە دەتوانین ناویان لێ بنیین ماناروونی (مەفهومی) و ئاماژەیی. زمانی ماناروونی لە ریی کۆمەلگاوە مەرکەزیەت و سەقامگیریی بەدەستهیناوەو بۆ پەیوەندی بەکاردەبرێ.

بەڵام زمانی ئاماژەیی یان مانەوەی لەهەر زمانیکدا مانای جیاوازی هەیەو سیستمی داهینان (خولقاندن) بەسەریدا باڵادەستە. لەمەی دووەمیاندا دەقی نووسراو بە ئاماژەی زمانەوانی بەرهەمیکە کە جوولەی بۆ دەرەوە هەیەو لەهەر ساتیکدا لە دەرەوە بۆ ناوەوە دەکریتەوەو ئاسۆی ماناکانی خۆی فراوانتر دەکات. دەتوانین بە دوو جۆر لە زمانی ئاماژەیی بگەین: یەکیکیان بە لیکۆلینەوەی دەقئامیزانەو، ئەوی تریش بە هەستی جەستەیی. وەکو کریستیڤا دەلیت، دەتوانین لەهەر دەقیکدا بە باشی لەو دەربرینە جیاوازانە بگەین کە بە پووچەلکردنەوەی یەکترەوە خەریکن. کاتێ بمانەوێ دەق بۆ زمانە ئاماژەییەکەی بخوینینەوە، ئەم پووچەلکردنەوەی مانایانە لەناودەبەین و بەوپەری پەرتیبیانەوە جەخت لەسەر مانای زاراوەو وشەکان دەکەین. هەر وشەیەك بگرین، لە دەقە جیاوازەکانداو بە گویرەی ئەو هەلویست و شوینەی تیاخراوەتە روو، مانای جیاواز دەگریتە خۆی. بەڵام ئیمە هەولدەدەین ئەو مانایە قبوول نەکەین کە بەسەریدا سەپینراوەو تەواوی ماناکان لەبەرچاوی خۆمان دەگرین. بەمجۆرە، فراوانی ماناکان دەگاتە ئەوپەری و داهینەرانە دەبیت. بەپیی ئەم میتۆدە، هەرگیز نابێ دەقی ئەدەبی بگەریتەوە بۆ راستیەکانی دەرەوە، لەبەرئەوەی گەر ئەو کارە بکات، دوچاری زمانی ماناروونی دەبیت و وزەی داهینەرانە (خولقاندن)ی خۆی لەدەست دەدات.

پیویستە دەقی ئەدەبی بۆ دەقەکانی دیکە بگەریتەوە تا هەموویان بگریتە خۆی. هەلبەت لیکۆلینەوەی دەقئامیزانە بە تەنها لە چوارچیوەی کاریگەریی نووسەریك لەسەر نووسەریکی ترو سەرچاوەی

ئـــەدەبیدا گیرنـــاخوات، بـــەلکو زۆر لـــەوە فراوانتر لەسەر ئاستی زمان و ئاماژە کاردەکات.

دووەمـین ریگـا بـۆ گەیشـتن بـە زمـانی ئاماژەیی، یان ریی جەستەو هەستی جەستەیی، بریتی‌یە لەوەی کریستیڤا ناوی دەنیـت "دەقـی چۆنیتیانە". ئەم رەوتە گرنگی بە مامەلەکردنی بنـەرەتی و کۆنـی ئامـاژەی زمانـەوانی دەدات و لەسەر ئاستی پیش ئاماژەیی و پیش مانایی یان بە دریژیـی سیسـتمی مانـایی؛ دیتـە جوولـە: هەلبەت لیرەدا جەستە بە مانای مەیلی ئاژەلانە نایەت، بەلکو بە جۆریك قسەیان لەسەر دەکریٚ وەك ئـەوەی هۆشـیارییان هـەبیت. کەواتـە لـە راستیدا، ئیشارەتە بۆ دۆزینەوەی کۆنکریتیانەی سیسـتمی ئامـاژە زمانەوانیـەکان لـە جەسـتەی مرۆڤدا. کاتیٚ ئەم سیستمە ئەو کۆنکریتیەی لە جەسـتەی مرۆڤـدا بەدەسـتهینا، دەتوانـیٚ بـە ئاسانی دەست بە خولقـاندن و داهینـان بکـات. لـەم حالەتەشـدا، مانـا جیاوازەکـانی وشـەیەك دەتوانن لـە جییەکدا کۆببنـەوەو لەگـەلٚ یـەکتردا کیبـەرکیٚ بکەن، بە جۆریك کە مانای تازە دینـە گـۆریٚ. کەواتـە لـە راسـتیدا، ریگـای هەسـتی جەستەیی هەمان ریگای دەقئاویزانەو قسەکردنە لەسەر کۆنکریتیی ئاماژەکان کە لە دەرەوەی ئەو مانا کورتەی لە دەقیکدا هەیانە، لە جەستەشدا مانای بیشوماریان هەیەو، لە رووی کردەییشەوە دەبنە مایـەی داهینـان، لەبەرئـەوەی بـۆ نموونـە شاعیر لە ریی خستنەرووی ئەم کیبەرکییەوە لە جەسـتەی خۆیـەوە شـتیك دەهینیـت کـە لای خوینـەران دەبیتـە مایـەی یـاریی ئاماژەکـان و، شاعیر خودی ئەم ئاماژانەشـی لـە دەقـی تـرەوە وەرگرتووە.

رەخنـەگریکی تـری ناسـراو کـە بـە هـەمان شـــیوە بیردەکاتـــەوە، رۆلان بارتـــــە. بیروبۆچوونەکانی بارت زۆر لەوانەی کریستیڤاوە نزیکن. ئەو دەلیت:

"هـــەر دەقیـــك بگریـــن، بریتی‌یـــە لـــە چنینەوەیـەکی تازەی کۆمـەلیك شـت و ئامـاژەی کۆن. هـەندیٚ بەشـی ئاماژەکـان و سـیمبولەکان، بونیادەکـان، نموونـەکانی کیـش، برگـەی زمـانی خـەلك و شـتی تـر، دینـە نـاو دەقـەوەو تیـایدا پەرش دەبن، لەبەرئەوەی هەمیشە زمان پیشتر و بە چواردەوری دەقدا هەنگاو دەنیت".

(میخـائیل بـاختین)یـش لـە ریـی تـیزی سیفەتی گفتوگۆیـی زمـان و ئـەو تویژینەوەیـەی سەبارەت بە میژووی رۆمان و کاریگەریی تەنز و هەجوو چەند زمانی بەسـەر بونیـادی رۆمانـەوە، دیتـە نـاو قەلـــەمرەوی ئـــەم گریمانەیـــەوە. تویژینـــەوەکانی بـــاختین لـــەم بارەیـــەوە کاریگەرییـەکی زۆریـان لەسـەر پەیرەویکـەرانی تیزی دەقئاویزان هەبووە. باختین بروای وایە کە رۆمـــان، بـــە شـــیوەیەکی گشـــتی، شـــوینی کۆبوونـەوەی روانینـە جیاوازەکـان و شـیوازە جیـاوازە زمانەوانیەکانـەو، ئـەدەب شـوینی کۆبوونەوەی فرە زمانی‌یە. بەلام باختین بروای بە مـەرگی نووسـەر نی‌یـەو نووسـەر بـە هـیزیك دەزانیـت کـە یـەکیتی بەخشـەو زمـانیکی لاگـیر (جـانبی)ەو، بـەردەوام وا لـە پـەنا گەمـەو کردارەکانی زماندا.

# وێستگەکانی سەردەم

- ماکس ڤێبەر
- ئۆریانتالیزم
- پەیامێك بۆ بۆرخس
- شیعر و مێژوو
- سەرەتایەك دەربارەی ڕۆشنگەری ئەڵمانی
- خوێندنەوەیەك بۆ کتێبی هۆلۆکۆست

# ماكس ڤێبەر (Max Weber)


• د. ئیحسان محەمەد حەسەن

▪ لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد


ماكس ڤیبەر (*1920-1864*) یەكێكە لە بەناوبانگترین كۆمەڵناسەكانی ئەڵمانیاو بگرە لە بەناوبانگترین ئەو كۆمەڵناسانەیە كە لە خۆرئاوادا هاتوونەتە ئارا. ساڵی ١٨٦٤ لە ئەڵەمانیا لەدایكبوەو لە زانكۆكانی ئەوێدا خوێندویەتی. دوو دكتۆرا نامەی لە زانكۆی بەرلین وەرگرتوە كە بریتین لە دكتۆرای فەلسەفە (ساڵی ١٨٨٩) و كارنامەی دكتۆراكەشی بریتی بوو لە:



ماكس ڤێبەر

(مێژووی كۆمەڵە بازرگانیەكان لە سەدەكانی ناوەڕاستدا)، ساڵی ١٨٩١ دكتۆرای هابیل (واتە دكتۆرای زانستی) لە سەر (مێژووی كشتوكاڵی ڕۆمانی) وەرگرت. ئەم بڕوانامەیە یارمەتی دا بۆ ئەوەی بە پلەی مامۆستا لە زانكۆی فرایبۆرگ دابمەزرێت. لەبەر نێوبانگی زۆری زانستی و بە هۆی نوسین و لێوەشاوەیی زانستی و باش وانەوتنەوەیەوە، وەكی مامۆستایەك گوازرایەوە بۆ زانكۆی هایدڵبرگ و دواتر بۆ هەریەك لە زانكۆی فرانكفۆرت و بەرلین، لەو جێگایانەدا

وانەکانی کۆمەڵناسی و مێژووی ئابوری و کۆمەڵایەتی و یاسای دەوتەوە.

لەو ماوەیەی لە زانکۆدا مایەوە، توانی بەرهەم گەلێکی گرنگ دەربارەی کۆمەڵناسی بڵاوبکاتەوە کە رۆڵێکی گەورەی لە گەشەپێدان و فۆرمەلەکردنی تیۆریای کۆمەڵناسی هاوچەرخدا بینی.

گرنگترین دانراوە کۆمەڵایەتی و ئابوریەکانی بریتین لە:

١-تیۆری رێکخستنی کۆمەڵایەتی و ئابوری.

٢-مێژووی ئابوری لە ئەوروپا.

٣-مێژووی کۆمەڵایەتی لە ئەوروپا.

٤-میتۆدی زانستە کۆمەڵایەتیەکان.

٥-شار.

٦-مۆراڵی پرۆتستانیەت و رۆحی سەرمایەداری.

٧-ئاین لە هندستان.

٨-ئاین لە چین.

٩-ئاین لە یابان.

١٠-کۆمەڵناسی ئاین.

١١-ئابوری و کۆمەڵگەو ئاین.

١٢-دەسەڵاتی سیاسی.

١٣-چەمکە بنەڕەتیەکانی کۆمەڵناسی.

١٤-ئاقارە سەرەکیەکانی فیکری کۆمەڵایەتی.

لە رێگای ئەم بەرهەمە گرنگانەوە "ماکس ڤیبەر" توانی چارەسەری چەندین مەسەلەی کۆمەڵایەتی بکات، لەم ڕووەوەش لێهاتووی خۆی لە شیکارگەری مەسەلەکان و وردبینی زانستی بۆ دیاردەو پرۆسە کۆمەڵایەتیەکان سەلماندو نیشانی دا کە چ توانایەکی هەیە بۆ لێک جیاکردنەوەی ڕاستیەکان لە بەهاکان، هەروەها دروستی میتۆدەکەیی و ڕەسەنایەتی ئەو دەرەنجامانەی لەو بوارەدا بەدەستی هێنابوو، لەگەڵ پێکەوە گرێدانی نێوان دیاردە گۆڕاوەکان بە شێوەیەکی گونجاوو کەشفکردنی یاسا سەراپاگیرەکان دەربارەی کۆمەڵگەو مێژووی کۆن و هاوچەرخی کۆمەڵگاکان، دوپات کردەوە.

دەکرێت ئەو دەسکەوتە فکری و زانستی و میتۆدیانەی "ماکس ڤیبەر" لە بواری کۆمەڵناسیدا بەدەستیهێنان و بەشداریەکی کاریگەریان لە گەشەپێدان و فراوانکردنی ئاسۆی بیرکردنەوەو زیادکردنی توانای شیکارگەری و توێژینەوەی ئەودا هەبوو، لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە:

١-لێکۆڵینەوە لە چەمکی کۆمەڵناسی و جۆرەکانی ڕوداو و ڕەفتاری کۆمەڵایەتی.

٢-دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان ئاین و ئابوری.

٣-خاوەنی میتۆدێکی زانستی بوو لە توێژینەوەو ڕاڤەکردندا.

٤-تاوتوێکردنی دیاردەی بیرۆکراسیەت.

٥-لێکۆڵینەوەکانی دەربارەی جۆرەکانی دەسەڵاتی سیاسی.
٦-لێکۆڵینەوەکانی لەمەڕ چینە کۆمەڵایەتیەکان و ململانێی چینایەتی.

لێرەدا زۆر بە کورتی تیشکێك دەخەینە سەر دیدو بۆچونی "ماکس ڤیبەر" سەبارەت بە پەیوەندی نێوان ئاین و ئابوری. مەبەستی سەرەکی "ڤیبەر" لە دانانی کتێبی (مۆراڵی پرۆتستانتیەت و ڕۆحی سەرمایەداری) بۆ تەئکید کردنەوە بوو لەو ڕۆڵە گرنگەی فاکتەری ئاینی یاخود ڕوحی لە پێشکەوتن یان دواکەوتوویی ئابوری هەر کۆمەڵگەیەکدا دەیگێڕێت، چونکە ئاین بەلای "ماکس ڤیبەر"ەوە دینامۆی سەرەکی ئەو چالاکیە ئابوری و بەرهەم هێنانەیە کە کۆمەڵگە پێیان هەڵدەستێت. ئەم تێزەو تیۆرانە تەواو بە پێچەوانەی ئەو بیروبۆچونانەی "کارل مارکس"ەوەن کە جەخت لەسەر بایەخ و گرنگی فاکتەری ئابوری دەکەنەوە کە شوێن پەنجەی خۆی لەسەر سەرخانی کۆمەڵگە دیاری دەکات، وەك کایەی (ئاینی و ترادسیۆن و سیاسی و فەلسەفیو.. هتد).

ئەو بیروبۆچونە مادیەی "مارکس" لە ماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا خستیە ڕوو، پەرچەکرداری زۆری دروستکرد. هەندێکیان بێلایەن و هەندێك لەگەڵیداو هەندێکی کەش بەرپەرچیان دایەوەو کەوتنە ڕەتکردنەوەی ئەو بۆچونانە.

"ماکس ڤیبەر" سەرمەشقی ئەو قوتابخانەیە بوو کە دژ بە تێزە مادیەکانی "مارکس" بوو. لەبەرئەوە کتێبی (مۆراڵی پرۆتستانتیەت و ڕۆحی سەرمایەداری) مەبەستی زەقکردنەوەی دوو خاڵی سەرەکیە:

یەکەم/ بەرپەرچدانەوەی دیدو بۆچونەکانی ماتریالیزمی مێژوویی "مارکس"ە.

دووەم/ تەئکیدکردنەوە لەسەر ئەوەی فاکتەری ئاینی و ڕۆحی کاریگەریی لەسەر چالاکیە ئابوریەکان دروست دەکەن و ئاڕاستەی بەرهەم هێنانیان و پلان و ئامانجەکانیان دیاریدەکەن.

### سەرچاوە

الدكتور احسان محمد حسن- موسوعة علم الاجتماع، الدار العربية للموسوعات - بيروت، الطبعة الاولى، ١٩٩٩.

# ئۆریانتالیزم

• نیهاد سیریس
▪ لە عەرەبییەوە: شاد

ساڵی ١٩٦٣ "ئەنوەر عەبدولمەلیك" وتارێکی بە ناوی "قەیرانی ئۆریانتالیزم" بڵاوکردەوە، ئەم وتارە هەڵلایەکی گەورەی لەناو ئۆریانتالیستە خۆرئاواییەکاندا نایەوەو تەنانەت هەندێك لەوان بیدەنگییان شکاندو کەوتنە وەڵامدانەوەی ئەم وتارەی پیی وایە ئۆریانتالیزم لە قەیرانیکی ئەخلاقیدایە، لەبەرئەوەی هاوشانی ئەو شاڵاوە ئیستعماریە بوە کە خۆرئاوا لە وڵاتانی خۆرهەڵاتدا ئەنجامی دا. دوای ئەوەو لە ساڵی ١٩٧٨ "ئیدوارد سەعید" کتیبە بەناوبانگەکەی




(ئۆریانتالیزم)ی بڵاوکردەوە، ئیتر لەوکاتەوە کیشەی نیوان لیکۆلیارو زانا خۆرهەڵاتیەکان لەلایەك و ئۆریانتالیستەکان لە لایەکی تر لە قولبوونەوەدایە.

ئەگەرچی وەڵامی ئۆریانتالیستەکان بۆ وتارەکەی "عەبدولمەلیك" بە شیوەیەکی لوتبەرزانە بوو، تیایدا پرسیاریان لەوە دەکرد کە خۆرهەڵاتیەکان ئەلتەرناتیڤیان بۆ لیکۆلینەوە ئۆریانتالیستیەکان چییە؟ یان دەیانوت زانایانی عەرەب و

موسڵمانان میتۆدی زانستی پێویست شك نابەن، بۆ ئەوەی بکەونە لێکۆڵینەوە لە مێژووی خۆیان و کۆمەڵگەکانیان (وەك ئەوەی لە خۆرئاوادا هەیە)، بەڵام لە دوای بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی "ئێدوارد سەعید"ەوە ئۆریانتالستیەکان کەوتنە بەرگریکردن لە پرۆژەکەیان.

"مەکسیم ڕۆدنسۆن" بە یەکێك لە گرنگترین ئۆریانتالیستیە خۆرئاواییەکان دادەنرێت و کەسێکی زۆر ناسراوە لە وڵاتانی ئێمەدا، لێکۆڵینەوەیەکی ئەم پیاوە لەژێر سەردێری (هەلومەرجی ئۆریانتالیزمی تایبەت بە ئیسلامۆلۆژیا: دەسکەوت و گیروگرفتەکانی) سەرنجی ڕاکێشام. ئەم لێکۆڵینەوەیە "هاشم سالح" کردویەتی بە عەرەبی و لە کتێبی "ئۆریانتالیزم لە نێوان هەوادارانی و نەیارانیدا) بڵاوی کردۆتەوە. تیایدا "ڕۆدنسۆن" ئەو هەوڵە گەورانە ئەژمار دەکات کە ئۆریانتالیستە کلاسیکیەکان پێی هەستاون، بۆ ئەوەی ئۆریانتالیزم بگاتە ئەو ئاستەی ئەمڕۆی.

پێشتر مێژووناسی ئەوروپی بە تەنها بە لێکۆڵینەوەی هەردوو شارستانیەتی یۆنانی و ڕۆمانیەوە خەریکبوو، بەڵام بە هاتنی سەردەمی ڕۆشنگەری هەریەك لە شارستانیەتی ئیسلامی و چینیش هاتنە پاڵ، بەمەش ئاسۆی لێکۆڵینەوە ئینسانیەکانی فراوانتر بوو.

بە بڕوای "ڕۆدنسۆن" ئەوروپییەکان بە پشکنین و تاوتوێکردنی مێژووی شارستانیەتی عەرەبی-ئیسلامی کارێکی مەزن و ئێجگار گەورەیان ئەنجامداوە، لەم پێناوەشدا زانایەکی زۆریان (کە ئەوکات زۆربەیان لە زانایانی زمانەوانی بوون) ڕەوانەی خۆرهەڵات کردو ئەوانیش دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی دەستنووسە عەرەبیەکان، پاشان هەستان بە پۆلێنکردن و لیست بەندی و وەرگێڕانیان.

واتە یەکەمین دەستەی ئۆریانتالیستەکان هەستان بە کۆکردنەوەی بڕێکی زۆری زانیاری و تۆمارکردنیان، دوای ئەوەو لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە دەستیاندایە تاوتوێکردن و لێکۆڵینەوە لەو زانیاریانە بۆ گەیشتن بە قۆناغی تیۆریزەکردن. ئێمە لای خۆمانەوە دان بە بەهای ئەو ئەرکە مەزنەدا دەنێین کە ئۆریانتالیستەکان لە لێکۆڵینەوەی مێژووی شارستانیەتی عەرەبی-ئیسلامیدا کێشاویانە.

"ڕۆدنسۆن" دەڵێت: (هاندەری سەرەکی لەم پرۆسەیەدا مەبەستێکی زانستی بوو، بەڵام ئیعتراف بەوەش دەکات -لێرەدا لەگەڵ ئێدوارد سەعید یەکدەگرنەوە- کە ئەو مەسەلەیە مەیلێکی ڕەگەزپەرستانەی ئەوروپیانەی تێدا بووە بەرامبەر بەو میللەتانەی بابەتی لێکۆڵینەوەکان بوون،

واتە ئۆریانتالیزم لە مەیلی ئەورووپا مەرکەزیانە خاڵی نەبوە).

گرنگترین شتێك لەم مەسەلەیەدا ئەوەیە، "ڕۆدنسۆن" و کەسانی دیکەش دان بەوەدا دەنێن کە وڵاتانی ئەورووپایی و حکومەتەکانیان تەنها پەرۆشی لایەنی زانستی ئەو زانیاریانە نەبوون کە زاناکانیان لە وڵاتانی خۆرهەڵاتدا کۆیان کردبووەوە، بەڵکو سودیان لەو زانیاریانەش وەرگرت بۆ پەلاماردانی ئەو وڵاتانەو داگیرکردنیان. بوونی ئەو (زانیاری و لێکۆڵینەوە زمانەوانی و ئەنترۆپۆلۆژی و فیقهی و فەلسەفی و ئەدەبی.. هتد)، لەسەر وڵاتانی خۆرهەڵات هاندەرێکی بەهێزبوون بۆ ئەوەی وڵاتانی ئەورووپی بتوانن دەست بەسەر ئەو وڵاتانەدا بگرن و بە درێژایی چەندین سەدە خێرو بێریان بۆ خۆیان بەرن. ئەگەر ئەوان لە قەیرانێکی ئەخلاقیدا بن، ئەوا ئێمە لە بەرامبەر هەوڵ و چالاکیەکانی ئەواندا بێ چارەو دۆش داماوین: ئەو زانیاریانەی ئەوان چۆن وەسف بکەین کە وەکی گەڕیدەیەك هاتونەتە وڵاتی ئێمەوە؟ ئایا ئەوانە کۆمەڵێك سیخوڕ بوون کە لە پێناو خۆئامادەکردن بۆ کۆڵۆنیالیکردنی وڵاتەکانمان سەرقاڵی کۆکردنەوەی زانیاری بوون بۆ حکومەتەکانیان، یاخود وەکی کەسانێکی زانا حسابیان بۆ بکەین و بە چاوی ڕێزەوە لە کارەکانیان بڕوانین، وەك "بۆرکهارت" کە شاری (البتراء) و شوێنەوارەکانی (أبی سمبل)ی دۆزیەوە، ئەگەرچی ئەوەی دەدرێتە پاڵ کە ئەمیش کاری بۆ بەرژەوەندی حکومەتی بەریتانیا کردوە؟

داخۆ هێندە بەسە بڵێین ئێمە نەتەوەیەکین خاوەن شارستانیەتێکی دێرینین و پێویستە تەنها بە لێکۆڵینەوەی مێژوییەوە خەریك بین، یاخود دەبێت باس لەوە بکەین کە ئێمەش لەو میللەتانەین خواستی ئەوەمان هەیە جێگایەکی شیاو بە خۆمان لەم جیهانەدا هەبێت و دەرباسی ئەوەین داهاتویەکی چاکترمان هەبێت؟

# پەیامێك بۆ بۆرخس

-ئێستا ساتی هەرەسی ئایندەیە لە ڕابردوودا-

• سوزان سۆنتاگ
▪ لە عەرەبییەوە: ئازاد

ئازیزم بۆرخس:

لەبەرئەوەی ئەدەبەکەت هەمیشە لەژێر دروشمی نەمریدایە، بۆیە سەیر نییە ئەم پەیامەت ئاراستە بکەم، (بۆرخس، وا دە ساڵ تێپەڕی) گەر قەرار بێت هاوچەرخێتی ئەدیبێك نەمر بکات، ئەوا تۆ بە ڕادەیەکی زۆر نوێنەری چاخ و کەلتوورەکەتیت و، دەزانیت چۆن بە ڕێگایەکی سیحراوی، کە هێشتا ئەم وەسفەش کەمە، چاخ و کەلتوورەکەت تێپەڕێنیت و، ئەمەشت بەوپەڕی کرانەوەو وریاییەوە ئەنجام دەدا.


بۆرخس

تۆ لەناو نووسەرەکاندا، لە هەموویان کەمتر خۆپەرست و لە هەموویان زیاتر ڕوون و شەفاف بوویت، هەرچۆن لە هەموویان هونەرمەندتریش بوویت و ئەمەش لە سامالێکی سروشتی ڕۆحتەوە سەرچاوەی دەگرت. گەرچی ماوەیەکی زۆریش لە ناوماندا ژیایت بەڵام زۆر هەستیار بوویت و لە گۆشەگیریشدا کارامە بوویت، ئەو گۆشەگیرییەی کردتی بە پسپۆر لە سەفەرە زەینیەکانتدا بۆ چاخەکانی تر.

هەستکردنی تۆ بە زەمەن زۆر جیاوازە لە هەستکردنی ئەوانی دی، بیرۆکە ئاساییەکانی رابردو و ئیستا و ئایندە لای تۆ بیرۆکەی هیچن و تۆ ویستت رایبگەیەنیت کە هەر چرکەساتیك لە چرکە ساتەکانی زەمەن لە یەك کاتدا رابردوو و ئیستاش لەخۆ

دەگرێت. بۆ ئەمەش ئەو دێڕە شیعرەی "براونینگ"ی شاعیرت بە نموونە دەهێنایەوە (وەك ئەوەی بە بیرم بێت) کە دەیوت: "ئێستا چرکەساتی هەرەسی ئایندەیە لە ڕابردوودا".

ئەمەش بێگومان هەر بەشێك بوو لە خۆ بە بچووك زانین (تەوازوع)ت، حەزت دەکرد لە بیروبۆچوونی نووسەرانی تردا بیروبۆچوونی خۆت بدۆزیتەوە.

ئەو خۆ بە بچووك زانینەت بەشێك بوو لە جەخت کردنەوە لەسەر بوونت. هەمیشە شتی خۆش و سەرنج ڕاکێشت دەدۆزییەوە. بەدبینی وەك سافی قوولە، لەبەرئەوەی تۆ پێویستت بەوە نییە ببیتە کەسێکی کینە لە دڵ و تۆڵەسێن. بەڵکو تۆ دەتەوێ ببیتە داهێنەر -سەرەڕای هەموو شتێك تۆ داهێنەر بوویت. ئەو سافیی ڕۆحەو ئەو باڵایی دەروونەی پێی گەیشتبوویت بۆ من شتێکی ئایدیال (نموونەیی) بوو.

هەروەها تۆ ئەوەت ڕوون دەکردەوە کە پێویست ناکات بەدبەخت بیت، تەنانەت گەر مرۆڤ ڕێك و ڕاست بێت و فریودەر نەبێت..

ڕۆژێکیشیان وتت کە نووسەر -دواتر بە ناسکییەوە وتت هەموو کەسێك- دەبێ بگاتە ئەو باوەڕەی کە هەرچییەکی دێتە ڕێ تەسەللایە. (لەمەدا مەبەستت لە کوێرییەکەی خۆت بوو). تەسەللایەکی زۆرت بۆ نووسەرانی دی دۆزییەوە.

لە ساڵی ١٩٨٢دا -واتە ٤ ساڵ بەر لە کۆچی دوایی- لە دیدارێکدا لەگەڵ مندا وتت "ئێستا نووسەرێکی زیندوو نییە جگە لە بۆرخس کە نووسەرانی دی هێندە بایەخی پێ بدەن. زۆربەی خەڵکی دەڵێن "گەورەترین نووسەری زیندووە.. کەم نووسەری ئەمڕۆ هەیە شتی لێوە فێر نەبووبێت یان لاسایی نەکردبێتەوە".

تا ئێستاش ئەمە ڕاستە. ئێمە هێشتا هەر لە تۆوە فێردەبین. هێشتا لاسایی تۆ دەکەینەوە. شێوازی نوێت بە خەڵکی بەخشی بۆ لاساییکردنەوە، لە کاتێکدا جار دوای جار ئەوەت دووپات دەکردەوە کە ئێمە قەرزاری ڕابردووین و، لە سەروو هەموو شتێکیشەوە قەرزاری ئەدەبین. وتت ئێمە لە هەموو شتەکانماندا و بەوەی هەین و بەوەی دەیبین قەرزاری ئەدەبین. گەر کتێب نەمێنێت مێژووش نامێنێت و، ئادەمیزادیش نامێنێت.

منیش لەو یەقینەی تۆ دڵنیام. کتێبەکان بە تەنها چەندێتییەکی چۆنێتییانەی خەون و بیرەوەرییەکانمان نین. بەڵکو نموونەیەکمان بۆ باڵابوونی دەروون پێ دەبەخشن. هەندێ کەس خوێندنەوە بە جۆرێك لە ڕاکردن دەزانن، ڕاکردن لە ژیانی "ڕاستەقینەی" ڕۆژانە بۆ دونیایەکی خەیاڵی، دونیای کتێبەکان. بەڵام کتێب لەوە زۆرترە. کتێب ڕێگایەکە بۆ زیاتر بوون بە ئینسان.

بە داخەوە ناچارم پێت ڕابگەیەنم کە ئێستا کتێب

دەخرێتە خانەی جنسە قرتێکەوتووەکانەوە. هەر کتێبیشە، مەبەستم لە هەلومەرجی خوێندنەوەیە، کە وا لە ئەدەب دەکات کاریگەریی ڕۆحی هەبێت.

بەم دواییانەش پێمان وترا کە ئێستا دەتوانین لەسەر "شاشەکانی کتێب" هەر "دەق"ێکمان دەستبکەوێ کە پێویستمان پێیەتی (مەبەست لە ئینتەرنێتە -و-) و دەتوانین ڕواڵەتی بگۆڕین و پرسیاری لە بارەوە بکەین و، بەڵکو لەگەڵیشیدا "کارلێك" بکەین.

کاتێ کتێبەکان بە تەنها دەبنە کۆمەڵێك "دەق" کە دەتوانین بەپێی پێوانەی سوود "کارلێك"یان لەگەڵ بکەین، ئەو کات وشەی نووسراو دەگۆڕێ بۆ ڕووکەشێکی تری زۆر ساکاری حەقیقەتێکی "بە تەلەفزیۆن کراو" کە ڕیکلام بەڕێوەی دەبات. ئەمەیە ئەو پاشەڕۆژە بەرزە داهێنەرەی بەڵێنیان پێ دابووین وەکو شتێکی "دیموکرات" تر بماندەنێ. بێگومان ئەمەش چ ناگەیەنێت جگە لە بەچنگهێنانی مەرگ هەروەها هی کتێبەکانیش.

لەم حاڵەتەشدا پێویست بە ئاگرکەوتنەوەیەکی گەورە ناکات. بەربەرەکان کتێبەکان ناسووتێنن، پڵنگەکەش لە کتێبخانەکەدا دەمێنێتەوە. بۆرخسی ئازیزم، تکایە تێمبگە کە ئەمە هیچ مەیلێکم بۆ سکاڵا لا دروست ناکات، بەڵام سەبارەت بە سکاڵا لە بارەی چارەنووسی کتێب -و خوێندنەوەوە- کەسێکی دی لە تۆ باشتر شك نابەم تا ڕووی قسەمی تێ بکەم؟

(بۆرخس، وا دەساڵ تێپەڕی!) هەموو ئەوەی مەبەستمە بیڵێم ئەوەیە کە بیرت دەکەین.. بیرت دەکەم. لە کاتێکا تۆ لەسەر جیاوازبوونی خۆت بەردەوامیت. ئەو چاخەی ئێستا چووینەتە ناوی، سەدەی بیست و یەك، بە زۆر ڕێگای جیاواز ڕۆح تاقی دەکاتەوە. بەڵام دڵنیابە کە هەندێکمان دەسبەرداری کتێبخانە گەورەکە نابین و تۆش وەك پشتیوان و قارەمانمان دەمێنیتەوە *.

*خانم سوزان سۆنتاگ لە ساڵی ١٩٣٣دا لە نیویۆرك هاتۆتە دونیاوەو وێنەیەکی جیاوازی ڕۆشنبیری ئەم سەردەمەمانە. بابەتی جۆراوجۆر دەنووسێت: فۆتۆگراف، شۆڕش، ئایدز، ئیستاتیکای ڕەخنەو هونەری هاوچەرخ، دەروونناسی و فەلسەفە، بیروباوەڕەکان و ئازادی، لێکدانەوەو مۆسیقا. کۆمەڵە چیرۆکێکی هەیە بە ناوی (من و هتد..) چەند ڕۆمانێکی هەیە: چاکەکار، گرێی مەرگ، عاشقی گرکان، لە ئەمریکادا. جگە لەوەی چەندین سیناریۆی سینەمایی نووسیوەو پتر لە فیلمێکی ئەزموونکاری دەرهێناوە. ئەم نامەیەشی بۆ بۆرخس بەشێکە لە کتێبی "کاتێ نیگەرانی دەنوێ" کە لە دێسەمبەری ساڵی ٢٠٠١دا چاپ کراوە.

## سەرچاوەی ئەم وتارە

العدد (١٢٢) من (بيان الثقافة)
الصادر في ١٢ مايو ٢٠٠٢.

# شیعرو میژوو

• ئۆکتاڤیۆپاز

▪ لە ئینگلیزییەوە: ئەدیب نادر

هەر تاقە شیعریك کۆششیکە بۆ ئاشتی دان بە شیعرو میژوو، لە پیناوی سودو کەلکی شیعردا. شاعیر هەمیشە لە پەیجۆری ئەوەدایە کە خۆی لە زۆرو ستەمی میژوو حەشاربدات هەتا کاتیك خۆیشی لەگەڵ ئەو کۆمەلگایەدا دەناسینێ کە تیایدا زیندەگی وەسەر دەبات، کاتیکیش لەوەدا کە بە "رەوتی زەمان" ناودەبریت هاوبەشی دەکات -هەتا لە روداویکی توندرەو کە لە دنیای هاوچەرخدا کەمتر و کەمتر وینا دەکریت. هەموو ئەزموونە شیعریە مەزنەکان -لە



ئکتاڤیۆپاز

فۆرمیولای جادویی و داستانە شیعرەوە هەتا نوسینی ئۆتۆماتیکی- ئەوە رادەگەیەنن کە شیعریان وەکو بۆتەیەك بۆ شیعرو میژوو بەکاربردوە، واقیع و ئەفسانە، گفتوگۆیی و

ویناگەری، رۆژگارو کەرنەڤالیك کە هەرگیز نابیت دووپات بیتەوە، زەمانیك کە زیندوەو بەپیتییەکی نهینی پیبەخشراوە، هەرگیز گەرانەوە هەتا چەرخیکی نوێ ئاوەڵا بکاتەوە. سروشتی هەر شیعریك پیوانە هەلگرە دەگەل سروشتی هەر کەرنەڤالیکدا، چونکە سەرباری ئەوەی بەرواریکە لە رۆژژمیردا، هەروەها پچرانیکیشە لە بەردەوامی زەمان و هیرشی زەمانی حالیکیش کە بەبێ دوینێ یانێ سبەینێ بەدوی یەکدا هاتوو دەگەریتەوە.

هەر شیعرێك كەرنەڤاڵێكە، پەیامهێنی زەمانێكی بێگەردە.

پەیوەندی نێوان خەڵك و مێژوو پەیوەندی كۆیلایەتی و وابەستەییە. چونكە ئەگەر تەنها ئێمە دۆستی مێژوو بین، كەرەستەی خاوی ئەو و قوربانیەكانیشی هەر ئێمەین: ئەویش تەنها بە هەوڵی ئێمە دەتوانێت بێتەدی. شیعر گۆڕانێكی بنەڕەتی بەسەر ئەم پەیوەندییەدا دەهێنێت؛ ئەویش تەنها بە هەوڵی مێژوو دەتوانێت وەدی هاتن دەستەبەر بكات. هەر هەموو بەروبوومەكانی پاڵەوان، ئیغتیال كەر (پیاوكوژ)، ئەڤیندار، چیرۆكی ڕەمزی، تەڵەزمی نوسینە هەڵكۆڵراوەكان، گوزارشتێكی دووپاتكراو، سوێند؛ هاوارێكی بەدەر لە ویستی سەرلێوی زارۆڵەیەك لە ئانی گەمەكردندا، تاوانباری مەحموم كراو، كیژۆڵەیەك كە بۆ یەكەمین جار پەراوەی سێكس دەكات؛ دەربڕینێك كە بە دەم باوە دەكەوێت، بەشێك لە قیژەیەك، -هەموو ئەمانە شان بە شان دەگەڵ كۆڵۆنیالیزم، نوێ بوونەوەی شێواز، "ئیقتیباسی" وەرگرتنی گوزارشتێك، هەرگیز خۆیان بەدەست مەرگەوە نادەن، یاخود ناهێڵن لە دیوار بدرێن. مەبەستیانە هەتا كۆتایی بەردەوام بن، هەتا ئەوپەڕەكەی بوونیان هەبێت. ئەوانە خۆیان لە هۆو سەرەنجام ڕەها بكەن. چاوەڕێی ئەو شیعرەن كە ڕزگاریان دەكات و هەروایش دەیانسازێنێتەوە كە هەن. بەبێ مێژوو شیعر ناتوانێت بوونی هەبێت، بەڵام شیعر بێجگە لە گۆڕینی مێژوو ئەركێكی دیكەی نیە. بۆیە لەم ڕووەوە تەنیا شیعری شۆڕشگێڕی ڕاستەقینە شیعری پێشبینیە.

شیعر لە هەمان كەرەستەی مێژوو زووبانی - كۆمەڵگا دروست بوە. بەڵام بەدوی دووپاتە خوڵقاندنەوەی زوبان پێ بەپێی یاساكان زیاتر لەوانەی كە بەسەر گفتوگۆو گوتاری لۆژیكی دەسەڵاتدارن. ئەم گۆڕانە شاعیرانەیە لە ناخانەترین حەشارۆچكەكانی زوباندا ڕوودەدات.

دەربڕینەكە -نەك واژەی تاكو دابڕاو- خانەكەیە، سادەترین ڕەگەزی زوبانە. واژەیەك ناتوانێت بەبێ واژەكانی دیكە بونی هەبێت، هەروەكو چۆن دەربڕینێك بەبێ دەربڕینەكانی دیكە ناتوانێ بوونی هەبێ.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە، هەموو ڕستەیەك هەمیشە بریتیە لە پەنجەنوماكردنی ڕانەگەیەنراوێك لە یەكێكی دیكەداو، بەرپرسیاری ڕاڤەكردنەوەیە بە یەكێكی دیكە. هەر گوزارشتێك داڕێژەری "ئارەزوو بۆ گوتن"ی شتێكە، بە ڕون و ئاشكرایی ئیشارەت بە شتێكی ئەودیوی خۆی دەبەخشێت. زوبان كۆمەڵێك هێمای بزوێنەر و گۆڕەكن، كە هەریەكەیان "بەرەو ڕووی" مەبەست چوون ئیشارەت دەكەن. بەم شێوەیە هەردوو ماناو پەیوەندیكردن لەسەر نیەت و مەبەستی وشەكان بنیاتنراوە. بەڵام نەخێر شیعر زووتر لێیان دەكەوێت لەوەی كە دەگۆڕدرێنە یەكە هارمۆنیەكان

یاخود وێناکان؛ خۆبەخۆ ڕادەوەستن و خۆیان قایل بوون بە خۆیان دێنن. وشەکان لەناکاو جولانەوەی خۆیان لەدەست دەدەن؛ لە پەخشاندا بۆ گوتنی پەیجۆرێك ڕێگاگەلێکی جۆراوجۆر هەن؛ لە شیعردا تەنها تاقە ڕێیەك هەیە. وشەی شیعری هیچ جێنشینێکی نیە. ئارەزوویەك نیە بۆ گوتنی شتێك، بەڵکو شتێکە بە جۆرێکی لە گۆڕان بەدەر وتراوە. یاخود لە ئاڵەکی دیکەوە نە "چوونە بەرەو ڕووی" شتێك و نەیش "دوانە" لە بارەی ئەمەوە یاخود ئەوەوە. شاعیر لەبارەی ترس یاخود عیشقەوە نادوێت، ئەو دەیانخاتە بەرچاو. وشەکانی شیعر کە نەگۆڕەك و بێ جێگیرن تەنها لە حاڵوباری خۆیاندا نەبێت بێ ڕاقەو مەحاڵیش دەبن. مانای ئەوان چیدی لەودیوەوە نیە، بەڵکو لەنێو خۆیاندایە؛ وێناکە لە "ناواخنی" ماناکەدایە.

ئەرکی ڕاستەقینەی وێنای شیعری بەخشینی یەکێتیە بە هەقیقەت گەلێك کە بۆ ئێمە دژ بەیەك و لە سادەیی بەدەر وەدیار دەکەون. ئەم کردارەیش بەبێ لە بەینبردن یاخود قوربانی کردنی دژ بە یەکەکان و دژایەتیەکانی میان بوونەکان کە پاڵنەرو "دنەدەر" و خوڵقێنەرەوەیە ئەنجام وەخۆ دەگرێت. هەر لەبەرئەوە وێنای شیعری لە تێگەی ڕاستەقینەی وشەوە بەدەرە لە ڕوونکردنەوە. ئێستا زوبانی شیعری هاوبەشی لە تەمومژێکدا دەکات کە دەگەڵیدا واقیع خۆی بۆ ئێمە دەردەخات. لە شێوەگۆڕکردنی زوباندا، وێنا نەك تەنها دەرگا بە ڕووی واقیعدا ئاوەڵا دەکاتەوە، هەروەها، هەروەکو بوە، واقیعیەت ڕوت و ڕەجاڵ دەکاتەوەو لە یەکێتییە دواینەکەی خۆیدا نیشانی ئێمەی دەدات. دەربڕینەکە دەبێتە وێنایەك. شیعر یەك تاقە وێنایە، یاخود کاکێشانی وێناگەلێکی لێك نەترازاوە. ئەو بۆشاییەی کە لەلایەن ونبوونی ئەوەی کە ئێمە پێی دەڵێین ڕاستی تژی دەکات لە حەشاماتی کۆمەڵێك لە تێرامانی نەگونجاو، لە دواییدا بەدووی چارەسەری ناهارمۆنی ئەوانەوە بەرەو سیستەمێکی هەتاوئاسای کنیایات: شیعرەکەیش کە بوونەوەرێکە لە نادیاریدا، دەگەڕێت، وشەگەلێکی گەندەڵ ئامێز کە هێشتا دەتوانن هەڵایسێن و بسووتێن هەر ئان و ساتێك کە لێو هەبێت لەگەڵیاندا پەیڤان بەرپا بکات. لەکاتی دیاریکراودا، لە زاری هەندێك لە بێژەوانەکانەوە، ڕەوڕەوەی دەربڕین دەبێتە سەرچاوەیەك لە بەڵگەی ڕاستیەکان کە پێداویستی بەدەرخستن نییە. ئەوکاتە ئێمە بۆ نێو کاملێتی زەمان دەگوازرێینەوە. بەدەست بەسەرداگرتنی زوبان هەتا ئەوپەڕی شاعیر دەیگەیەنێتە بالایی. بە پێداگری لەسەر مێژوو، ئەو ڕووت هەڵیدەگێڕێ و هەرچییەکە زەمان ئاوا دەریدەخات.

کاتێك کە مێژوو پێمان ڕەوا دەبینێت کە گومان لەوە بکەین کە ڕەنگە لە کاروانی تارماییەکان بەولاوە شتێکی تر

نەبیت، بەدەر لە مانا یاخود بی كۆتایی، تەم و مژی زوبان پێ بەپیی ئەمە دیاریكراوتر دەبیت و دەبیتە ریگری هەموو دایەلۆگیكی رەسەن. وشەكان مانای خۆیان ون دەكەن و، بەم شیوەیە هیزی گەیاندنی خۆیشیان لەدەست دەدەن. دانگەریزە كردنی میژوو بۆ نیو بەدوایەكدا هاتوویەكی پەتی روداوەكان، هەروا دانگەریزە كردنی زوبانیشی تیوە دەگلینێ بۆ كۆمەلەیەك لە هیما بیگیانەكان. سەرجەم خەلكیش هەمان وشەگەل بەكاردەبەن؛ بەلاّم ئەوانە لە یەكدی حالی نابن. بێ كەلكیشە كە خەلكی هەول لەسەر مانای وشەكان بدەن كە "بگەن بە جۆرە هاوگونجانیەك". زوبان پرۆتۆكۆلیك نیە، بەلكو رەهەندیكە كە مرۆڤ ناتوانیت لیی جودا ببیتەوە. گشت وتەیەكی سەرەرۆیی سەراپاگیرە؛ مرۆڤ سەرلەبەری خودی خۆی و ژیانی خۆی لەسەر تاقە وشەیەك دەخاتە (مەترسییەوە).

شاعیر ئەو مرۆڤەیە كە بوونی پەتیی دەگەڵ وشەكانیدا هاوجووت دەبن. لەبەرئەمە، تەنها شاعیر دەتوانیت دایەلۆگیكی نوێ بهینیتە كایەوە. چارەنووسی شاعیر، بە تایبەتی لە سەردەمیكی وەكو هینەكەی ئیمەدا، ئەوەیە كە "مانایەكی پاقژتر بە واژەكانی خیل بدات". ئەمە ئەوە رادەگەیەنێ كە وشە لە زوبانی ئاساییدا ریشەكیش كراوەو لە شیعریكدا هینراوەتە لەدایكبوون. ئەوەی بە هیرمەتیسیزمی شیعری هاوچەرخ نیودەبریت هەر لەو راستییەوە سەرهەلدەدات. بەلاّم وشەكان جودا نەبوەوەن لە مرۆڤ. لە ئاكامدا، چالاكی شاعیرانە لە دەریی بوونی شاعیردا، لە شتیكی ئەفسوناویدا كە شیعر دەریخستوە، ناتوانیت رووبدات؛ لە بریدا مرۆڤ خۆی هەلدەبژیریت وەكو ناوكۆیی ئەزمونەكەی خۆی. دژبەیەكەكان نەك بە تەنها لە شیعردا، بەلكە لە مرۆڤ خۆیشیدا، یەكانگیردەبن. ئەم دوانە جودایی نەخوازن. شیعرەكانی رامبۆ رامبۆ خۆین و ئەو تولاّزەی بە كفربیژی گەلیكی درەوشەدار تەیمان كراوە، ویرای ئەو هەموو تەقالایانەی دراون بۆ ئەوەی ئاوەژووی بكەنەوە بۆ چەشنە درندەیەك كە وشە بەسەریدا هاتوەتە خوارێ. نەخیر، شاعیر و وتەی خۆی یەك شتن. دروشمی گەورەترین شاعیرانی شارستانیەتی ئیمە، بە دریژایی سەد سالی رابردوو، ئا ئەمە بوە. چەمكی ئەو دوایین بزوتنەوە مەزنەی سەدەیش– سوریالیزم– بە هیچ شیوەیەك لەمە جیاوازتر نەبوە. بایەخی ئەم هەموو كۆششانەیش -كە هیچ شاعیریك شایستەی ئا ئەو ناوە بیت ناتوانیت بیلایەن بیت– لەو هەولەدا پەنهانە كە بۆ لەناوبردنی یەكجاری و بۆ هەمیشە، لە رەنجەرۆیشدا، ئەو دوالیزمەیش كە لیكمان دابر دەكات. شیعر یا بەنیو پیواریدا هەلپە دەكات، یانی خۆ ناچیزە.

لـــە هەلومەرجـــەکانی ئێســـتادا، لەوانەیـــە بێمانـــا بەدیاربکـــەوێت ئەگـــەر پەنجـــەنومای ڕاگەیاندنـــە بێماناکـــانی شـــیعر بکرێـــت. هـەرگیز دەسـتەلاتی مێـژوو لـە ئێســـتای مـــەزنتر نـــەبوە، پاڵەپەستۆی "ڕوداوەکان"یش هەرگیز ئە ئاوا خنکێنەر نەبوە. پێبـەپێی ئەمـە زوڵـم و زۆری "پاشـان چـی دەبـێ بکرێـت" پترویـتر لـە بەرگـەگرتن وەدەر دەبێت -لەو دەمەی قایلبوونی ئێمـە بـۆ ئـەم کاروبـارە سەنگوسووژی دەگەڵدا نەکراو، لـەو دەمـەوەی کـە کـەموزۆر هەمیشـــە بـــەرەو ڕووی خاپورکاریـــەکانی مـــرۆڤ ئاراستەکراوە– لەم ڕوەوەیە کە جموجوڵـی شـاعیرانە نـهێنی ئـامێزترو، گۆشـەپەرێز تـرو، دانسقەتر دەبێت. تەنها دوێنێ بـوو، بـۆ نوسـینی شـیعرێك، یاخود گراوی بوون بە چالاکی گەلێکی نوغرۆکەرانە دادەنران، ســازش کردنــی پەیوەندیــە کۆمەلایەتیـــەکان بـــە خســـتنەڕووی کەســـایەتیە دوفاقانەکـەی. ئـەمڕۆ، خـودی بیرۆکـەی پـەیوەندی لـە بـەین چوەو، شوێنەوارەکەی لەلایـەن کۆمـــەڵێك لـــە هێزەکـــان، جەماوەرەکان و، بەرگرییەکاندا دەســتی بەســـەردا گـــیراوە. واقیعیـەت دەمامکـەکانی خـۆی وەلانـــــاوەو کۆمـــــەڵگای هاوچـەرخیش وەکـو هەیـــە بیـــنراوە: کۆمەڵەیـــەك نـــا هاووێنـەیی شـتگەلێك کـە بـە قامچی "هاو وێنـەیی" یـاخود بە پڕۆپاگەندا، بە ڕێبەرایـەتی کۆمەڵـە تـاقمێك کە تەنـها بـە ڕادەی دڕندایـەتیان لـە یـەکدی جیادەکرێنـــــەوە. لـــــەم هەلومەرجانـــەدا، داهێنـــانی شـاعیرانە خـۆی دەخزێنێتـــە حەشـــارگاوە. ئەگـــەر هـــەر شـــیعرێك ئاهـــەنگێك بێـــت، یەکێکـــە لـــە دەرێـــی وەرزدا بەرپاکراوە، لە جێگاو بـانێکی کەم هاتووچۆدا، کەرنـەڤاڵێکی ژێرزەمینیە.

بەلام چالاکی شاعیرانە لە ڕێگای خودی ئەم پەنامەکیەوە سـەرلەنوێ هـەموو دەسـەلاتە وێرانکـەرە کـەوناراکانی خـۆی دەدۆزێتـەوە، کـە بـە ئـاڵۆش و پەنهانکاریـــەکان پیتێـــنراوە، بەرهەڵســــــتیەکە بـــــۆ قەدەغەکاریەکـــە کـــە کـــەمتر مـەحکوم نیە چونکە شـەقڵێکی دیـاریکراوی وەخـۆ نـەگرتوە. شـیعر، کـە دوێنـێ هـەڵمژینی بای ئازادە یەکێتی سەراپاگیری لێ خوازرابـــوو، بـــە جـــۆرە جادووبازییەك سـەرومڕی دەدا بـــۆ ئـــەوەی لـــە ئەفســـوون بازیـــەکانی دەســـــتەلات و ژمارەکان بمانپارێزێت. وتراوە کـــە شـــیعر یەکێکـــە لـــەو ڕێگایانەی کە مرۆڤی هاوچەرخ لـە ڕێـی ئـەوەوە دەتوانێـت بـە سەرجەمی دەستەلاتەکان بڵێت "نەخێر" کە لـە فـەرمانڕەوایی کـردن بەسـەر ژیـانی ئێمـەوە قایل نین و تەنانەت دەیانەوێت فـــــەرمانڕەوایی بەســـــەر ویژدانیشـمانەوە بکـەن. بـەلام ئەم ڕەتکردنەوەیە لەنێو خۆیدا "بـەڵێ"یـەکی هـەڵگرتوە کە لـە خودی خۆیشی مەزنترە.

۱۹۵۹

# سەرەتایەك دەربارەی ڕۆشنگەری ئەڵمانی

• هاشم ساڵح

▪ لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

لە بەراییەکانی سەدەی بیستەمدا "شەکیب ئەرسەلان" پرسیارە بەناوبانگەکەی خۆی کرد: بۆچی موسولمانان دواکەوتن و میللەتانی دیکە پیشکەوتن و بەرەو پیش چون؟ من لیرانەدا ئەم پرسیارە هەلدەگیرمەوە بۆ ئەوەی بگەمە هەمان دەرەنجام. بروا ناکەم ئەم ساتەوەختەش رۆشنبیرانی ئیمە سەرەرای ئەو هەموو هەول و تەقەللایە بۆ نویکردنەوەی فیکری عەرەبی و رەخنەگرتن لە کەلەپورو پیداچونەوە بە رابردو.. هتد، وەڵامی پرسیارەکەی "شەکیب ئەرسەلان"یان دابیتەوە. هۆکەشی ئەوەیە ئیمە بۆ ئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە، پیویستە لە یەك کاتدا هۆکاری پیشکەوتنی میللەتانی دیکەو دواکەوتویی خۆمان بزانین.

بەڵام تا ئیستا سەرباری هەندیك هەولی جدی و دلسۆزانە لیرەولەوێ، لە هیچ یەك لەو هەولانەماندا سەرکەوتوو نەبوین. من پیموایە هۆی سەرنەکەوتن هەر بە تەنها ناگەریتەوە بۆ نەبونی ئازایەتی بۆ شۆربونەوە بە ناخی شتەکاندا، بەلکو پەیوەندی بەوەوە هەیە کە بەهرەو سەلیقەی زانستی و فەلسەفیمان نییە تا بەو ئەرکە هەلبستیت.

پیویستە لە وتنی ئەم راستیە شەرم نەکەین و لە سەرلەنوێ گەرانەوە بۆ ناو پۆلەکانی خویندن لە روو دانەمینین، بۆ ئەوەی فیری شیوازی بیرکردنەوەی زانستی بین بە سەرجەم میتۆدو تیرم و کەرەستەکانیەوە. چونکە تەنها ئەوە لەبارێدایە دەستنیشانی نەخۆشیەکانمان بکات و ئەو دەردەشمان بۆ چارەسەر بکات کە بە دەستیەوە دەنالینین، ئەوەتا ئیمە تا هەنووکە نە بۆمان دەستنیشان دەکریت و نە چارەسەریش کراوە. بگرە بەم دواییانە خراپتر بوو، بە تایبەت پاش کارە تیرۆرستیەکانی یانزەی سپتەمبەر و ئەو رووداو و گۆرانکاریانەی بەدوایدا هاتن.

هەرچۆنیك بیت مەبەستی من لە رانانی میژووی رۆشنگەری ئەورووپی تەنها

تێگەیشتن نییە لە نهێنی پێشکەوتن و باڵادەستی ئەوانی تر، بەڵکو بۆ ئەوەیە بزانین کە چۆن چۆنی بیریاران لە چرکەساتێکی مێژووییدا بەرپرسیارێتی خۆیان بەرامبەر بە گەل و نەتەوەکەیان لە ئەستۆ گرتووەو چۆنیش توانیویانە دەست بخەنە سەر پەتاو نەخۆشییەکانی. پاش جەنگی سی ساڵە (١٦١٨-١٦٤٨) ئەو جەنگە ناوخۆییە ترسناکەی شارو گوندەکانی ئەڵمانیای بەسەر یەکدا ڕوخاندو بە هەزاران کەسی لە دانیشتوانەکەی لەناوبرد، حاڵی نەتەوەی ئەڵەمانی لە حاڵی ئێمە چاکتر نەبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فیکری ئەقڵانی یاخود ڕۆشنگەری لە دوای ئەو جەنگەو لەسەر داروپەردوی ئەو شەڕە هاتە ئارا. ڕەنگە هەندێك بڵێن: ئەمە دوفاقیەتێکی سەیرە.. نەخێر، دوفاقێتی نییە.. لەبەرئەوەی بە داخەوە میللەتان کاتێك تێدەگەن و حاڵی دەبن کە باجێکی گەورە بدەن. ئەم قسەیە بۆ تاکەکەسیش ڕاستە.. دەبوو ملیۆنەها مرۆڤ ببنە قوربانی جەنگێکی مەزهەبی بێئامان، بۆ ئەوەی فەیلەسوفانی ئەڵەمان بوێرن تاکە پرسیارێك لە پیرۆزییەکانی خۆیان بکەن: واتە پرسیار ئاڕاستەی ئەو تیۆلۆژیا مەسیحیە تەقلیدیە بکەن کە سەدان ساڵ بوو وەکی میراتی لە باب و باپیرانیانەوە بۆیان مابووەوە!

ڕۆشنگەری لە ئەڵمانیادا کەی دەستی پێکرد؟ لە کۆتایی سەدەی حەڤدەو لەسەر دەستی "لایبنتز" (١٦٤٦-١٧١٦" هاتە ئارا، واتە هەر دوای جەنگی سی ساڵە دەستی پێکرد. وا دیارە مرۆڤ تا ئاگرەکە نەگاتە بەر ماڵەکەی ناکەوێتە خۆی.. ئەوکات دەکەوێتە پرسیارکردن: ئەوە بۆچی ڕویدا؟ بۆچی کاتۆلیکی و پڕۆتستانتەکان کە هەردوکیان سەر بە یەك ئاینن و خاوەنی یەك کتێب و یەك زمانن، کەوتنە لەتوپەت کردنی یەکتری؟ ئایا بەدەر لەم شێوە تەقلیدیە توندڕەوەی بووە مایەی ئەو مەرگەساتە، ڕێگەیەکی دیکە شك نابەین بۆ تێگەیشتن و حاڵی بوون لە ئاین؟ لەو چرکەساتەوە ڕۆشنگەری وەکی بزاوتێکی مێژوویی تازەپێگەیشتوو فۆرمەلە بوو، کەوتە شەڕێکی قورس و درێژخایەن لەگەڵ هێزە داخراوو دۆگماتیستەکانی تیۆلۆژیای مەسیحی. پاش ئەوەی ئەوروپا ئەو شەڕەی لەگەڵ خۆیدا یەکلایی کردەوە، توانی قەڵەمبازێکی گەورە بدات و ئەمەش وای لێکرد بۆڕی تەواوی میللەتانی دنیا بداتەوە.

ڕاستە ڕۆشنگەری ئەڵمانی لە سەرەتایدا بزاوتێکی جەماوەری نەبوو، بەڵکو تەنها تایبەت بوو بە مامۆستایانی زانکۆو زانایان و گەورە فەرمانبەرانی دەوڵەت و خەڵکانی ڕۆشنبیر.. ئەوەش ڕاستە کە زۆربەی خەڵك هەر چاو لە دەستی پیاوانی کڵێسا بوون، بەڵام لە ڕێی کردنەوەی قوتابخانەو زانکۆو دەرچواندنی ڕۆژنامەو بڵاوکردنەوەی زانین و زانیاری لە ڕێی کتێبی چاپکراوەوە بە ڕێژەیەکی زۆرو لەسەر ئاستێکی بەرفراوان، ئیتر ڕۆشنگەری بەرەبەرە دەستی بە بڵاوبوونەوە کرد تا گەیشتە توێژێکی بەرفراوانی گەلی

ئەڵەمانیا. ئەم پرۆسەیە لای میللەتانی دیکەی ئەوروپاش ڕوی دا. بێگومان لە سەرەتادا ڕۆشنگەری ئەڵەمانی پاشکۆو پاشبەندی ڕۆشنگەری فەرەنسی و ئینگلیزی بوو. واتە لە لایەك قوتابی فەلسەفەی "دیكارت" بوون و لە لایەکی ترەوە خوێندکاری زانستی "نیوتن" و فەلسەفەی "جۆن لۆك" بوون.

ئەڵەمانەکان: (ڕون و ئاشکرایی میتۆدو گومان و شەن و کەوکردنی مەسەلەکانیان) لە "دیكارت"ەوە وەرگرت.

"دیكارت" پێی وابوو نابێت هیچ ڕاوبۆچون و وتەزایەك بە ڕاست بزانین تەنانەت ئەگەر هی "پاپا" و "مارتن لۆتەر"یش بن، بەرلەوەی ڕەخنەیان لێ نەگیرێ و تاوتوێ نەکرێن و بە شێوەیەکی ئەقڵانی نەپشکنرێن. لە دوای هاتنی "دیكارت"ەوە ئیتر هیچ دەسەڵاتێك سەرو دەسەڵاتی ئەقڵ ناکەوێت، بە تایبەت لەو مەسەلانەی پەیوەندیان بە کاروباری دنیایی و سیاسی و کۆمەڵایەتیەوە هەیە.

زانستی "نیوتن"یش بووە بەرزترین نمونەی هەموو زانینێکی ورد لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا. ئەی "نیوتن" ئەو یاسایانەی بۆ نەدۆزینەوە کە جڵەوی گەردون دەکەن؟ ئەی ئەو یاسا سەرمەدیانەی بۆ نەدۆزینەوە کە ئاراستەی تەنە فیزیاییەکان و هەسارەکان دەکات؟ ئیتر چ زانستێك لەسەرو زانستی ئەوەوە هەیە؟ بەمجۆرە ئەوروپییەکان مەنهەجیەتی "نیوتن"یان لە بواری گەردون و فیزیاوە گواستەوە بۆ ناو بوارەکانی تر. مادامەکی ئەو میتۆدەی ئەو لە بواری گەردون و فیزیادا توانای خۆی سەلماندووە، ئەی کەواتە بۆچی لە بواری فەلسەفەو سیاسەت و تەنانەت ئاکارو ئاینیشدا نەیسەلمێنێت؟ ئیتر لەو کاتەوە فیکری ئەوروپی بووە پاشکۆی فیکری زانستی فیزیایی، ئەمەش بۆتە خەسڵەتێکی فیکری خۆرئاواو تا ئێستاش لەگەڵیدایە. لە "دیكارت" و "کانت"ەوە تا ئێستا ناکرێت فەلسەفە لە پێشکەوتنی زانست جیابکەینەوە، لەبەرئەوە هەندێك دەڵێن: گەر "نیوتن" نەبوایە ئەوا "کانت" نەدەبوو! ڕەنگە هەبن بڵێن: خۆ فەیلەسوفانی سەدەکانی ناوەڕاست وەکی "تۆمای ئەکوینی و ئیبن ڕوشدو فارابیو.. و.."، ئەوانیش ئەقڵانی بوون و لە هەوڵی ئەوەدا بوون فەلسەفەی "ئەرستۆ" لەگەڵ بیروباوەڕی ئاینیدا بگونجێنن. ئەمە ڕاستە، بەلاَم ئەقڵانیەتی ئەوان لە بنەڕەتدا بەرەو ژیانی تێڕامان ئاراستە کرابوو، بەو پێیەی ئەو ژیانە بالاَترو سەنگینترە لە ژیانی ئەم دنیایە.

مەعریفەی ڕاستەقینە بەلای ئەوانەوە، ئەو مەعریفە تیۆریە بوو کە ئامانجی ئەوە بوو لە حەقیقەتی سەرمەدیو ئیلاهی تێبگات.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە لە گرنگی ئەوان و دەستکەوتەکانیان کەم بکەینەوە کە بۆ سەردەم و ڕۆژگاری خۆیان شتێکی گەورە بوو، بەلاَم لە سەرەتای سەردەمی ڕۆشنگەریەوە ئیتر ئەقڵانیەت بووە شتێکی (پراکتیکی، بەرچاو، زانستی) و بە ئاراستەی تێگەیشتن لە ژیانی ڕۆژانەو واقعی ماتریال

و پێکهاتەی کۆمەڵگا کاری دەکرد.

ئامانجی ئەم ئەقڵانیەتە بوو بە چاککردنی جیهان و گۆڕینی، نەك هەر ئەوەندەش بگرە هەوڵی دا لە ڕێی ئەقڵی مرۆڤەوە جڵەوی مێژوو بکات. جیاوازی نێوان ئەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاست و ئەقڵیەتی مۆدێرنیش لێرەدایە. گواستنەوەش لەم ئەقڵیەتەوە بۆ ئەوی دیکە شکۆمەندی ئەوروپای دروستکرد. کۆمەڵگاکانی ئێمە لەبەرئەوەی تا ئێستا نەیانتوانیوە ئەم هەنگاوە بنێن، بۆیە بەردەوام بە دەست کێشەو قەیرانەکانیانەوە دەناڵێنن.

فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری لە ئەڵەمانیا، هەر لە "لایبنتزەوە تا لیسینگ و کانت و فێختەو هیگڵ" تێگەیشتن کە قوتارکردنی ئەڵمانیا لەدەست پەتای توندڕەوی و دەمارگیری، تەنها دوای ئەوە دەبێت کە خوێندنەوەیەکی ئەقڵانی یاخود ڕۆشنگەری بۆ ترادسیۆنی ئاینی خۆیان بێتە ئارا. ئەم خوێندنەوە تەئویلیە نوێیەش دژ بە ناوەڕۆکی ئاین نیە، واتە دژی ڕوحانیەتە پاك و بێگەردو ئەخلاقیاتە میسالی و ترانسندتالیەکەی نییە، بەڵکو دژ بە لێکدانەوە تاریك و دەمارگیریەکانی ئاینی مەسیحیە.

ئەو فەیلەسوفانە پێیان وابوو کە ئەم جۆرە لێکدانەوەیە بەرپرسیارە لە تەواوی نەهامەتی و مەرگەساتەکانی ئەڵەمانیا، لەبەرئەوەی خەڵك دەکات بە گژی یەکتریداو پاساو بۆ کوشتن و قەتڵ و عام و تیرۆر دەهێنێتەوە. کەواتە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە خۆمان لە دەست ئەو تەفسیرە قوتارکەین، گەر ئەڵمانیا دەیەوێت جارێکی تر نەکەوێتە ناو دۆزەخی شەڕی ناوخۆوەو گەر دەخوازێت بە کاروانی ئەو نەتەوە ڕۆشنگەرانە بکاتەوە کە لە بواری ئەقڵ و زانستدا پێشی کەوتن و بۆڕیان دایەوە: واتە هەردوو نەتەوەی فەرەنسی و ئینگلیزی.

بەمجۆرە دواتر ئەڵەمانیا توانی لەو نەهامەتیانە دەرچێ و برینەکانی ساڕێژ بکات و ڕێگای گەشەو پێشکەوتن بگرێتەبەر. بەلآم ئاخۆ کێ ئەم ڕێگایەی لەبەردەمدا کردنەوە؟ ئەڵبەتە فەیلەسوفەکانی، ئەو فەیلەسوفانەی لە بەرامبەر میللەتەکەیاندا بەرپرسیارێتی مێژوویی خۆیان لە ئەستۆ گرت و هەندێ جاریش ژیانی خۆیان دەخستە مەترسیەوە، بە تایبەت کە بەبێ هیچ پێچ و پەنایەك ڕاستیەکانیان بە گەلی ئەڵەمانی دەوت.

بەڵێ ڕۆشنبیر ڕۆڵی لە ڕابونی گەل و نەتەوەکەیدا هەیەو ڕۆڵیشی لە ڕۆڵی سیاسەتمەدار گرنگترە، چونکە لانی کەم ئەوە ڕۆشنبیرە کە پێش سیاسەتمەدار دەکەوێت و ڕێگای بۆ ڕوناك دەکاتەوە.

**سەرچاوە**

الشرق الاوسط- ٢٠٠٢/٨/١٠

# خوێندنەوەی کتێب

**ناوی کتێب: بۆ نەوەکانتانی بگێڕنەوە**

**خوێندنەوەی: هەورامان وریا**

یەکەم پرسیار کە ناونیشانی ئەم کتێبە دەیخاتە ڕوو و بە مێشکی خوێنەردا تێدەپەڕێت ئەوەیە:

داخۆ ئەو شتەی کە دەبێت بۆ نەوەکانمانی بگێڕینەوە چی بێت؟ ئەوە چ سەرگوزشتە و بەسەرهاتێکە پێویستە لەسەرمان بە کوڕوکاڵەکانمانی بڵێین و ئەوانی لێئاگاداربکەینەوە؟

بەخوێندنەوەی کتێبەکە بە ئاسانی وەڵامی ئەو پرسیارەی سەرەوەمان دەست دەکەوێت. تێدەگەین ئەوەی لەسەرمانە بە منداڵەکانمانی بڵێین بریتیە لە گێڕانەوەی چیرۆکی قەتلوعام کردنی



جولەکەکان و کوشتنی بە کۆمەڵی چەندین ملیۆن خەڵکی بێگوناه.

خەڵکانێك بێئەوەی بزانن چ خەتاو ناحەقییەکیان کردوە، چ شتێکی پیرۆزیان پێشێل کردوە، کۆدەکرانەوە و لە پشتەوەی سەیارە و شەمەندەفەرەکانیان توند دەکردن و دەیانبردن بۆ ئۆردوگا زۆرەملێکان-ئەم ئۆردوگایانە پێشتر بۆ ئەم مەبەستە ئامادەکرابوون- تا لەوێ بە ئاسانی و دوور لە

چاوی ڕۆژگارەوە و بە نهێنی بیانبەخشن بە مەرگ.

گرنگی خوێندنەوەی ئەم کتێبە بۆ ئێمە لەو خاڵەدایە کە ئێمەش خاوەنی چیرۆکێکی لەو جۆرەین، خاوەنی بەسەرهاتێکین لە زۆر ڕووەوە لەو کوشتنی بەکۆمەڵەی جولەکە دەچێت. حیکایەتەکەی ئێمە بە ئەنفال ناسراوە.

من لەم خوێندنەوەیەدا تەنها هەوڵدەدەم هەندێ خاڵی هاوبەش و جیاوازی نێوان ئەم دوو پرۆسەیە – هۆلۆکۆست و ئەنفال– دەستنیشان بکەم

## خاڵە هاوبەشەکان

دەستنیشانکردن، کۆکردنەوە، ڕاگواستن، کوشتن و لەناوبردن.

١–ئەمانەی سەرەوە–کە لە کتێبەکەدا هاتوە– کۆمەڵێ خەسڵەتن دەتوانین بەسەر جێبەجێکردنی پرۆسەی ئەنفالدا پیادەی بکەین. لە ئەنفالدا سەرەتا ئەو شوێنانە دەستنیشان کراون کە پێویستە ئەنفالیان تێدا ڕوویبدات، واتە دەستنیشان کردنی ئەو پانتاییە جوگرافیایەی کە ئەنفال دەیگرێتەوە، ئەویش ژمارەیەکی زۆری گوندەکانی کوردستان بوو، پاشان کۆکردنەوەی ئەو خەڵکانەی لەو ناوچانەدا دەژیان و ڕاپێچکردنیان بۆ هەندێ ئۆردوگای زۆرەملێی وەك ئۆردوگاکانی (قۆرەتو، سمود، شۆڕش..هتد)،ئەم هەنگاوەش هەمان ئەو هەنگاوەیە کە نازییەکان بەرامبەر بە جولەکە پیادەیان کرد.

دوای ئەوەی خەڵکێکی بێشومار کۆکرایەوە، پرۆسەی ڕاگواستن دەستی پێکرد، ئەم ڕاگواستنە لە ئەنفالدا بە گوێرەی ئەو زانیاریانەی لە بەردەستایە بۆ ناوچە سنوریەکانی نێوان عێراق و سعودیە بووە– ناوچەی عەرعەر– لەوێ ئیدی بە زیندویی بێت یاخود بە مردویی خراونەتە ژێر گڵەوە. لە هۆلۆکۆستیشدا بەشێکی زۆری ڕاگواستنی جولەکەکان بەرەو "پۆڵەندا" بووە، لەوێ لەو ژورانەدا بە گاز خنکێراون کە پێشتر بۆ ئەم مەبەستە دروست کراون.

دەکرێ بپرسین ئەم ڕاگواستنەوەیە بۆچی؟ ئاخۆ بۆ بەعس ئاسانتر نەبوو قوربانیەکانی ئەنفال هەر لە زێدو جێگای خۆیاندا لەناوبەرێت؟ ئەی بۆ ئەم کارەی نەکرد. دەتوانم بڵێم هۆی سەرەکی نەکردنی ئەو کارە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە بەعس لە هەوڵی کوشتنی زۆرترین ژمارەدابوو، ئەم کوشتنە زۆرەش نەدەکرا هەر لەو جێگایانەدا بە ئەنجام بگەیەنێت، چونکە ئەمە دەبوە هۆی ئاشکراکردنی ئەو پیلانە چەپەڵە و خەڵکانێکی زۆر لە نیازی بەعس دەگەیشتن، ئەمەش وایدەکرد کۆمەڵێکی زۆر لەو قوربانیانە خۆیان ڕزگار بکەن. هەروەها جگە لە کوشتن، بەعس تێدەکۆشا کوردستان بچوك بکاتەوە و ئەو جوگرافیا پان و بەرینەی کە هەیەتی نەیهێڵێت، هەربۆیە دەبوایە خەڵکانی ئەو گوندو لادێیانە ڕاگوێزێت بۆ ئەوەی

دواجار بتوانێت بیانڕوخێنێت. ئەمەش مەیسەر نەدەبوو گەر ئەو ڕاگواستنەوەیە ئەنجام نەدرایە. هۆیەکی دیکە بۆ ئەنجام نەدانی ئەو حاڵەتەی سەرەوە"لەوانەیە" بەعس دەرکی بەوە کردبێت ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم ناوچانە جێدەهێڵێت، ئەو وەختە بەئاسانی لاشەی ئەو قوربانیانە ئەدۆزرانەوە، ئەمەش دەبووە بەڵگەیەکی زیندوی دیکە بۆ ڕیسواکردن و دادگایی کردنی تاوانباران.

٢-خاڵێکی دیکەی هاوبەشی نێوان هۆلۆکۆست و ئەنفال بریتیە لە فراوانی و گەورەیی و زۆری ژمارەی قوربانیەکان.

فراوانی هەردوو تاوانەکە و خستنەگەڕی سوپایەکی بێشومار بۆ پیادەکردنی هەردوو تاوانەکە، بە بۆچونی من دەگەڕێتەوە بۆ ونکردن و دەستنیشان نەکردنی تاوانباری سەرەکی، واتە نەدۆزینەوەی ئەو تاقمە یاخود ئەو گروپەی ئەنجامدانی ئەم کارەویان ئەکەوێتە ئەستۆ. لەبەر بەربلاوی سروشتی ئەم جۆرە تاوانانە و تێوەگلانی خەڵکانێکی بێشومار لە جێبەجێکردنیدا، کەسی یەکەم، یاخود دەستەی یەکەم زۆر زەحمەتە دەستنیشان بکرێت، ناکرێ تاوانی ئەنفال بە تەنها بخرێتە ئەستۆی چەند کەسێك لە دەسەلاتدارانی ڕژێمی بەعس. چونکە تاوانی ئەو ئەفسەرە-سەربازە-سەرەك جاشە-جاشە-هیچی کەمتر نییە لە تاوانی ئەو گروپەی کە بڕیاری ئەنجامدانی ئەنفالیان دەرکردوە.

تاوانی ڕوخاندنی گوندەکان و جیاکردنەوەی پیاوان لە ژنان و دابڕانی باوك لە خێزان و سوارکردنی خەڵك بە زەبری چەك و قۆنداغە تفەنگ و هێشتنەوەی پیرو پەککەوتەکان بەتەنها لەناو داروپەردوی ڕوخاوی خانوەکاندا، هیچی کەمتر نییە لە دەرکردنی ئەو فەرمانەی ئەنفال ڕادەگەیەنێت.

ئەو شۆفێری تراکتۆرەی پشتی تراکتۆرەکەی پڕ دەکرد لە منداڵی بێگوناه، لە ژنی سك پڕ و دەیبردن بۆ شوێنێکی نادیار، ئەو سایەق شۆفڵ و بلدۆزەرەی بە دڵ ساردیەوە خۆڵی بەسەر زیندوەکاندا دەکرد و تائێستاش نەهاتوە ڕاستیەکان بگێڕێتەوە و داوای لێبوردن بکات، ئەو عەسکەر و جاشانەی ماڵەکانیان دەسوتاند و دواجار بە هێمنی دەگەڕانەوە ناو خێزانەکانیان و وەك ئەوەی هیچیان نەکردبێت دەنوستن و تائێستاش بێدەنگن لە ئاست دەرخستنی تاوانەکەیاندا، بە ئەندازەی خودی ئەو کەسەی بڕیاری ئەنفالی دەرکردوە تاوانبارن.

هەربۆیە ئێمە هەموومان دەزانین لە ساڵی ١٩٨٨دا تاوانێك بەناوی ئەنفالەوە لە کوردستاندا ڕویداوە، بەلام کێن ئەو کەسانەی-ئەو کوردانەی-ئەم تاوانەیان جێبەجێ کردوە، ئەوا ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئەو پرسیارە بێ وەلام ماوەتەوە. هۆکەشی وەك ئاماژەم پێدا بۆ دابەشبونی تاوانەکە دەگەڕێتەوە بەسەر چەندین گروپ و تاقم و

ژمارەیـــەکی زۆری ســـەرباز و جاشدا کە ئەستەمە هەموویان کۆکرێنـــەوە و دەستنیشـــان بکرێن، تەنها ئەوکاتە نەبێت کە ئـەو تـاقم و گـروپ و سـەرەك جاشـانە خۆیـان بێـن و دان بـە تاوانەکەیاندا بنێن.

٣-خـــاڵێکی دیکـــەی هاوبەش بەشداریکردنی خودی کـــوردە لـــە جێبـــەجێکردنی ئـــــەنفالدا، وەك هـــــەمان بەشـــداریکردنی بەشـــێك لـــە جولەکـــە لـــە جێبـــەجێکردنی هۆلۆکۆستدا.

لـە ئـەنفالدا کـــورد هـــەم مەزڵومەو هەم زالم، هەم کوژراو هـــەم بکـــوژ. ئـــەم حاڵەتـــەش گواســـتنەوەی تاوانەکەیـــە لـــە دەسەلاتی بەعسەوە بۆ خـودی کـــورد خـــۆی. بـــەم هـــەنگاوە بـــەعس لـــە جێبـــەجێکردنی تاوانەکەدا کەم تازۆر خۆی بە دوور دەگرێـت. بـە مانایـــەکی دیکە قورسایی و بەشی گرنگی تاوانەکـــە کـــە بریتییـــە لـــە پیادەکردن و بـە واقیعیکردنـی بڕیـــاری ئـــــەنفال دەخاتـــــە ئەستۆی خـەڵکانێك کـە خۆیـان کوردن.

٤- نـــەزانینی ژمـــارەی قوربانیـانی هـەردوو پرۆسـەکە، خـــاڵێکی لێکچـــوی دیکـــەی نێوانیانە.

ڕاســـتە دەڵێـــن ئـــەنفال ١٨٢هـەزار کەسـە، بـەلام ئـەم ژمارەیـــە نـــە لـــە ئـــەنجامی ئامـارێکی ڕەسمیـەوە هاتوەتـە ئارا، نە ڕژێـم خۆشـی دانی پێدانـاوە، بەهەمان شێوە ژمـــــارەی قوربانیـــــانی هۆلۆکۆسـتیش بـە شـێوەیەکی ڕاست و دروسـت دیـار نییـە و نەزانراوە*.

## خاڵە جیاوازەکان

**١**-خاڵی سەرەکی جیاواز لە نێوان هۆلۆکۆست و ئـەنفال لەوەدایـە ئـەوەی یەکـەمیان بوەتە ڕوداوێکی نێونەتـەوەیی و لـە جیـهاندا بەشـێوەیەکی ڕەسمـــی ناســـراوە و خـــودی ئـــەڵمانیاش دانپیێدانـــاوە و قەرەبوی بەشێك لە قوربانیانی کردۆتـەوە. ئەمـە جگـە لـەوەی کتێــب گـەلێکی زۆری لەســـەر نوسراوە و وەرگێڕراونەتە سەر زۆربەی زمانەکانی دیکە. بەلام ئـــەنفال نـــەك بەشـــێوەیەکی ڕەسمـی لەلایـەن ولاتانـەوە نـە ناسراوە و قوربانیەکانی قەرەبو نەکراونەتـەوە، بـەڵکو ڕژێمـی بـــەعس تەنانـــەت نکوڵـــی لـــە ڕودانیشی دەکات، بۆ نوسینی کتێبیـــش لەســـەر ئـــەنفال و وەرگـێڕانی ئـەو کتێبانـــە بـــۆ زمانە زیندوەکانی جیهان، ئەوا ئـەنفال هـەژارترین ڕوداوە لـەو بـــــوارەدا، زۆر دەگمەنـــــە ڕوداوێکی وا گـەورە هێنـدە بیٚ کتێب بێت.

٢-جێبـــــــــەجێکردنی هۆلۆکۆســـت نزیکـــەی ســـێ تـــا چـــوار ســـاڵی خایـــاند، بـــــەلام ئـــــەنفال تەنـــــها لـــەماوەی چـــەند مـــانگێکدا ئەنجام درا.

٣-ژمـــارەی قوربانیـــانی هۆلۆکۆســـت زۆر زیـــاترە لـــە ژمـارەی قوربانیـــانی ئـــەنفال. بـــــەلام لـــــە هۆلۆکۆســــتدا ڕوخـــــاندنی گونـــــدو لادیٚ نـــابینرێت، بـــە پێچەوانـــەی ئەنفالەوە کە خاڵی سەرەکی و گرنـگ ڕوخـــاندنی لادێکـــانی کوردستانە.

٤-بـــەپێی ئـــەم کتێبـــە هـەندێ لەوانـەی بەشـدار بـوون

لــــە کوشـــتنی بەکۆمـــەڵی جولەکــــەدا، دانیــــان بــــە تاوانــــەکانیاندا نــــاوە، بـــەڵام ئەنجامدەرانی ئەنفال تا ئێستا یەك وشـە چییـە سـەبارەت بـە ئەنفال نەدرکاندوە.

٥-هۆلۆکۆســــــت وەك بابـەتێکی مێژویـی لـە وڵاتـی "سوید"دا-بەپێی ئەم کتێبە- دەخوێنرێت، گەرچی ئەم وڵاتە کــەم تــا زۆر پـــەیوەندی بــە هۆلۆکۆســتەوە نییــە. کــەچی ئــەنفال لـــە خوێندنگاکـــانی خۆشمــــاندا نــــاخوێنرێت و نەخراوەتـــــە پرۆگرامـــــی خوێندنــــــەوە، ئەمـــــەش ناحەقیەکی گەورەیە لە مرۆدا و لەسـایەی دەسـەڵاتی کوردیـدا بەرامبەر بە ئەنفال دەکرێ.

ســـەیرەکە لەوەدایـــە لـــە وانــەکانی مێــژووی ســەرجەم قۆناغــــەکانی خوێندنــــــدا شـــتگەلێکی زۆری مێژوویـــی دەخوێندرێـــت کـــە هیـــچ پەیوەندیـەکیان بە خوێندکاری کـوردەوە نییـە و دوور و نزیـك سودێکی ئەوتۆی پێناگەیەنن، کــەچی ڕوداوی ئــەنفال، کـــە بەشێك لە خوێندکاران خۆیـان قوربـانی دەسـتی ئـەو ڕوداوەن، نـاخوێنرێت و تەنانـەت هیـچ زانیاریەکیشـیان لـە بارەیـەوە نییە. ئەمەش کەمتەرخەمییەکە هـــەم حکومــــەت و هــــەم وەزارەتــــــی پــــــەروەردە بەرپرسیارن لێی.

## پەراوێز

*لە ئـەنجامی خوێندنـەوەی ئـەم کتێبـەوە خوێنـەر دەتوانـێ چـــەندین خـــاڵی هاوبـــەش و جیـاوازی دیکــە دەستنیشـــان بکـات.بـۆ ژمـارەی قوربانیـانی ئەنفال گوایـە سـەرکردەی یـەکێك لە حیزبەکان لـە کۆبونەوەیـەکدا وتویـەتی ١٨٢هـەزارە، ئیـتر ئـەم ژمارەیـــــە بوەتـــــە ژمــــارەی ئیشپێکراو.

